

# هەڵەبجە و ئەنفال

## لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا



وریا ڕەحمانی

هەولێر ٢٠١٣

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر




پرۆفیسۆر
مایکڵ کێلی

هەڵەبجە و ئەنفال لە بەڵگەنامە
نهێنییەکانی ئەمریکادا

و. وریا رەحمانی



سەرپەرشتیاری گشتی
ماجید نووری

# هەڵەبجە و ئەنفال لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا


نووسەر: پرۆفیسۆر مایکڵ کیلی
وەرگێڕ: وریا ڕەحمانی
بابەت: بەڵگەنامە
پیتچنی: وەرگێڕ
هەڵەچنی: فەریدون سامان
نەخشەسازی ناوەڕۆك: سۆزان محەمەد عەزیز
نەخشەسازی بەرگ: ئامانج ئەمین
تیراژ: ٥٠٠دانە
چاپ: بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری- هەولێر
نرخ: ٤٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارە سپاردنی (٨٤٤) ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە





بەڕێوەبەرایەتی هەولێر
چاپ و بڵاوکردنەوەی
هەولێر- گەڕەکی ڕاستی/ نزیك گەراجی بەغدا
بالەخانەی بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری
ژمارەی تەلەفۆن: ٠٦٦٢٢٥٨٥٤١٣

## پێشەکی پرۆفیسۆر مایکێل کیلی[1]

کورد دۆستی نییە جگە لە چیاکان. ئەمە وتەیەکی کۆنە، کۆن بە قەد خودی چیاکان. راستیشە، هەروایە بەتایبەت ئەو کاتە کە کوردەکانی باکووری عێراق بە دەستی رژێمی سەدام حوسەین ژینۆساید دەکران. سوپای عێراق لە شالاوی ئەنفالدا خەڵکی سڤیلی کوردی کۆ دەکردەوە، دووری دەخستنەوە، گوند و شارۆچکەکانیانی خاپوور دەکردن و بە چەکی کیمیایی پەلاماری دەدان. لە ئەنجامدا سەدان هەزار کورد گیانیان لە دەستدا و بریندار بوون. لە کاتی دەستپێکردنی ئەنفال لە قۆناخی کۆتایی شەڕی ئێران و عێراقدا و پاش ئەوەش، وڵاتانی دیکە کاردانەوەیەکی ئەوتۆیان نیشاننەدا. بۆ؟

هۆکارەکانی زۆرن، بەڵام ئاگادارنەبوون لە بەڕێوەچوونی ئەنفال، یەکێ لە هۆکارەکانی نەبوو. جیهان و بەتایبەت رۆژئاوا باش دەیزانی چی روو دەدات. لە کاتی شەڕی ئێران و عێراقدا زلهێزەکان زۆر یارمەتی ئابووری، سەربازی و تەکنیکی سەدامیان دا. کەوابوو سەریان سڕنەما کاتێک کە بینیان سەدام ئەو چەکانە دژی کوردەکان بەکاردەهێنێت، چونکە خۆیان پێیان فرۆشتبوو. ئەم نەخشەیە کە رۆژنامەی «نیۆیۆرک تایمز» بڵاوی کردووەتەوە نیشان دەدات کە وڵاتانی دیکە چەندە یارمەتیان بە بەرنامەی چەکە کیمیاییەکانی سەدام داوە. وڵاتانی رۆژئاوا دەیان ساڵ چاوپۆشیان لەم کردەوانە کرد، چونکە مەسەلەی سەقامگیری و پارچەپارچەنەبوونی وڵاتە چەندنەتەوەییەکان لە مەسەلەی مافی مرۆڤ بۆیان گرنگتر بوو.

بەڵام جیهان چۆن دەبێ وەڵام بداتەوە؟ بە هەمان رێژە کە سەدام بەرپرسیاری تاوانی ژینۆسایدی کورد بوو، ئەو وڵاتانەش کە ئامرازەکەیان بۆ سەدام دابین کرد، لە بەرامبەر ژینۆسایدی کورد بەرپرسیارن. بۆیە کۆمپانیا نێونەتەوەیەکان دەبێ لە بەرامبەر

کردەوەکانیـــان وەڵامـــدەر بن. زۆربەی ئەو پارمەتیـــە ئابوورییە کە بە ســـوپای سەدام درا لە ڕێگای کۆمپانیا نێونەتەوەییەکانەوە بوو. ئێستا ناکرێت لە ئاســـتی نێونەتەوەییدا لێپرســـینەوە لەگەڵ ئەو کۆمپانیانە بکرێت بە هۆی بەشداربوونیان لە ژینۆسایدی کورددا. هیچ دادگایەکی نێونەتەوەیی ئەو دەســـەڵاتەی نییە، بەڵام دەبێ بەردەوام گوشـــاری سیاســـی، ئابووری و یاسایی بخرێتە ســـەر ئەو لایەنانە کە دەستیان بووە لە ژینۆسایدی کورددا.

زۆرن ئـــەو دیکتاتۆرانە کە وەک تاوانبار لە دادگا نێونەتەوەییەکان یان دادگای وڵاتی خۆیاندا لێپرســـینەوەیان لەگەڵدا کراوە. هەندێکیان پێـــش لە دەرچوونی حوکمەکەیان بە هۆکاری جۆراوجۆر مردوون و لە راســـتیدا ئەم جۆرە مردنانە بۆ دیکتاتۆرەکان بووە بە شـــتێکی باو. هێرمـــان گۆرین[٢] پێش لە جێبەجێبوونی حوکمی دادگای نورینبێرگ خۆی کوشـــت. هیدکی تۆجو[٣] لـــە کاتی دادگای ســـەربازی تۆکیۆ هەوڵیدا بە شـــێوەی هاراکری خۆی بکوژێت. ئیسلۆبۆدان میلۆسوڤیچ لە کاتی دادگاییکردن لەلایەن دادگای نێونەتەوەیی لاهای[٤] ئوگوستۆ پینۆشەش[٥] پێش لە تەواوبوونی دادگاییکردنەکەی بە مەرگی ئاسایی مرد. بەڵام سەدام دادگایی کرا و بە لەسێدارەدان حوکمدراو حوکمەکەشی جێبەجێ کرا. لێپرسینەوە لەگەڵ تاوانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە بە لەســـێدارەدانی ســـەدام کۆتایی پێهات بەڵام دادگای نێونەتەوەیی لاهە تەنانەت پاش مردنی میلۆسۆڤیچیش درێژەی بە کاری خۆی دا و بڕیاری تاوانباربوونی میلۆسووڤیچی دەرکرد.

ژینۆساید لە ســـەردەمی زۆر کۆنی مێژوودا بووە. گەلێک لە دەقە مێژوویە کۆنەکان وەک تاکتیکێکی جەنگ بۆ بەزاندنی گروپە ئەتنیکی و ئایینیەکان باســـی ژینۆســـایدیان کردووە. لە قۆناخی دەسەڵاتداری کنیســـە لە ســـەردەمی نوێ و کۆمەڵکوژی ئەرمەنیەکان بەدەســـتی ئیمپراتۆری عوســـمانی لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا کۆمەڵکوژی

روویداوە. بەڵام پاش جەنگی دووەمی جیهانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی ناڕەزایەتی توندی خۆی لە بەرامبەر ژینۆساید دەربڕی و پەیماننامەی پێشگیری لە ژینۆساید سەرەنجام پەسەند کرا و ژینۆساید ساڵی ١٩٤٨ وەک تاوان بەفەرمی ناسرا.

داوای لێبوردنکردن شتێکی باشە. جیهان داوای لێبوردنی کرد کە نەیتوانیوە رێگە لە ژینۆسایدی رواندا[٦] بکرێت، نەیتوانیوە رێگە لە ژینۆسایدی کامبۆج بگرێت [٧]، نەیتوانیوە رێگە لە ژینۆسایدی کورد بگرێت، رێگە لە دووپاتبونەوەی هۆلۆکاست [٨] بگرێت، هەرچەند کە نەتەوە یەکگرتوەکان رایگەیاندبوو ئیدی قەت رێگە بە دووپاتبوونەوەی هۆلۆکاست نادات. کێشەکە ئەوەیە کە ئەو شتانە کە دەڵێن ناهێڵین قەت جارێکی دیکە دووپات بێتەوە، دووپات دەبێتەوە، بەردەوامە و بەردەوام.

ژینۆسایدی کورد وەک پێویست لە ئاستی جیهاندا نەناسراوە. حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێ لەرێگای پشتیوانیکردن لە لێکۆڵینەوە و نووسین و بەڵگەمەندکردنی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە، بۆ ناساندنی ژینۆساید بە جیهان هەوڵ بدات بۆ ئەوەی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی زیاتر پشتیوانی لە دۆزەکەیان بکات، بەتایبەت دۆزی سەربەخۆیی کوردستان. ئەم کتێبە نوێیەی وریا رەحمانی یەکێ لەو سەرچاوانەیە کە سیاسەتی ئەمریکا و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەربارەی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجەمان پێنیشان دەدات. ئەم کتێبە ئەو راستیەمان بۆ دەردەخات کە چۆن سەدام پشتی بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی بیانی بەست بۆ ئەوەی کورد ئەنفال بکات.

سەدام بە تاوانی ئەنفال لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرا. بڕیاربوو بە ٥ تۆمەتی دیکەش دادگایی بکرێت کە یەکێ لەوانە کیمیابارانی هەڵەبجە بوو، بەڵام بە هۆی لەسێدارەدانی، دادگای ئەنفال تەواو نەبوو و بە

هۆی کیمیابارانی هەڵەبجەش لێپرسینەوەی لێنەکرا. کەوابوو کوردەکان نەگەیشـــتن بە مافی خۆیان، بەڵام ئەوە نەبووە هۆی سەرســـورمانی کوردەکان، بەڵکوو بووە هۆی بێ هیوایی و دڵســـاردبونەوەیان. گەلی کورد پرسیاری زۆری دەربارەی ئەنفال پێبوو، بەڵام بە لەسێدارەدانی سەدام ئەو پرسیارانە بێ وەڵام مانەوە

سەدام و سەڵاحەدینی ئەیوبی هەردوویان لە تکریت لەدایکبوون بەڵام کەسایەتییان زۆر لە یەک جیاواز بوو، سەلاحەدین کورد بوو و یەکێ لە جەنگاوەرە بەناوبانگەکانی ئیســـلام بوو و ئەمرۆ وەک قارەمانێکی گەورە و حیماسی شانازی پێدەکرێت بەڵام سەدام بیرەوەری کوشتار و دەسەڵاتخوازی و دیکتاتۆری و سەرەڕۆیی لە دوای خۆیدا بەجێهێشت. ئەگەر لەم روانگە مێژووییەوە سەیری مەسەلەکە بکەین لەوانەیە بتوانین بڵێیـــن کە کوردەکان براوە بوون، بـــەڵام هیواکەیان بۆ دادگاییکردنی ســـەدام بە تاوانی ئەنفال و هەڵەبجە بوو بە خەون، هەر وەک هیوای سەربەخۆیی کوردستان کە لە دەیەی ١٩٢٠ دا بوو بە خەون.

داوای لێبوردنکـــردن لـــە گەلی کورد، کوردە کـــوژراوەکان زیندوو ناکاتەوە، رۆحی بێ ئارام و قەراری بنەماڵە مردووەکان ئارام ناکاتەوە. بەڵێ کورد دۆستی نییە، جگە لە چیا بەڵام چیاکان قەد لەبیر ناکەن. دەیان ســـاڵ سەرکوت، ئازار و ئەزیەت و دژمنایەتی ئاشکرای ئێران، عێراق، تورکیە و ســـوریە، بوەتە هۆی ئـــەوەی کە کوردەکان بەهێز، لەسەرخۆ و لە سەر پێ بن. کوردەکان لە خەبات و تێکۆشانی خۆیان بەردەوامـــن، هەموو رۆژێک خۆر لە پشـــت چیاکانەوە هەڵدێت و ژیان دەستپێدەکاتەوە.

## پێشەکی وەرگێڕ

### سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی پێش لە کیمیابارانی هەڵەبجە [9]

پاش ســـەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە ١٩٧٩ و هەڵگیرسانی شەڕی ئێران و عێراق لە ١٩٨١، ئەمریکا دەیەویست پێش لە بڵاوبوونەوەی ئەو شۆڕشە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بگرێت و هەڵگیرسانی شەڕی ئێران و عێراق وەک هەلێک بۆ گەیشـــتن بەو ئامانجە بەکاربێنێت. لە سەرەتادا ئێران و عێراق هەردوویان دژایەتـــی ئیدوئۆلۆژی ئەمریکایان دەکرد هەر بۆیە ئەمریکا ســـەرەڕای ئـــەوەی دەیگوت لەو شـــەڕەدا بێلایەنە بەڵام چەکوچۆڵی بە هەردوولا دەفرۆشت و هەر دوو لای تەیار دەکرد.

سیاســـەتی ئەمریکا ئەوە بوو کە ئێران و عێراق لە ئەنجامی شـــەڕدا لاواز بن و کێشـــە بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســـت دروســـت نەکەن بۆ ئەوەی هاوســـەنگییەک لە نێوان ئەو دوو وڵاتە بەهێـــزەی کەنداو رابگیردرێت و هیچکامیان نەبن بە هێزی باڵادەست لە کەنداو بۆ ئەوەی نەتوانن ببن بە هەڕەشە بۆ بەرژەوەندیە ئیستراتژیکەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل و نرخی نەوت لە ئاستێکی گونجاودا بێت.

پاش ئەوەی دەوڵەتی عێراق، ئەبوو نیزال[10]، ســـەرکردەی گروپێکی توندئاژۆی فەلەستینی لە عێراق دەرکرد، ئەمریکا ناوی عێراقی لە ساڵی ١٩٨٢ لە لیستی دەوڵەتانی پشتیوانی تروریزم دەرهێنا و هاوپەیمانەکانی خۆیشی هاندا چەکوچۆڵ بە عێراق بفرۆشن.

ریچارد مورفی، یارمەتیدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە پەیامێکدا بـــۆ لۆرێنس ئیگیلبێرگێر، جێگری وەزیـــری دەرەوە لە کانوونی یەکەمی ١٩٨٣ داوای لێکـــرد داوا لە بانکـــی ئیکزیم بکات کریدیتی قەرز بدات بە دەوڵەتـــی عێـــراق. ئیگیلبێرگێریش نامەیەکی نارد بـــۆ بانکی ئیکزیم و رایگەیاند کە سەدام بە گوێی ئەمریکای کردووە و ئەبوو نیزالی لە عێراق

دەرکردووە کەوابوو مەسەلەی پشتیوانیکردنی سەدام لە تروریزم لەئارادا نەماوە و ئەمریکا دەبێ پشتیوانی لە عێراق بکات[11].

لــە مانگی تشــرینی یەکەمی ١٩٨٤ ئەمریــکا باڵوێزخانەی خۆی لە بەغداد کــردەوە و پەیوەندییــە دیپلۆماتیکەکانی لەگــەڵ عێراق پاش ١٧ ســاڵ دەستپێکردەوە کە پاش شــەڕی ١٩٦٧ی عەرەب و ئیسرائیل تێکچووبوو. ئەمریکا بەرژەوەندی خۆی لەوەدا دەبینی کە هاوســەنگیی هێز بە قازانجی عێراق بشکێتەوە، بۆیە سەرۆک کۆماری ئەمریکا بڕیاری دەرکرد هەمو ڕێوشــوێنێکی پێویســت بگیردرێتەبەر بــۆ ئەوەی عێراق شــەڕەکەی بە ئێران نەدۆڕێنێ و دەزگا هەواڵگریەکانی ئەمریکا هاوکاری دەوڵەتی عێراق بکەن. بە کورتی بەرژەوەندی ئابووری و سیاسی ئەمریکا لەوەدا بوو عێراق ســەقامگیر بێت و لە بەرامبەردا کەندوکۆسپ لە سەر زیادەخوازیەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران دروست بکات[12]

هــاوکات پەیوەندییە بازرگانیەکانی عێــراق و ئەمریکا بە ڕێژەیەکی بەرچاو پەرەیسەند. لە ساڵی ١٩٨١ ڕێژەی هەناردەی کشتوکاڵی ئەمریکا بــۆ عێراق گەیشــتە یەک بلیۆن دۆلار و ســاڵی ١٩٨٢ ڕێــژەی ناردنی شــتومەکی ئەمریکایی بۆ عێراق گەیشــتە ٥ بلیــون دۆلار و عێراقیش نەوتەکەی بە ئەمریکا هەرزانفرۆش دەکرد. ئەمریکا سەرەتا ١٢٠ میلیۆن دۆلاری بە شــێوەی کریدیت بەخشــی بە عێراق بۆ کڕینی گەنم، جۆ و برنجی ئەمریکایی. ئەم کریدیتانە زۆر گرنگ بوون، چونکە زۆربوونی بڕی قەرزەکانی عێراق وای لە بانکە نێونەتەوەیەکان کردبوو بە ئاســانی قەرز نەدەن بە عێراق. هاوکات ئەمریکا کریدیتێکی دیکەی بەخشــی بە عێراق بۆ هەناردەکردن و ناردنەدەرەوی کەلوپەلی پیشەسازی لە ئەمریکاوە.

لە گەرماوگەرمی شــەڕی ئێران و عێراق کــە تێیدا عێراق چەند جار چەکی کیمیایی دژی هێزەکانی ئێــران بەکارهێنا، ئەمریکا هەرچەند کە ڕایگەیانــد نابێت ئێران و عێراق چەکی کیمیایی دژی یەکدی بەکاربێنن، بەڵام چاوپۆشــی لەو مەســەلەیە کرد و نەیهێشــت ئەو مەسەلەیە کار بکاتە سەر پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریکا. سوپای عێراق یەکەمجار لە

تەموزی ۱۹۸۳ گازی خەردەلی دژی هێزەکانی ئێران بەکارهێنا و بوو بە یەکەمیـــن دەوڵەت کە پاش واژۆکرانی «پرۆتۆکۆڵی قەدەخەکردنی گازی کیمیایی ۱۹۲۵» چەکی کیمیایی بەشـــێوەیەکی بەرفراوان بەکاردەهێنا. عێراق پەلەی کرد لە کڕین و بەرهەمهێنانی گازی کیمیایی و بە باشترین ڕێگاچارەی دەزانی بۆ ڕاوەســـتاندنی هێزەکانـــی ئێران کە بە گوێرایەڵی ئایەتـــوڵا خومەینی پۆلپۆل دەهاتنەوە ناو بەرەی شـــەڕ لەگەڵ عێراقدا. عێراق سەرەتا تەنها گازی خەردەلی بەکاردەهێنا، بەڵام لە شوباتی ۱۹۸٤ بەولاوە گازی دەمار و تابوونیشـــی بەسەردا زیاد کرد و بوو بە یەکەمین دەوڵەت لە مێژوودا کە گازی دەمار لە بەرەی شەڕدا بەکاربێنێت.

مەســـەلەی کیمیابارانکردنی هێزەکانی ئێران لەلایەن عێراقەوە ئیدی لـــەوەدا نەمابوو پەردەپۆش بکرێت، بۆیە لە ٥ی ئاداری ۱۹۸۳ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریـــکا لە بەیاننامەیەکدا ڕایگەیانـــد بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکـــەن کە عێـــراق چەکی کیمیایـــی کوشـــندەی دژی هێزەکانی ئێران بەکارهێناوە بەڵام لەوە زیاتر لە سەری نەڕۆیشت و عێراقیشی شەرمەزار نەکرد.

لـــە کانوونی دووەمی ۱۹۸۳ ئیدارەی ڕەیگان دڵنیا بوەوە کە عێراق گازی خەردەلـــی دژی ئێـــران بەکارهێناوە، بەڵام هیـــچ کاردانەوەیەکی نیشـــان نەدا. لێشـــاوی ڕاپۆرتەکان دەربارەی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی هێزەکانی ئێران دەگەیشتە وەزارەتی دەرەوە، بەڵام بەرپرســـانی ئەمریکا حەزیان لە بڵاوبونەوەی ئەو مەســـەلەیە نەدەکرد، چونکە ترسی ئەوەیان هەبوو کە زەقبوونەوەی ئەو مەسەلەیە، کاریگەرییە سنوردارەکەی ئەمریکا لە سەر عێراق کەم بکاتەوە.

جاناتـــان هو، جێگـــری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لـــە پەیامێکدا بۆ جۆرج شوڵتز، وەزیری دەرەوە لە ۱ی تشرینی دووەمی ۱۹۸۳ پێیڕاگەیاند کە ئەمدوایانە کۆمەڵێک زانیاری نوێیان بەدەستگەیشـــتووە کە نیشـــان دەدات عێراق درێـــژە بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی ســـەربازانی ئێـــران دەدات و لـــە تەمـــوز و ئابی ۱۹۸۳ لە ناوچـــەی حاجی عومران

چەکــی کیمیایی دژی ســەربازانی ئێران و ئەمداوایانە دژی پێشــمەرگە کوردەکان بەکارهێنــاوە. «جاناتان هو» هەروەهــا ئامارەی بەوە کرد کە ســەدام ماددەە کیمیاییەکەی لە وڵاتانی دیکە، لەوانە ئەمریکا کڕیوە و پێشــنیاری کرد ئەو مەسەلەیە لە دانیشــتنی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی ئەمریکادا بخرێتەڕوو[١٣].

لە ٤ی ئاداری ١٩٨٤ شوڵتز، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە پەیامێکدا بۆ نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە بەغداد پێیراگەیاند کــە لــە فڕۆکەخانەی «جان ئیف کینیدی» دا دەســت بە ســەر ٢٢ هــەزار پۆند ماددەی کیمیایی فوســفورید فولۆراید گیراوە کە بڕیاربووە بنێردرێت بۆ عێراق. شوڵتز لە درێژەی پەیامەکەدا ئامارەی بەوە کردبوو کە مەســەلەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە راگەیاندنە گشــتییەکانی ئەمریــکادا زۆر دەنگیداوەتەوە و وەزارەتی دەرەوە دەیەوێت بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراق شەرمەزار بکات. لە کۆتایی تیلیگرامەکەدا شــوڵتز داوای لە نووسینگەی پاراســتنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە بەغداد کردبوو کە بە کاربەدەســتانی عێــراق رابگەیەنێت کە دەوڵەتی ئەمریــکا دژی هەوڵەکانی عێراقە بۆ ئەوەی ماددەی کیمیایی لە ئەمریکا بکڕێت و ئەگەر دڵنیابن کە عێراق بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی هەوڵ دەدات ناردنی ماددەی کیمیایی بۆ ئەو وڵاتە قەدەخە دەکەن[١٤].

ئەمریــکا دەیزانــی کە عێراق مــاددەی کیمیایی لــە کۆمپانیاکانی ئاڵمانیا و وڵاتانی تری ئەوروپایی و خودی ئەمریکا دەکڕێ، بەڵام بەهۆی پابەندبوونیــەوە بە ســەرکەوتنی عێراق لە شــەڕدا نەیدەتوانی زانیاری هەواڵگــری بدرکێنێ و تەنها ئەو کاتە ناچار بوو هەڵوێســت بگرێت کە سەدام حەسەین لە شــوباتی ١٩٨٤ بە ئاشکرا هەڕەشەی بەکارهێنانی چەکــی کیمیایی کرد و وتی بۆ هەموو مێروولەیەک دەرمانی مێروولەکوژ هەیە. ئەمریکا نیگەرانی ئەوە بوو کە چەکێکی کاریگەری پڕۆپاگەندا دژی عێراق بکەوێتە دەســتی ئێران. لە ئاداری ١٩٨٦ ئەنجومەنی ئاسایشــی نەتــەوە یەکگرتوەکان لــە بڕیارنامەیەکدا کیمیابارانــی هێزەکانی ئێران

بەدەستی سوپای عێراقی شـــەرمەزار کرد، بەڵام ئەمریکا بڕیارنامەکەی ڤیتۆ کرد.

لە کاتی ســـەردانێکی سەرۆکی کومیتەی خزمەتگوزاری چەکوچۆڵی ئەنجومەنـــی نوێنەرانی ئەمریکا بۆ بەغداد لە ١٩٨٦، تاریق عەزیز زۆر بە توڕەییـــەوە دەنگی هەڵبڕی و وتی بەڵـــێ بێگومان ئێمە چەکی کیمیایی بەکاردێنین. ئەوانە (ئێـــران) دڕندەن و ئێمەش دەبێ بەرگری لە خۆمان بکەیـــن و ئەگەر چەکی ناوکیشـــمان هەبێـــت بەکاریدێنین. تاریق عەزیز لە پاییزی ١٩٨٦ ســـەبارەت بە ئەگەری تێکشـــکانی هێزەکانی عێراق و زاڵبوونی ئێران بەســـەر باشووری عێراق هۆشداریدا بە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان و وتی «ئێمە هەموو جۆرە چەکێک بەکار دێنین بێ ئەوەی گوێ بدەین بە هیچ رێکەوتننامەیەک یان کەســـێک، چونکە ئێمە لەم جەنگەدا شەڕ بۆ ئێوەش دەکەین»[١٥].

یەکەمجـــار لە گوڵانـــی ١٩٨٧ باڵوێزخانەی ئەمریکا لـــە بەغداد بە وەزارەتی دەرەوەی راگەیاند کە دەوڵەتی عێراق شاڵاوێکی دڕندانەی دژی کوردەکان دەستپێکردووە و بۆ کاولکردن و چۆڵکردنی گوندەکان، چەکی کیمیایی دژی گوندنشینەکان بەکاردەهێنێت[١٦]

بەگوێرەی ئامارەکانی ئێران، لە ماوەی ٨ ســـاڵی جەنگدا، ســـوپای عێـــراق ١٩٥ جار چەکی کیمیایی بەکارهێناوە و لە ئەنجامدا نزیکەی ٣٤ هەزار کەس ( سەربازی و مەدەنی) بەر گازی کیمیایی کەوتوون.

بە گوێرەی ســـەرچاوە نێونەتەوەییـــەکان، یەکەمجار عێراق لە ئابی ١٩٨٣ لـــە حاجی عومران چەکـــی کیمیایی دژی کورد و هێزەکانی ئێران بەکارهێنا و لە ئەنجامدا نزیکەی ١٠٠ کەس کوژران و بریندار بوون. جاری دووەم لە تشـــرینی دووەمی ١٩٨٣ لە ئەنجامی هێرشـــە کیمیاییەکاندا نزیکەی ســـێ هەزار کورد و ئێرانی لە پێنجوێن کوژران و بریندار بوون. هەروەها لە شـــوباتی ١٩٨٤ لە دوورگەی مەجنوون ٢٥٠٠ ســـەرباز، لە ئاداری ١٩٨٤ لە بەســـرە ١٠٠سەرباز، لە ئاداری ١٩٨٥ لە زۆنگاوەکانی هوەیزە سێ هەزار سەرباز، لە شوباتی ١٩٨٦ لە فاو ٨ هەزار سەرباز،

له کانوونی یه‌که‌می ١٩٨٦ له ئومولرِه‌ئس هه‌زار ســـه‌رباز، له نیســـانی ١٩٨٧ له به‌سره ٥ هه‌زار سه‌رباز، له تشرینی یه‌که‌می ١٩٨٧ له سومار و میهران سێ هه‌زار سه‌رباز، له نیسانی ١٩٨٨ له فاو هه‌زار سه‌رباز، له گولانی ١٩٨٨ له ده‌ریاچه‌ی فیش ١٠٠ ســـه‌رباز و له حوزه‌یرانی ١٩٨٨ له دوورگه‌ی مه‌جنوون ١٠٠ ســـه‌ربازی ئێران به هۆی کیمیابارانی عێراق کوژران و بریندار بوون[١٧].

زۆربه‌ی قوربانه ســـڤیله‌کانی کیمیابارانه‌کانی عێراق کورد بوون چی له کوردستانی ئێران و چی له کوردستانی عێراق. گونده‌کانی نزیک بانه و پێنجوێن و سه‌رده‌شـــت له ٧و٨ی گولانـــی ١٩٨٦ له‌لایه‌ن عێراقه‌وه کیمیابـــاران کـــران که له ئه‌نجامـــدا لانیکه‌م ٩٢ کـــه‌س بریندار بوون. لـــه ٢٨ی حوزه‌یرانی ١٩٨٧ فرِۆکه‌کانی عێراق شـــاری سه‌رده‌شـــتیان کیمیابـــاران کرد که له‌ئه‌نجامدا زیاتر له ١١٠ که‌س کوژران و نزیکه‌ی ٢ هه‌زار که‌ســـی دیکه بریندار بوون. سه‌رده‌شت یه‌که‌م شاری کوردنشین بوو که بوو به قوربانی چه‌کی کیمیایی و یه‌که‌م شار بوو له سه‌راسه‌ری جیهاندا که پاش جه‌نگـــی دووه‌می جیهانی کیمیاباران کرا. فرِۆکه‌کانی عێراق هه‌روه‌ها له ته‌موزی ١٩٨٧ گوندی بانزه‌رده‌ی قه‌زای کرند (ســـه‌ر به پارێزگای کرماشان)یان کیمیاباران کرد که له ئه‌نجامدا ٢٧٥ که‌س له دانیشـــتوانی ئه‌و گونده گیانیان له‌ده‌ستدا و نزیکه‌ی ٨٠٠ که‌س بریندار بوون.

## هەڵوێستی ئەمریکا سەبارەت بە کیمیابارانی هەڵەبجە

دوابەدوای ئەوەی هێزەکانی سـپای پاسدارانی کۆماری ئیسلامی لە ئوپەراسـیۆنی وەلفەجـری ١٠دا بە یارمەتی هێـزە کوردەکانی عێراق، ناوچـەی هەڵەبجەیان گرت، لە ١٦ی ئـاداری ١٩٨٨ فڕۆکەکانی عێراق شـاری هەڵەبجەیان کیمیاباران کرد و لە ئەنجامـدا نزیکەی ٥ هەزار لە خەڵکی سـڤیلی بێ گوناهی ئەو شـارە گیانیان لە دەسـتدا و نزیکەی ١٠ هەزار کەسـی دیکەش برینداربوون. ئێـران لەمێژبوو خولیای ئەوەی هەبوو بەڵگە لـە بارەی تاوانەکانی جەنگ لەلایـەن عێراقەوە بخاتەڕوو کە شـایانی پشتگوێخسـتن و نکوڵیکردن نەبێت. کیمیابارانی هەڵەبجە ئەو هەل و دەرفەتەی بۆ ئێران رەخسـاند عێراق ریسوا بکات، هەر بۆیە ناشـتنی تەرمی قوربانیانی هەڵەبجەی وەدوا خسـت و ژمارەیەکی زۆر رۆژنامەنووسـی بیانی هێنایە هەڵەبجە بۆ ئـەوەی لە تەرمی قوربانیانی ئەو کارەساتە کە زۆربەیان ژن و منداڵ بوون فیلم و وێنە هەڵبگرن و لە دنیادا بڵاوی بکەنەوە.

کۆماری ئیسـلامی بەدوای ئامانجەکانی خۆیـدا بوو، بەڵام هێنانی رۆژنامەنووسە بیانیەکان بۆ هەڵەبجە خزمەتێکی گەورەی بە کورد کرد و نەیهێشت قوربانیەکان لە بێدەنگی و بێخەبەری کۆمەڵگای نێونەتەوەییدا بکرێن بە ژێر خاکەوە. دەوڵەتی عێراق پێیوابوو کیمیابارانی هەڵەبجەش وەک کیمیابارانەکانی دیکە پشتگوێ دەخرێت چونکە هیچ بەڵگەیەک بۆ سـەلماندنی کیمیابارانەکە ناکەوێتە دەستی کۆمەڵگای نێونەتەویی بەڵام بەهەڵەدا چووبوو.

بڵاوبوونـەوەی وێنە و فیلمـی قوربانیانی بێ گوناهـی هەڵەبجە لە میدیاکانی سەراسەری جیهان، کۆمەڵگای جیهانی هەژاند. لە ٢٤ی ئاداری ١٩٨٨ رۆژنامەی واشـینگتۆن پۆسـت و نیۆیۆرک تایمـز بۆ یەکەمجار لاپـەڕەی یەکەمیان بۆ ئەو رووداوە تەرخان کرد و کاناڵە تەلەڤزیۆنەکانی ئەمریـکاش بە ماوەی چەند رۆژ وێنـەی قوربانیەکانیان بڵاو دەکردەوە.

پاتریک تەیلۆر له «واشینگتۆن پۆست»دا نووسیبووی:

« چوار کچی بچکۆله له جلوبەرگی کوردیدا وەک بووکەڵەی شێوێنراو له قەراخ چەمێکی بچکۆڵەوه له نزیگ گوندی عەنەب راکێشراون، له نزیک باخچەیەکـــی پڕ له گوڵ دوو ژن له مەرگـــدا یەکتریان له ئامێز گرتووه، پیاوێکی پیری جامانه بەســـەر له بەردەم دەرگای ماڵەکەیدا کۆرپەیەکی نوساندوه به سنگییەوه.»[18]

رۆژنامەی «نیۆیۆرک تایمز» له ســـەروتارێکدا له ژێر ناوی» گازی ژەهراوی: تاوانی عێراق» له ٢٦ی ئاداری ١٩٨٨ عێراقی به بەرپرسیاری کیمیابارانەکه لەقەڵەمدا و جەختی له سەر ئەوە کردەوه که قوربانیەکان سەربازی ئێران نین، بەڵکوو هاووڵاتی خودی عێراقن و ئەمەش هەڕەشەیه له ســـەر کوردەکان که گروپێکی ئەتنیکی دژبـــەری رژێمی عێراقن[19] نیۆیۆرک تایمز داوای له دەوڵەتی ئەمریکا کرد هەڕەشـــه له عێراق بکات و یارمەتیه ئابوریەکانی به عێراق رابگرێت، بەڵام ئەمریکا نه هەڕەشـــەی له عێراق کرد و نه پێداگری له سەر هیچ کرد.

کاربەدەســـتانی ئەمریکا جەختیان له سەر ئەوە دەکردەوه که دڵنیا نین عێراق بەرپرســـیاری کیمیابارانەکه بێت. وتەبێژی کۆشکی سپی له کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا لەو پەیوەندییەدا وتی:

« ئێمەش له کۆشـــکی سپی تەنها ئەو راپۆرتانەمان بینیوه که ئێوە دوێشـــەو لـــه تەلەڤزیۆنەکاندا بینیتان. وێنەکان زۆر ســـامناک، قیزەون و دڵتەزێـــن بـــوون. ئەمه دەبێت ببێت به بەڵگەیـــەک بۆ ئەوەی هەموو دەوڵەتـــەکان چەکی کیمیایـــی قەدەخه بکەن. داوا لـــه ئێران و عێراق دەکەین دەســـتبەجێ کۆتایی به کەڵکوەرگرتن له چەکی کیمیایی بهێنن که سووکایەتیه به شارستانییەت و مرۆڤایەتی»[20]

کاربەدەســـتانی ئەمریکا بانگەشـــەی ئەوەیان دەکـــرد که بەڵگه بۆ ســـەلماندنی بەرپرسیاربوونی عێراق زۆر پتەو نییه. CIA له راپۆرتێکدا له ٢٤ی ئاداری ١٩٨٨ رایگەیاند:

« بەڵگه و شـــەهیدەکان له بـــارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی له

شـــەڕ لە نزیک  هەڵەبجە لە باکووری عێـــراق روون نین و پڕۆپاگەندای ئێـــران و عێراق دژ بە یەکدی لەو پەیوەندیەدا، بارودۆخەکەی ئەوەندەی دیکـــە ئاڵۆز کردووە، بەڵام بەهەرحاڵ روونە کە هەم ئێران و هەم عێراق لەو شـــەڕەدا چەکی کیمیاییان بەکارهێناوە و وادیارە  دەیانەوێت درێژە بە کەڵکوەرگرتن لە چەکی کیمیایی بدەن(٢١).

ئەمریکا بە تەواوی ئاگاداری ئەوە بوو کە عێراق بووە کە هەڵەبجەی کیمیاباران کردووە، بەڵام بەشێک لە تاوانی کیمیابارانەکەی خستە ئەستۆی ئێـــران. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هەفتەیـــەک دوای کیمیابارانەکە بە ســـەرجەم باڵوێزخانەکانی ئەمریکا لە سەراســـەری جیهانی راگەیاند کە ئێـــران و عێراق هەردوویـــان لە دەوروبەری هەڵەبجـــە چەکی کیمیاییان بەکارهێنـــاوە و پێیراگەیاندن کە جاڕی لێبدەن ئێران و عێراق هەردوویان هەڵەبجەیان کیمیاباران کردووە. هاوکات  لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانیـــش، ئەمریکا رێگری لـــە هەوڵێکی ئێران کرد بۆ ئەوەی عێراق بەهۆی کیمیابارانەکە شـــەرمەزار بکرێت. بەوەش عێراق تیشکێکی ســـەوزی لە ئەمریکا وەرگرت کە ئەگەر هێرش بکاتە سەر کوردەکان سزا نادرێت.

رۆژنامـــەی نیۆیۆرک تایمـــز رۆژی ٢٧ی ئـــاداری ١٩٨٨ لە وتارێکدا نووسی:

«بە وتەی کاربەدەســـتانی ئەمریکا، عێراق چەکی کیمیایی لە ناو و دەوروبـــەری هەڵەبجە بەکارهێناوە. چارلز ریدمـــەن، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە رایگەیانـــدووە کە  لەوانەیە ئێرانیـــش  چەکی کیمیایی بە تۆپ بەکارهێنابێـــت، بەڵام رێدمەن ئاماژەی بەوە نەکرد کە لە ســـەر بنەمای کام زانیاری بانگەشـــەی ئەوە دەکات. بە وتەی پسپۆڕە سەربازییەکانی ئەمریـــکا و عێراق، هێرشـــەکەی حەفتەی رابردووی ئێـــران بۆ باکووری عێراق ســـەرکەوتنێکی تاکتیکی بووە. ئێران هێزەکانی عێراقی غافڵگیر کرد و ١٥٠٠ ســـەربازی عێراقی بە دیل گرت. شـــیکەرەوە سیاســـیەکان دەڵێن ئێران (کە لەلایەن کوردەکانەوە یارمەتی دەدرێت کە دژی دەوڵەتی

بەغدادن) دەتوانێت شـــارۆچکەلێکی شاخاوی و گۆشەگیر وەک هەڵەبجە لە ســـەر ســـنوور بگرێت، بەڵام ناتوانێت هەڕەشەی جدی بۆ سەر شاری کەرکووک ( کە دامەزراوە ســـەرەکیەکانی نەوتی عێراقی تێدایە) دروست بکات. لەم قۆناخەشـــدا ئامانجی ئێران ئەوە نییە کە هێرش بکاتە سەر کەرکووک.»[٢٢]

دەزگای هەواڵگـــری بەرگـــری (DIA) لە تشـــرینی یەکەمی ١٩٨٨ لە راپۆرتێکدا دەڵێت:

« لە شـــەڕی هەڵەبجە و هەندێ گوندی نزیکدا عێراق و ئێران گازی کیمیاییـــان بەکارهێناوە بە گوێرەی زانیارییەکانـــی دەزگای هەواڵگری تایبەت، لانیکەم هەندێ لە سڤیلە کوردەکان بە هۆی کیمیابارانی ئێرانەوە بریندار بوونە. هێزە کوردەکان ســـکاڵای ئەوە دەکەن کە لە هەردوو لاوە کیمیاباران کراون».

کاربەدەستانی ئەمریکا نیگەرانی ئەوە بوون کە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان دەریبخات کە عێراق بووە کە هەڵەبجەی کیمیاباران کردوە ئەفسەرێکی خانەنشینی هەواڵگری ئەمریکا دەڵێت:

« کاتی کیمیابارانی هەڵەبجە، وۆلڤیتز و ئارمیتاژ ویستیان یارمەتی و پشـــتگیری خۆمان بۆ عێراق رابگرین بۆ ئەوەی ئەگەر هات و زانرا کە ئەمریکا زانیاری هەواڵگری داوە بە عێراق، پێش لە کاردانەوەیەکی توند و کتوپڕ بگرین لە کاتێکدا کە عێراق گەلەکەی خۆی کیمیاباران کردبوو. دواجار لە کۆبوونەوەیەکی جێگرەکانی وەزارەتەکان و جێگری بەڕێوەبەری CIA بەو ئەنجامە گەیشتین کە نابێت ئێران جەنگەکە بباتەوە»[٢٣]

لە حوزەیرانی ١٩٨٨ جەلال تاڵەبانی، ســـکرتێری گشـــتی یەکێتی نیشـــتمانی کوردستان سەردانی واشـــینگتۆنی کرد و هەوڵیدا مەسەلەکە بخاتەڕوو. مام جەلال بە رۆژنامەی واشینگتۆن تایمزی وت:

«بـــۆ یەکەمجـــارە لە مێـــژوودا کـــە حکومەتێک چەکـــی کیمیایی دژی هاووڵاتیانـــی خـــۆی بەکاربێنێت لە کاتێکدا کـــە لە بەرەی جەنگدا نەبوون».

لاری پۆپ، بەرپرســـی نووســـینگەی کاروباری ئێـــران و عێراق لە وەزارەتی دەرەوە هەرچەند لەگەڵ سیاسەتی رەیگان بۆ هاوکاری لەگەڵ رژێمی عێراق هاوڕا بوو و بـــەردەوام پێداگری کردبوو کە نابێت ئەمریکا هیچ جۆرە پەیوەندییەک لەگەڵ کورد بگرێت، بەڵام دیمەنەکانی هەڵەبجە ئەوەندە بێزاری کردبوون کە پێیوابوو پێویستە ئەمریکا بە پێشوازیکردن لە مام جەلال لە وەزارەتی دەرەوە نیگەرانی خۆی لە کردەوەکانی عێراق دەرببڕێت.

لاری پۆپ بە ماوەی یەک کاتژمێر لەگەڵ جەلال تاڵەبانی دانیشـــت بەڵام دانیشـــتنەکە هیچی لێ شین نەبوو و ئەنجامی پێچەوانەی بەدواوە بوو، چونکە شـــەپۆلی نارەزایەتی تورکیـــە و عێراق وەزارەتی دەرەوەی ناچار کرد لە هەڵوێســـتەکەی پاشەکشـــە بکات. جۆرج شوڵتز، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە دانیشـــتنەکەی پـــۆپ لەگەڵ تاڵەبانی تورە بوو و وتی ئەم بیرۆکە دۆزەخییە هی کێ بووە؟.

کنعان ئەڤرین، سەرۆک کۆماری تورکیە کە بۆ دیتنی شولتز سەردانی واشـــینگتۆنی کردبوو نارەزایەتی توندی خۆی لەو دیدارە دەربڕی. تاریق عەزیزیش ئەمریکای تاوانبار کرد کە دەست لە کاروباری عێراق وەردەدات. بـــۆ هێورکردنـــەوەی بارودۆخەکـــە وەزارەتـــی دەرەوەی ئەمریکا خێرا راگەیاندننامەیەکی دەرکرد و جەختی لە ســـەر ئەوە کردەوە کە ئەمریکا دەســـتوەرناداتەوە کاروباری ئەو وڵاتانە کە کەمینـــەی کوردیان هەیە. وەزارەتی دەرەوە هەروەها دووپاتی کردەوە کە مەســـەلەی هەڵبژاردنی ئەو کەسانە کە لە OPEN FORUM بەشدار دەبن و بیروبۆچوونەکانیان هیچکام دەربڕی سیاسەت یا روانگە و بیروبۆچونەکانی وەزارەتی دەرەوە یـــا دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریـــکا نیە و ئامادەبوونی بەڕێز تاڵەبانی لە OPEN FORUM بە واتای پشتیوانیکردنی وەزارەتی دەرەوە لە تاڵەبانی نیە[٢٤]

ســـەرەنجام لاری پۆپ ســـەرکۆنە کرا و وەزارەتی دەرەوە رایگەیاند ئیدی لە فەرمانگە حکومیەکاندا لەگەڵ سەرکردە کوردەکان دیدار ناکات.

دانیشـــتنەکەی پۆپ  لە باتی ئەوەی پەیامی نیگەرانی بنێریت بۆ عێراق، پەیامـــی ئەوەی نارد کە پەیوەندی ئەمریـــکا لەگەڵ عێراق و تورکیە لە ســـەرجەم ئەو شتانە گرنگترە کە تورکیە و بەتایبەت سەدام لە ناوخۆی وڵاتەکەیاندا دەیکەن. لەگەڵ ئەوەشدا سەردانەکەی مام جەلال سودمەند بوو، چونکە چەند ئەندامێکی کۆنگرێسی بینی و چاوی کەوت بە سناتۆر پیتێر گالبریس و یارمەتیدا بە دەرچوونی بڕیارەکەی ســـناتۆر میشـــێل بۆ ســـەرکۆنەکردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کە لە ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٨٨ بە کۆی دەنگ پەسەندکرا[٢٥].

لـــە ١٩٨٨ دۆکتۆر مەحمود عوســـمان وەک نوێنـــەری بەرەی کورد ســـەردانی واشـــینگتۆنی کرد و هەوڵیدا لەگەڵ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە دابنیشێت و لە بارەی سیاسەتەکانی سەدام دژ بە کورد بەتایبەت بەکارهێنانـــی چەکی کیمیایـــی گفتوگۆیان لەگەڵ بـــکات. کۆمەڵێک لە رۆژنامەنووسان بەتایبەت جاناتان راندێل، جیم هۆگلاند و ویلیام سافاییر لەگەڵ وەزارەتی دەرەوە پەیوەندیان گرت بۆ ئەوەی کەســـێکیان لەگەڵ مەحمود عوســـمان دابنیشێت، بەڵام پاش سێ مانگ هیچ کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوە رازی نەبوو[٢٦].

## کیمیابارانی هەڵەبجە لە ئەجیندای نەتەوە یەکگرتووەکاندا

دوای کیمیابارانـــی هەڵەبجە ململانـــێ و زۆرانبازی ئێران و عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەســـتیپێکرد. ئێران بەڵگەی زۆری ڕادەســـت بە خاڤێر پرێز دیکۆئیار، ســـکرتێری گشـــتی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد بۆ ئەوەی بیســـەلمێنێت کـــە عێراق هەڵەبجەی کیمیابـــاران کردووە. ئێران ڕایگەیاند لە ماوەی ٥ ڕۆژ هێرشی عێراقدا ٥ هەزار کەس لە هەڵەبجە بە چەکی کیمیایی کوژراون و ٥ هەزار کەســـی دیکەش بریندار بوونە. ئێران هەڕەشـــەی کرد ئەگەر سکرتێری گشـــتی نەتەوە یەکگرتووەکان تیمێکی لێکۆڵینەوە نەنێرێت بۆ ئێران، لە دانیشـــتنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەشداری ناکات.

لـــە ٢٤ی ئاداری ١٩٨٨ وتەبێژی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕایگەیاند کە ســـکرتێری گشـــتی تیمێک بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی خەڵکی ســـڤیل لەلایەن عێراقەوە ڕەوانەی ئێران دەکات. ژمارەیـــەک لە وڵاتانی ئەندامـــی ئەنجومەنی ئاســـایش، لەوانە ئەمریکا هەوڵیاندا سکرتێری گشتی لە ناردنی تیمی لێکۆڵینەوە بۆ ئێران پەشیمان بکەنەوە و جەختیان لە سەر ئەوە کردەوە کە چوونی ئەو تیمە بۆ ئێران، ڕەوتی گفتوگۆکانی ئاگربەستی نێوان ئەو دوو وڵاتە تێکدەدات کە بڕیارە مانگی داهاتوو بەڕێوەبچێت.

هەر هەمان ڕۆژ پرێز دکۆئیار ڕایگەیاند بەڵگەی تەواو و حاشاهەڵنەگری بەدەســـتەوەیە کە عێراق چەکی کیمیایی لـــە هەڵەبجە بەکارهێناوە، کە ژمارەیەکـــی زۆر لە خەڵـــک، لەوانە خەلکی ســـڤیلی بەرکەوتوە. بەڵام نوێنەری ئێران ڕایگەیاند کە ئەم لێدوانەی سکرتێری گشتی بەس نییە و دەبێ هەنگاوی بەکردەوە هەڵبگیردرێت[٢٧]

ڕاگەیاندننامەکەی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ناڕەزایەتی تونـــدی عێراقی بەدواوە بوو. تاریق عەزیز نامەیەکی توندی بۆ دیکۆئیار نووسی و ناڕەزایەتی و نائۆمیدی خۆی سەبارەت بە سروشتی ناهاوسەنگ

و لایەنگریکارانەی راگەیاندنەکە دەربڕی و سەرزنشـــتی کرد کە دڕندەیی ئێرانیـــەکان و مامەڵـــەی ئێران لەگـــەل دیلەکانی جەنـــگ و تۆپبارانی شـــار و شـــارۆچکەکانی عێراقی پشتگوێ خســـتوە. تاریق عەزیز وێڕای رەتکردنـــەوەی تۆمەتی کیمیابارانی هەلەبجە لە لایەن عێراقەوە، وتبووی ئێمـــە دووبارە دووپاتی دەکەینەوە کە ئێران چەند جار چەکی کیمیایی لە بەرەی شەڕدا بەکارهێناوە و ئێستاش لە ناو شارەکاندا بەکاریهێناوە. تاریـــق عەزیز لە کۆتاییدا جەختی لەســـەر ئەوە کردبـــووەوە کە گەلی ئێمـــە بڕیاریداوە هەموو هێز و توانای خۆی دژ بە داگیرکەرانی تاوانکار بەکاربێنێت» [٢٨].

بەمشـــێوەیە عێراق بەرپرســـیارێتی کیمیابارانی هەڵەبجەی خســـتە ئەســـتۆی ئێران. سکرتێری گشتی تیمێکی لێکۆڵینەوەی نارد بۆ ئێران، بەڵام تیمەکە نەیتوانی ســـەردانی هەڵەبجە بکات. لە ٤ی نیســـان تاریق عەزیـــز نەتەوە یەککگرتوەکانی ئاگادار کـــردەوە کە ئێران لە ٣٠ی ئادار لە کەرتی هەڵەبجـــە چەکی کیمیایی دژی هێزەکانی عێراق بەکارهێناوە. تیمەکەی نەتەوە یەککگرتوەکان هەر کە لە تاران گەڕایەوە یەکسەر نێردرا بۆ بەغداد و لە ٨ تا ١١ی نیسان سەیری بریندارە عێراقیەکانی کرد.

لە ٢٥ی نیسان راپۆرتی ئەو تیمە خرایە بەردەم ئەنجومەنی ئاسایش کە تێیدا ســـکرتێری گشتی هەستی قوڵی خۆی دەربڕیبوو، سەبارەت بە مەترســـی بەردەوامبوونی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە شەڕی ئێران و عێراقدا و جەختی لە ســـەر ئەوە کردبووەوە کە رۆژ بەرۆژ ژمارەیەکی زۆرتر لە خەڵکی مەدەنی بەر ئەو چەکانە دەکەون. پزیشکە پسپۆڕەکان بەو ئەنجامە گەیشـــتبوون کە هێزەکانی ئێران و خەڵکی ســـڤیل بە هۆی گازی خەردەل و دەمارەوە بریندار بوونە و بەرکەوتوانی ئەم گازە سکاڵای ئەوەیـــان کردوە کە لە ناوچەی هەڵەبجە و لە ٣١ی ئاداردا بەدەم ئازاری برینەکانیەوە تلاونەتەوە.

پاشـــان دوو هەفتەی دیکەی پێچوو تا ئەنجومەنی ئاســـایش بڕیاری کۆتایی خۆی بدات و بە گشتی کردیە دوو مانگ دوای هێرشی هەڵەبجە.

له ٩ی گوڵان ئەنجومەنی ئاسایش به کۆی دەنگ بڕیارنامەیەکی پەسەند کرد و جەختی له سەر ئەوە کردەوە که چەکی کیمیایی له جەنگی ئێران و عێراقدا بەکارهێنراوە و بەردەوامبوونی کەڵکوەرگرتن له چەکی کیمیایی له شەڕ و پێکدادانەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران و عێراقی به توندی ئیدانه کرد و داوای له هەردوولا کرد واز له بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بێنن.

بڕیارنامەکەی ئەنجومەنی ئاسایش ئەوەندە لاواز و درەنگ بوو که هیچ کاریگەرییەکی نەبوو، چونکه سێ هەفته دوای ئەوە عێراق له کاتی هێرش بۆ سەر هێزەکانی ئێران له فاو دیسان چەکی کیمیایی بەکارهێنا و تەنانەت گوندەکانی کوردستانیشی کیمیاباران کرد.

له تەموزی ۱۹۸۸ تاریق عەزیز بەئاشکرا دانیپێدانا که عێراق گازی کیمیایی دژ به هێزەکانی ئێران بەکارهێناوە و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە که ئەوە مافی ڕەوای عێراقه و وتی ئێرانیش چەکی کیمیایی بەکارهێناوە و بانگەشەی ئەوەی کرد که یەکەمجار ئێران بووە چەکی کیمیایی بەکارهێناوە [٢٩].

# ئەمریکا و ئەنفال

پاش ئەوەی سەدام حوسەین، عەلی حەسەن ئەلمەجیدی کردە بەرپرسی فەرمانگەی کاروباری باکوور، عەلی کیمیایی لە سەرەتای ١٩٨٧ دەستیکرد بە کاولکردنی گوندەکان و راگوازتنی کوردنشینەکان بۆ ئەوەی کەمکەم بوار بۆ جێبەجێکردنی شالاوی ئەنفال خۆش بکات. عەلی کیمیایی سەرەتا فەرمانی دەرکرد چەکی کیمیایی دژی بنکە و بارەگاکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان و گوندەکانی دەوروبەریان بەکاربێت.

ئەمریکا هەر لە سەرەتای ١٩٨٧وە زانیاری ئەوەی بەدەستگەیشتبوو کە دەوڵەتی عێراق چەکی کیمیایی دژی هێزی پێشمەرگە و خەڵکی سڤیلی کوردستان بەکار دەهێنێ. باڵوێزخانەی ئەمریکا لەبەغداد بەردەوام زانیاری دەنارد بۆ وەزارەتی دەرەوە کە رژێمی عێراق شالاوێکی بەرفراوانی بۆ راگوازتنەوەی گوندنشینە کوردەکان دەستپێکردوە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بە شێوەیەکی سیستماتیک چاودێری بە سەر جوڵەی هێزەکانی عێراقدا دەکرد و زانیاری تەواوی لە بارەی شالاوی راگوازتنی کوردەکان لابوو. لاری پۆپ سەرپەرشتیاری نوسینگەی کاروباری ئێران - عێراق لە وەزارەتی دەرەوە دەڵێت:

«راپۆرتەکان لە عێراقەوە زۆر باش دەهاتن. هەندێک جار راپۆرتەکان بە ماوەی دوو هەفتە دوا دەکەوت، بەڵام ئێمە دەمانزانی کە شتێکی سامناک روو دەدات. دەمانزانی کە عەلی حەسەن ئەلمەجید سەرپەرشتی کوشتارەکە دەکات، وێنەی سەتەلایتمان هەبوو کە نیشانیدەدا چۆن گوندەکان کاول دەکرێن»[٣٠].

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد لە تیلیگرامێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوە لە گوڵانی ١٩٨٧ دەڵێت:

« زانیاری پێویست لە باکوورەوە بەدەستمانگەیشتوە کە نیشان دەدات بە دڵنیاییەوە دەوڵەتی عێراق شالاوێکی بەرفراوان لە کوردستان

بەڕێوەدەبات. راپۆرتی پزیشــکی قوربانیەکان لە نەخۆشخانەکان نیشان دەدات کــە هێزەکانی عێراق لەڕێگای هیلیکۆپتەرەوە گازی موســتارد، گازی سارین و تابونیان دژی گوندنشــینەکان بەکارهێناوە... کۆمەڵێک راپۆرتــی لە بارەی بەکارهێنانی گاز لە ناوچەی ســلێمانی بۆمان ناردوە و... ســەربازەکانی عێراقی تەنانەت لە شەقامەکانی سلێمانیدا بینیوە کە جلوبەرگی دژ بە کیمیایان پۆشیوە [٣١] سیاسەتی دەوڵەتی عێراق بۆ چۆڵکردن و کاولکردنی گوندە کوردنشــینەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان بەرەوپێش دەچێت. لەو بەرنامەیەدا لە گازی موستارد و هەندێ لە گازە کوشندە تایبەتەکانی دیکە کەڵکوەردەگیردرێت» [٣٢].

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد لە تیلیگرامێکی دیکەدا بۆ وەزارەتی دەرەوە لە تەموزی ١٩٨٧ دەڵێت:

«کۆمەڵێک بەڵگەی ناڕاســتەوخۆمان هەیە کە نیشان دەدات رژێمی عێراق کۆمەڵێک کێشەی لەگەڵ کوردەکاندا هەیە. راپۆرتە جۆراوجۆرەکان نیشــان دەدات کە هەندێ لە کوردەکان نێردراون بۆ بیابانی عەرعەر لە ســەر سنووری عەرەبستانی سعودی. جودایدات عەرعەر یەکێ لە شوێنە دوردەست و پەرتەکانی جیهانی عەرەبە» [٣٣].

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد لە تیلیگرامێکی دیکەدا بۆ وەزارەتی دەرەوە لە ئەیلوولی ١٩٨٨ دەڵێت:

« لــە بەهــاری ١٩٨٧ کۆمەڵێــک زانیاریمان بەدەستگەیشــت لە بارەی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان لە ناوچە شــاخاوییەکان راگوازراونەتەوە بۆ ئوردوگای روتبە لە بیابانەکانی نزیک سنووری ئوردون و ئوردوگاکانی نزیک فەلوجە و رومادی. ئەم زانیاریانە لەگەڵ نمونەکانی پەیوەندیدار بە شاڵاوی عێراق دژ بە کوردەکان لە دەیەی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ یەکدەگرێتەوە. لە کاتی ســەفەرەکەی خۆمان بۆ کوردســتان، بینیمان کــە ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکان و تەنانەت هەندێک لە شــارۆچکەکانی ســەر ڕێگا ســەرەکییەکان لە پارێزگای سلێمانی، هەولێر و دهۆک کاول کراون» [٣٤].

عەلی حەســەن ئەلمەجید، بەرپرسی نووســینگەی باکووری حیزبی بەعس لە وتارێکدا بۆ دۆســتان و دڵســۆزانی حیزبی بەعس لە کۆتایی ســاڵی ١٩٨٧ ئاگاداری کردنــەوە کە کەس لە گوندەکانی کوردســتان رزگاری نابێت (تەنانەت موستەشــار و جاشەکانیش) ئەگەر گوندەکانیان چۆڵ نەکەن. عەلی حەسەن ئەلمەجید لەو پەیوەندییەدا دەڵێت:

«مــن ناتوانــم گوندەکانتان هــەروا بهێڵمەوە، بــە چەکی کیمیایی هێرشــیان دەکەمە ســەر و بەمجۆرە خۆتان و خیزانەکانتان دەکوژێن. ئێــوە دەبێ دەســتبەجێ چۆڵی بکەن. ناتوانــم پیتانبڵێم چی رۆژێک بڕیــار دەدەم بە چەکی کیمیایی هێرش دەکەم. هەر هەموویان بە چەکی کیمیایی دەکوژم. با بزانم کێ قســە ئەکات؟ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی؟ لە کۆمەڵــگای نیونەتەویی بم، لەوانەش بم کە گوێیان لێدەگرن. ئەمە نیاز و مەبەســتی منە، هەر کە راگوازتنەوەی گوندنشــینەکانم تەواو کرد لە هەموو شوێنێک پەلاماریان دەدەین بە پێی پلانێکی سەربازی. من تەنها رۆژێک و دوو رۆژ بە چەکی کیمیایی لێیان نادەم بەڵکوو ١٥ رۆژی تەواو کیمیابارانیان دەکەم. پاشــان دەبینن هــەر چی ئۆتوموبیلی دنیا هەیە بەشی گوازتنەوەیان ناکات» [٣٥]

عەلی حەسەن ئەلمەجید لە کۆبوونەوەیەکی دیکەدا لەگەڵ ئەندامانی نووســینگەی باکوور و پارێزگارەکانی هەرێمی ئۆتونومی کوردســتان لە ١٥ی نیسانی ١٩٨٨ دەڵێت:

«هاوینی ساڵی داهاتوو نابێت هیچ گوندێک جگە لە کۆمەڵگاکان (ناوەندە نیشتەجێکردنەکان) مابێتەوە. دەبێ ئەو خەڵکە بخەینە ناو ناوەندەکانی نیشتەجێکردن و چاویشمان لێیانبێت. ئیدی ناهێڵین لە گوندەکاندا بژین و تێکــدەران ســەردانیان بکەن. بۆ چی رێگەیان بــدەم لەوێ وەک کەر بژین و هیچ شــتێک نەزانن. بۆ گەنم؟ گەنمی ئەوانم ناوێت. ٢٠ ســاڵە ئێمە گەنم لە دەرەوە دەهێنین با ٥ ســاڵێ دیکەشــی لەسەر بێت. ئەو ناوچــە بەرفراوانــە قەدەخە دەکەم و ناهێڵم کەســی تێدا بمێنێت. چی دەبێــت ئەگەر ئێمە تەواوی ئــەو ناوچەیە لە قەرەداغــەوە بۆ کفری و

دیاله، دەربەندیخان و سـلێمانی قەدەخە بکەین. تا ئێسـتا چیمان لەم ناوچەیە دەستکەوتووە. وایلێهاتووە ئێستا کەس ناتوانێت بێ ئۆتۆمۆبیلی زرێپۆش لە کەرکووکەوە بچێت بۆ هەولێر. هەمووی ئەم ناوچەیە لە کۆیە بـۆ کەرکووک چۆڵ دەکەم. ناهێڵم یەک کەسـی تێدا بمێنێ، رێگاوبانە سەرەکییەکە نەبێت. ناهێڵم تا ٥ساڵی دیکەی یەک مرۆڤ پێی تێبخات. ئەگەر بەمشـێوەیە کار نەکەین چالاکی تێکدرەدان تا ملیۆنێک سـاڵی دیکەش کۆتایی پێنایێت. پشت بە خوا بەمزوانە هەموویان لەناو دەبەین و لە هاویندا هیچیان لێنامێنێتەوە.»[٣٦]

عەلی کیمیایی لە دانیشـتنێکی دیکەدا لەگەڵ ئەندامانی رێبەرایەتی بەعس لە بەرەبەرەی کۆتاییپێهاتنی شەڕی ئێران و عێراق دەڵێت:

«مـن بە جـەلال تاڵەبانیم وتوە کـە کیمیابارانتـان دەکەم، دەبێ چۆڵـی بکەن، تەنانەت ئەگەر شـەڕیش کۆتاییپێبێت و ئێران لە ناوچە داگیرکراوەکان پاشەکشـە بکات، راگوازتنەوەی خەڵک راناوەستێندرێت. ئێمە سەرەتا بەرنامەی راگوازتنەوە بە تەواوی جێبەجێ دەکەین، شاڵاوە سـەربازیەکانمان درێژە پێدەدەین و پاشـان گۆشەگیریان دەکەین و نە بـۆ رۆژێـک و دوو رۆژ بەڵکوو بە ماوەی ١٥ رۆژ بە چەکی کیمایایی هێرشـیان دەکەینە سەر. ناوی کیمیایی نابەم چونکە زانیاری نهێنییە، بـەڵام دەڵێم بە چەکی کوشـندەی نوێ داتاندەڕزێنم. سـوێند دەخۆم و دڵنیـام کە دەیانبەزێنیـن. بە هەڤاڵە پسـپۆڕەکانم وتووە کە چەند دەسـتەیەکی تایبەتم لە ئوروپاوە پێویستە بۆ کوشتنی ئەم تێکدەرانە. بە پشتیوانی خوا ئەوەش دەکەم.»[٣٧]

عەلی حەسەن ئەلمەجید لە کۆبوونەوەیەکی دیکەدا لەگەڵ ئەندامانی حیزبی بەعس لە ١ی ئابی ١٩٨٨ دەڵێت:

«لە موسـڵ دەرمانکردن بێ هیچ قەرەبووکردنەوەیەک، خانوەکانمان تەختکـردن و وتمان ئادەی بـڕۆن. بەڵام ئەوانەی ئێسـتا جەنگاوەرن سـەرەتا پێیاندەڵێن دەبێ لە ناوەندەکاندا نیشتەجێ بن، بێ ئەوەی هیچ قسـە و مشـتومڕێکیان لەگەڵ بکەین بەڵێننامەیەکیان پێ واژۆ دەکەم.

پاشـــان له هەر شوێنێکی دیکە بیانبینم ســـەریان پان دەکەمەوە ئەم سەگانە هەر دەبێ سەریان پان بکەیتەوە. دەتانەوێ دانیشتوانی عەرەب بەم خەڵکە خوێڕی و هیچ و پوچە زیاد بکەن؟. پێویســـتە ناوچەکەتان واتا موســـڵ بکەینە عەرەب بەڵام عەرەبی رەســـەن نە ئیزدی کە ئەمڕۆ دەڵێـــن کوردین و بەیانی دەڵێـــن عەرەبین. ئیزدی بە کەڵکی چی دێن؟ بێگومان هیچ.»[٣٨]

باڵوێزخانـــەی ویلایەتـــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لـــە رۆم (رۆما) لە تیلێگرامێکـــدا بـــۆ وەزارەتی دەرەوە لە حوزەیرانـــی ١٩٨٨ ئاماژە بەوە دەکات:

«زانیاریەکان نیشان دەدات کە سەرجەم شارۆچکەکانی کوردستان لە سەروبەندی شاڵاوی کۆنترۆڵکردنی پێشمەرگە کوردەکان لەلایەن هێزەکانی دەوڵەتەوە خاپور کراون. بە گوێرەی زانیاریەکان راگوازتنەوەی زۆرەملێی بە کۆمەڵی کـــوردەکان روویداوە و «رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی» بانگەشـــەی ئەوەی کردوە کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی مەدەنی، لەوانە خوێندکاران پاش دەستبەسەرکرانی سەرەڕۆیانە لە سێدارەدراون یان بێ سەروشـــوێن کراون[٣٩]. بەکارهێنانی چەکـــی کیمیایی لە لایەن دەوڵەتی عێراق دژی پێشمەرگە کوردەکان لە ناوچە شاخاویەکانی باکووری عێراق گەیشتوەتە ئەوپەڕی خۆی.[٤٠]

باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغداد بەردەوام زانیاری لە بارەی شاڵاوەکانی رژێمـــی عێراق دژ بە کورد بەدەســـت دەگەیشـــت و راپۆرتی دەنارد بۆ وەزارەتـــی دەرەوە، بـــەڵام کاربەدەســـتانی ئەمریـــکا وەک هەوڵێک بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوونی بەردەوامی کورد سەیریان دەکرد و بە کێشەی ناوخۆیی عێراق لە قەڵەمیاندەدا. لە ئەمریکا ئەو مەسەلەیە وەک بەشێک لە ئەنجامەکانی شـــەڕی ئێران و عێراق ســـەیر دەکرا، ئەمریکا بەردەوام کوردەکانی تۆمەتبار دەکرد کە بوونەتە هاوپەیمانی ئێران و ناڕاستەوخۆ ئەو مافەی بۆ عێراق بە رەوا دەزانی کە خەباتی کورد تێکبشکێنێت.

دەیڤیـــد نیوتـــۆن، باڵوێزی ئەمریکا لە عێراق بـــاس لەوە دەکات کە

واشنگتۆن باش ئاگاداری شاڵاوەکە بوو و دەڵێت:

«روون و ئاشکرا بوو کە عێراق گوندە کوردنشینەکانی کردبوەوە ئامانج و بە ئاشکرا کێڵگە و مەزراکانی دەسوتاند. بەهەرحاڵ من نایەتەوە بیرم کە ئەو مەســـەلەیەم لەگەڵ کاربەدەستانی عێراق باس کردبێت، چونکە هیچ بیانوویەکمان بەدەستەوە نەبوو. بە پێچەوانەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی (دژی ئێران)، ئەمەیان مەسەلەیەکی ناوخۆیی بوو»[٤١].

میدیـــای ئەمریکاش وەکوو پێویســـت بەدوای دۆزەکـــەدا نەدەچوو، چونکە چوونە ناو عێراق کارێکی ئاســـان نەبوو و رۆژنامەنووســـەکان لە ژێـــر چاودێری هەواڵگری عێراقدا بـــوون و بەتایبەت رێگەیان پێنەدەدرا سەردانی ناوچە کوردنشینەکان بکەن. سەرچاوەی سەرەکی رۆژنامەنوسە بیانیـــەکان ئێران بوو، بـــەڵام ئەمریکیەکان ئەوەندە دژی ئێران بوون کە باوەڕیان بە سەرچاوە ئێرانیەکان نەدەکرد.

## ئەمریکا و ئەنفال پاش کۆتایی پێهاتنی شەڕی ئێران و عێراق

ئێران و عێراق لە ٢٠ی ئابی ١٩٨٨ ڕێکەوتننامەی ئاگربەستیان واژۆ کرد کە کۆتایی بە جەنگە خوێناوییە ٨ ساڵییەکەی نێوانیان هێنا. ئەمریکا پێیوابوو ڕژێمی عێراق کۆتایی بە شاڵاوەکانی دژی کوردەکان دەهێنێت، چونکە پێشتر بیانووی ئەوە بوو کە کوردەکان بوونەتە هاوپەیمانی ئێران و هەوڵ بۆ پارچەپارچەکردنی عێراق دەدەن. بەڵام هەر کە شەڕی ئێران و عێراق تەواو بوو، عێراق دەستی ئاوەڵاتر بوو و بە نەفەسێکی تازەوە درێژەی بە شاڵاوی ئەنفال دا. ڕژێمی عێراق ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر کوردی ئەنفال دەکرد و هاوکات پەیوەندییە سیاسی و بازرگانیەکانی ئەمریکا و عێراقیش ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر پەرەیدەسەند.

هیود ڕانکین، لە کاربەدەستانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغداد دەڵێت:

«ئێمە لە باڵوێزخانە ڕامان وابوو کە لەگەڵ کۆتاییهاتنی شەری ئێران و عێراق، سەدام بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەی لە نەهامەتی هەوڵ دەدات، بەڵام کاتێک کە کوردەکانی کیمیابارانکرد ئاشکرابوو کە سەدام پیاوی ئەوە نییە هاوڵاتیانی عێراق خۆشبەخت بکات. سەدام دڕندە بوو، شاڵاوەکانی عێراق دژ بە کوردەکان هیچ پەیوەندیەکیان بە هەرەشەی ئێرانەوە نەبوو، تەنها پەیوەندی بە کوشتنی کوردەکانەوە هەبوو». [٤٢]

جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە یادداشتێکی بە تەواوی نهێنیدا بۆ وەزیری دەرەوە لە ٢ی ئەیلوولی ١٩٨٨ ئاماژە بەوە دەکات کە:

«ئێستا پاش ئاگربەستی ئێران و عێراق، هێزەکانی حکومەتی عێراق لە ئامادەباشیدان بۆ چارەسەرکردنی یەکجاری کێشەی یاخیبوونی کورد. پێناچێت بەغداد هەست بە هیچ ڕێگرییەک بکات لەبەرامبەر

بەکارهێنانـــی چەکی کیمیایی دژی یاخیبوەکان و ئەو گوندنشـــینانە کە پەنایان دەدەن. زۆربەی گوندە کوردنشـــینەکان لە ژێر هەڕەشەی رووخاندان. هێزەکانی ســـەدام حوسەین بە یەک شێوە لەگەڵ چەکدار و سڤیل هەڵسوکەوت دەکەن» [٤٣]

دوو رۆژ پاش دەســـتپێکردنی قۆناخی کۆتایی ئەنفال لە ناوچەی بادینـــان، رۆژنامەی نیۆیۆرک تایمز لـــە راپۆرتێکدا بڵاوی کردەوە کە رژێمـــی عێراق لە کۆتایی مانگی تەموز نزیکەی ٢٠ هەزار ســـەربازی تایبەتـــی ناردوە بۆ باکـــوور و ئەمە ئاماژە بـــەوە دەکات کە عێراق دەیەوێت کۆتایی بە کێشـــەی کـــورد بهێنێت. لە ١ی ئەیلوولی ١٩٨٠ نیۆیـــۆرک تایمز لە لاپەڕەی یەکەمدا ئامـــاژەی بە ناردنی ٦٠ هەزار ســـەرباز بۆ باکوور کرد و نووســـی عێراق دەستیکردوە بە شاڵاوێکی بەرفراوان بۆ لەناوبردنی یەکجاری یاخیبونێکی ٤٠ ساڵە.

لە میانەی قۆناخی کۆتایی ئەنفال لە ٢٥ی ئابی ١٩٨٨ هێزەکانی عێراق لە شاڵاوێکی بەرفراواندا زنجیرەیەک گوندیان لە ناوچەی بادینان کیمیابـــاران کرد، کە لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشـــینەکان کوژران و بریندار بوون. لە ترسی بەردەوامبوونی کیمیابارانەکە نزیکەی ٦٠ هەزار لە خەڵکی تۆقاوی گوندەکانی بادینان بۆ رزگارکردنی گیانیان رژانە ناو تورکیە. تورکیە هەوڵیدا راستیەکان بشارێتەوە و نکوڵی لەوە کرد کە عێراق چەکی کیمیایی دژ بە ئاوارەکان بەکارهێنابێت. تورکیە هەروەها نەیدەهێشـــت چاودێرە ســـەربەخۆکان چاویان بە ئاوارەکان بکەوێت.

پاش کۆڕەوی ئاوارەکان بەرەو تورکیا ئیدی مەسەلەکە رەهەندی نێونەتەوەیی بە خۆوە گرت، چونکە ئاوارەکان ئاسایشـــی نیشتمانی تورکیەیان خســـتبوە مەترســـییەوە کـــە ئەندامی ناتۆ و دۆســـت و هاوپەیمانی ئەمریکا بوو. ریچارد مورفی، یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە رایگەیاند:

«شـــالاوی عێراق دژ بە خەڵکی ســـڤیل کە هەزاران کەسی ئاوارە کـــردوە و باس لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دەکرێت پێشـــێلکاری جدی مافی مرۆڤە و تورکیەی هاوپەیمانمانی خســـتوەتەناو دۆخێکی زەحمەتەوە»

ویلیام ســـافاییر لە وتارێکدا لە ژێر ناوی «کۆمەڵکوژی کوردەکان بە دەستی عێراق رابوەستێنن» کە ٥ی ئەیلوولی ١٩٨٨ لە رۆژنامەی « نیۆیۆرک تایمز»دا بڵاو بووەوە، نووسی:

« لە رۆژی یەکەمی ئاگربەستی ئێران و عێراقەوە، سەدام حوسەین، دیکتاتـــۆری عێـــراق، پەلامارێکی ســـەربازی نوێـــی دژی کوردەکان دەستپێکردووە. ســـەدام دەیەوێت تۆڵە لە کوردەکانی باکوری عێراق بســـێنێتەوە، چونکە جەســـارەتی ئەوەیان کردووە لە کاتی شـــەڕی ســـەدامی دیکتاتۆر لەگەڵ ئێراندا، درێژە بە خەباتە دوورودرێژەکەیان بۆ ئوتونومی بدەن. پاش ئەوە کە دەســـتی ســـەربازەکانی بە هۆی ئاگربەســـتەوە ئاوەڵا بوو، سەدام کوردەکانی تێکشکاندووە و تا ئەو شـــوێنە کە بۆیکراوە چەکی کیمیایی دژیان بەکارهێناوە. ئێستا ٩٠ هەزار ئاوارەی کورد لە شـــارەکانی سەر ســـنووری تورکیە و عێراقدا کۆبوونەوەتەوە و ٤٠ هەزار کەسی دیکەش لە عێراق هەڵاتوون. ئەمە شاڵاوێکە کە ئامانجی قەڵاچۆکردنی گروپێکی کەوناری ئەتنیکییە کە تەنها تاوانی ئەوەیە کە دەیەوێت بە سەربەســـتی[٤٤] (ئازادی) زمان و دابونەریتی خۆی بپارێزێت. ئەمە نمونەیەکی کلاسیکی ژینۆسایدە کە لە ســـەروبەندی جێبەجێکردندایـــە و جیهانیش هیچ ناڵێت. هەزار ساڵە کوردستان وڵاتە، بەڵام دەوڵەت نییە. ئەمڕۆ نزیکەی ٢٠ ملیۆن کـــورد لە ئێـــران، عێراق و تورکیە دەژین و ژمارەیەکی دیکەشـــیان لە ســـوریە و یەکێتی ســـۆڤیەت دەژین. دەوڵەتـــی ئێران چەکوچۆڵ دەدات بـــە کوردەکانی عێراق بۆ دژایەتیکردنی ســـەدام و دیکتاتۆری عێراقیـــش چەکوچۆڵ دەدات بە کوردەکانی ئێران بۆ ئەوەی دژایەتی

سوپای ئایەتوڵلا (خومەینی) بکەن. کوردەکان هەرچەند کە بەشبەشن و دەزانن کە وەک داردەســـت بەکاریان دەهێنن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شـــەڕی ئێران و عێراقیان وەک هەلێـــک بەکارهێنا بۆ ئەوەی جۆرێک ئوتونومی (نە سەربەخۆیی) بەدەستبهێنن. ئاشتیپارێزەکانی نەتەوە یەکگرتـــوەکان لە ژنێـــڤ تەنها نیگەرانی بەرژەوەنـــدی دەوڵەتانی ئەندامـــی نەتەوە یەکگرتوەکانن، هیچ خەمی ژیانی خەڵکی کورد یان لەناوبردنی گازی کیمیایی ناخۆن. تەنانەت ســـکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکانیش نوکەی لێوەنەهاتووە چونکە نایەوێت ئێران یان عێراق لە خۆی بڕەنجێنێت. ئەمڕۆ ســـێ کەس لە جیهاندا هەن کە دەتوانن ڕێژەی دانیشـــتوانی جیهان کەم بکەنەوە: ئیـــدی ئەمین لە ئەفریقا، پۆلپۆت لە ئاسیا و سەدام حوسەین لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست»[45]

ئەمریکا ئیدی نەیدەتوانی مەســـەلەکە پشـــتگوێ بخات کەوابوو کاربەدەســـتانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ یەکەمجار ڕاستەوخۆ کەوتنـــە ناو مەســـەلەکە. لە ٣ی ئەیلوولی ١٩٨٨ ئاپریل گلاســـپی، باڵوێزی ئەمریکا لـــە عێراق نامەیەکی ناڕەزایەتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکای ڕادەســـت بە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی عێراق کرد کە تێدا ئەمریکا نیگەرانی خۆی ســـەبارەت بـــە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی کوردەکان دەربڕیبوو بەڵام کاربەدەســـتانی عێراق هیچ وەڵامێکیان بەو پەیامە نەدایەوە[46]

لـــە ٤ی ئەیلولی ١٩٨٨ باڵوێزی ئەمریکا لـــە بەغداد چاوی بە نزار حەمـــدون، جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق کەوت و پێیراگەیاند کە عێـــراق چەکی کیمیایی (دژی کـــوردەکان) بەکارهێناوە باڵوێزی ئەمریـــکا جەختی لە ســـەر ئەوە کردەوە کە ئەمریـــکا بایەخی زۆر بـــە پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێـــراق دەدات و ئاواتی ئەوەیە کە پەرە بـــەو پەیوەندیانە بدات، بەڵام شـــاڵاوەکانی عێـــراق دژ بە کوردەکان لەوانەیە توانایی ئەمریکا کەم بکاتەوە بۆ ئەوەی هاوکارییەکانی لەگەڵ

عێراق (بەو شـێوەیە کە عێراق و ئەمریکا دەیانەوێت) بەهێزتر بکات. باڵوێـزی ئەمریکا ئاماژەی بەوە کرد کە ئـەوان دەزانن کە راپەڕینی چەکداری (کـوردەکان دژ بـە دەوڵەتی عێـراق) بەردەوامە و ئێران یارمەتی کوردەکان دەدات، بەڵام شـاڵاوی عێـراق دژ بە کوردەکان پەیوەندی بە کاروباری ئەمریکا و هەروەها کۆمەڵگای نێونەتەوەییەوە هەیە. نزار حەمدون هیـچ ئاماژەیەکی بە کیمیابارانکردنی کوردەکان نەکرد، بەڵام وتی شـەڕ (لەگەڵ کـوردەکان) لە ماوەی چەند ڕۆژی داهاتوودا کۆتایی پێدێت[٤٧]

کۆدەنگـی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریـکا درزی تێکەوتبوو و هەر بەشـێکی وەزارەتی دەرەوە بیروڕایەکی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە دەخسـتەڕوو، بەتایبەت نووسـینگەی کاروبـاری ڕۆژهەڵاتی نزیکی وەزارەتی دەرەوە و نووسـینگەی هەواڵگری و لێکۆڵینەوە هەڵوێستی جیاوازیان هەبوو. نووسینگەی هەواڵگری و لێکۆڵینەوە دەیگوت بەڵگەی ئەوەمان بەدەستەوەیە کە عێراق کوردەکان کیمیاباران دەکات، چونکە گفتوگۆی هێزەکانی عێراقمان تۆمارکردوە کە لە نێو خۆیاندا وتوویانە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکاردەهێنن. نووسـینگەی کاروباری ڕۆژهەڵاتـی نزیک ئەوەی ڕەت دەکـردەوە و دەیگوت هیچ بەڵگەیەک بەدەسـتەوە نییە کە عێراق کـوردەکان کیمیابـاران دەکات. پاش دوو هەفتە مشـتومڕی توندی ناوخۆیی، بۆچوونەکەی نووسـینگەی هەواڵگری و لیکۆڵینەوە سـەرکەوت و سـەرەنجام پاش تێپەربوونی ١٨ مانگ بەسـەر دەستپیکردنی شاڵاوی ئەنفالدا، دەوڵەتی ئەمریکا بـۆ یەکەمجار هەڵویسـتی گـرت و وتەبێژی وەزارەتـی دەرەوە لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیدا لە ٨ی ئەیلوول راشکاوانە رایگەیاند:

« لە ئەنجامی هەڵسـەنگاندنی ئێمە لە بارودۆخەکە، بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەرکەوتووە کە عێراق لە شاڵاوە سەربازییەکانی دژی پێشـمەرگە کوردەکان کەڵکی لە چەکـی کیمیایی وەرگرتووە.

ئێمــه نازانین عێراق تا چ رادەیەک چەکی کیمیایی بەکارهێناوە بەڵام هەر چەشنە کەڵکوەرگرتنێک لەم چەکانە، کارێکی پاساوهەڵنەگەر و دزێوە. ئێمە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی شەرمەزار دەکەین هەروەها کە بەردەوام عێراقمان شەرمەزار کردووە»[٤٨]

راگەیاندننامەکــەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لاواز بوو، چونکە هیچ ئاماژەیەکی بە کیمیابارانی خەڵکی سڤیل بەتایبەت شاڵاوی ئەنفال بۆ کۆمەڵکوژی خەڵک و سیاســەتی راگوازتنەوەی گوندنشــینەکان نەکــرد ،بەڵکوو تەنها ئــەوەی وت کە عێراق چەکــی کیمیایی دژی پێشمەرگەکان بەکارهێناوە.

هەر هەمان رۆژ جۆرج شــوڵتز، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ سەعدون حەمادی، وەزیری کاروباری دەرەوەی دەوڵەتی عێراق دیداری کرد و هۆشداری پێدا. شوڵتز پێیوت ئەمریکا بەڵگەی حاشاهەڵنەگری هەیــە کە عێــراق کوردەکانی کیمیاباران کردوە و جەختی لە ســەر ئەوە کــردەوە کە ئەمریکا پێیخۆشــە پەیوەنــدی دووقۆڵی بنیادی هەبێت لەگەڵ عێراقدا بەڵام ئەو ئامانجە جێبەجێ نابێت ئەگەر عێراق بەردەوام بێت لە ســەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە کوردستان یا شــوێنەکانی دیکە. حەمادی سێ جار تۆمەتەکانی رەت کردەوە و بێ بنەما لــە قەڵەمیدا و وتی عێراق، مافــی خۆیەتی خۆی بپارێزێت و پێش لە پارچەپارچەبوونی وڵاتەکەی بگرێت. شــوڵتز وتی بیانگرن و دادگاییان بکەن نە کیمیاباران[٤٩].

کاربەدەستانی ئەمریکا لە بارەی چۆنیەتی رووبەڕووبەنەوە لەگەڵ ئەو کردەوانەی عێراق بیروڕای جیاوازیان هەبوو. هەندێکیان دەیانگوت دیسان عێراق لە ناو لیســتی وڵاتانی پشتیوانی تروریزم دابنرێتەوە، هەندێــک دەیانگوت باڵوێــزی ئەمریکا لە عێراق بکشــێندرێتەوە و هاوکارییــە هەواڵگریەکانی ئەمریکا بە عێراق رابوەســتێندرێت. بەڵام ئیــدارەی رەیگان پێیوابوو کە پەیوەندی لەگەڵ عێراق پێویســتی بە

جۆرێک چاککردنەوە هەیە نە تێکدان. هەندێکی دیکە لە کاربەدەستانی ئەمریکا پێشنیاریان کرد لانیکەم داوا لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتـــوەکان بکرێـــت لـــە کۆبونەوەیەکی تایبەتدا لەو مەســـەلەیە بکۆڵێتەوە. ســـەرەنجام ئەمریکا لە گەڵ ٩ دەوڵەتی دیکە داوایان لە نەتـــەوە یەکگرتوەکان کرد تیمێکی تایبـــەت بنێرێت بۆ عێراق، بەڵام عێراق ئەوەی رەتکردەوە و بەدەســـتێوەردان لـــە کاروباری ناوخۆیی عێراق لەقەڵەمیدا.

وتارەکـــەی ویلیام ســـافایێر بە ناوی» کۆمەڵکـــوژی کوردەکان بەدەستی دەوڵەتی عێراق رابوەستێنن» کە ٥ی ئەیلوول لە رۆژنامەی نیۆیـــۆرک تایمـــزدا بڵاو بووەوە و وتارەکەی جیـــم هۆگلاند بە ناوی «بە هەڵەدا مەچن، ئەمە ژینۆسایدە» کە ٨ی ئەیلوول لە رۆژنامەی واشـــینگتۆن پۆســـتدا بڵاو بوەوە بۆ یەکەمجار سەرنجی کۆمەڵگای ئەمریکا و بەتایبەت هەندێ لە ئەندامانی ئەنجومەنی پیرانی بەرەولای ژینۆســـایدی کورد راکێشـــا. هەندێ لە ئەندامانی ئەنجومەنی پیران مەســـەلەکەیان ورژاند و دوابەدوای ئەوە مشـــتومڕ و قســـەوباس لە کۆنگرێس لە بارەی چۆنیەتی ســـزادانی عێراق دەستپێکرد کە هەتا کۆتایی مانگی ئەیلوول بەردەوام بوو.

یەک رۆژ دوای پەســـەندکرانی بڕیارنامەی پێشگیری لە ژینۆساید لە ئەنجومەنی نوێنەران، حوسەین کامیل، وەزیری پیشەسازی عێراق (کە نزیکترین کەس بوو لە ســـەدام حوسەین) لە کاتی دیدار لەگەڵ لێژنەیەکی ئەمریکایی لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٨٨ ســـەبارەت بە ئەگەری سەپاندنی ئابلۆقە بەسەر عێراقدا هۆشداریدا. حوسەین کامیل حاشای لـــەوە کرد کە عێـــراق چەکی کیمیایی دژی کـــورد بەکارهێنابێت و جەختی لە ســـەر ئەوە کردەوە کە سەهیونیســـتەکان لە پشتی ئەو بڕیارنامەیەی ئەنجومەنی پیراندان، چونکە عێراق خەریکە کوردەکانی باکوور کە داردەستی ئیسرائیلن دەبەزێنێت(٥٠).

ســـەرەنجام ئەنجومەنی پیران له ١٧ی ئەیلوول گەڵاڵە یاسایەکی پەسەند کرد بۆ ســـەپاندنی ئابڵۆقەی ئابووری بەسەر عێراقدا، بەڵام وەزارەتی دەرەوە دەســـتبەجێ گەڵاڵە یاســـاکەی رەتکردەوە، چونکە لە روانگەی ئەوانەوە گەڵاڵەیاســـاکە زیانـــی بە پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریـــکا دەگەیاند و چالاکی کۆمپانیـــا بازرگانیەکانی ئەمریکا لە عێراقی دەخســـتە ناو مەترسی. جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاســـیای وزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ٢٢ی ئەیلوول دەربارەی گەڵاڵە یاساکەی ئەنجومەنی پیران وتی:

«ئێمـــە ناتوانین پشـــتیوانی لەم گەڵاڵە یاســـایە بکەین، چونکە لەســـەر ئەو باوەڕەین کە ئابڵۆقەدانی عێراق لەم قۆناخەدا لە ئامانجە هاوبەشـــەکانی ئەم کۆمیتەیە نزیکمان ناکاتەوە کە ئەوەیە عێراق بۆ هەمیشە کۆتایی بە کەڵکوەرگرتن لە چەکە کیمیاییەکان بهێنێت. ئێمە لەســـەر ئەو باوەڕەین کە پەسەندکردنی ئەم یاسایە لە ئێستادا زیان لە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ عێراق دەدات و هەروەها زیان دەگەیەنێت بـــەو کۆمپانیانەی ئەمریکا کە کەلوپەل دەنێرن بۆ عێراق. ئێمە دەبێ زۆرتر بۆ ئەو ئامانجە هەوڵ بدەین کە عێراق کۆتایی بە کەڵکوەرگرتن لە چەکی کیمیایی بێنێت»[٥١].

کاتێک کە مشـــتومڕ لە سەر ئابڵۆقەدانی ئابووری عێراق گەرم بوو دەوڵەتی عێراق هەســـتی بە مەترســـی کرد، هەربۆیە تاریق عەزیز لە ١٧ی ئەیلوول بە پێداگریەوە حاشای لەوە کرد کە گازی کیمیایی دژی کورد بەکارهاتبێت و وتی کەس ناتوانێت کوشتنی چۆلەکەیەکیش بە گازی کیمیایی بســـەلمێنێت. بەڵام تاریق عەزیز نکوڵی لەوە نەکرد کە عێراق ئەو کوردانە رادەگوازێت کە لە نزیک سنوری ئێران نیشتەجێن و وتـــی ئەمە ئاوارەکردنی خەڵک نییە، ئەمە رێکخســـتنەوەی دۆخی شـــارەکانە. تاریق عەزیز لە کۆتایی قســـەکانیدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە عێراق بە یاسا نێونەتەوەییەکان پابەندە. لە بەرامبەریشدا

وەزارەتـــی دەرەوەی ئەمریـــکا دڵنیاکردنەوەکەی تاریق عەزیزی وەک «بەڵێنێکی زۆر بایەخدار و جێی رەزامەندی» وەسفکرد[٥٢].

هاوکات لەگەڵ بەردەوامبوونی شـــاڵاوی راگوازتنەوەی دانیشتوانی گوندە کوردنشـــینەکان بەتایبەت ناوچەی پشـــدەر و شاری قەڵادزێ، لە کۆتایی ســـاڵی ١٩٨٨ پەیوەندییە بازرگانیەکانی ئەمریکا و عێراق بە رێژەیەکی بەرچاو پەرەیســـەند. وەزارەتـــی دەرەوەی ئەمریکا لە راپۆرتێکدا لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٨ ئاماژە بەوە دەکات کە:

«بە کۆتاییپێهاتنی شـــەڕ لە کەنـــداو، کاتەکە گونجاوە بۆ ئەوەی کەڵک لە دەرفەتە نوێکان وەربگریـــن بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانمان بکەیـــن بـــە پرۆژە. بـــە وەدواخســـتنی کات یا گۆڕینی ئاراســـتەی شـــتەکان، ئـــەو بەرژەوەندییانە بۆمان دەســـتەبەر نابێـــت. عێراق بازارێکی سەرەکییە (بۆ ئەمریکا) و ئەمریکا دەتوانێت لە چەند ساڵی داهاتـــوودا بایـــی چەندەها بلیۆن دۆلار کاڵا هەنـــاردەی عێراق بکات بـــۆ ئاوەدانکردنەوەی عێراق (کە لە ئەنجامی شـــەڕی ئێران و عێراقدا زیانـــی لێکەوتووە). کۆمپانیا ئەمریکییەکان پێویســـتیان بە گارانتی کریدیتی درێژخایەنتر هەیە بۆ ئەوەی بتوانن لەو دەرفەتە بازرگانییە نوێیانە کەڵک وەربگرن کە لە ئەنجامی کۆتاییپێهاتنی شەڕی کەنداودا رەخساوە. سەرکردایەتی عێراقیش دەیەوێت پەیوەندیە بازرگانیەکانی لەگەڵ ئەمریـــکا پەرەپێبدات. پەیوەندییـــە بازرگانییەکان دەتوانێت رێگا بۆ باشـــتربوونی پەیوەندییە سیاسیەکانیش خۆش بکات. عێراق گەورەترین بازاری کشتوکاڵی ئێمە بووە لە جیهانی عەرەبدا و زیاتر لە یەک بیلیۆن دۆلار کریدیتی تەنها لە ساڵی ١٩٨٨دا لە COMODOTIES CREDIT CORPORATION(CCC) وەرگرتـــووە و چاوەڕوان دەکرێت کاڵای ئەمریکایی هەناردەی عێراق بکرێت»[٥٣].

هاوکات ناکۆکیەکانی نووســـینگەی مافی مرۆڤی وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ نووســـینگەی کاروباری وڵاتانی رۆژهەڵاتی نزیک و نووسینگەی

کاروباری ئابووری و بازرگانی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە سەر پەیوەندییــە بازرگانیەکانی عێراق و ئەمریکا پەرەیســەند. دەوڵەتی عێراق داوای لە ئەمریکا کردبوو کریدیتەکانی EXIM BANK ی ئەمریکا بە عێراق زیاد بکات، بەڵام ئۆفیسی مافی مرۆڤ بە تەواوی دژی ئەوە بوو.

نووسینگەی مافی مرۆڤ دەیگوت بەهۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق بە شــێوەیەکی دڕندانە لەگەڵ بەشــێک لە دانیشتوانی کوردی عێراق هەڵسوکەوتی کردووە و شــاڵاوێکی بەرفراوانی سەربازی ئەنجامداوە کــە تێیدا چەکی کیمیایی دژی بەشــێک لە هاوڵاتییانی کوردی خۆی بەکارهێنــاوە، وەزارەتــی دەرەوە دەبێ دژی پێشــنیاری زیادکردنی ئاســانکاری کریدیت لەلایەن EXIM BANK بە عێراق رابوەســتێت. نووسینگەی مافی مرۆڤ هەروەها ئاماژەی بەوە دەکرد ئەگەر خەڵکی ئەمریکا بە گشــتی ئاگاداری پێشێلکرانی مافی مرۆڤ لە عێراق بن ( بەو شێوەیە کە ئاگاداری پێشــێلکرانی مافی مرۆڤ لەو ولاتانەن کە میدیاکان زیاتر دەســتیان پێڕادەگات) زۆر لە یارمەتیدانی ئەمریکا بە عێراق توڕە دەبن و جەختی لە ســەر ئەوە دەکردەوە کە یارمەتیدانی ئەمریکا بە عێراق لەگەڵ سیاسەتی نێونەتەوەیی ئەمریکا سەبارەت بە مافی مرۆڤ ناگونجێت.

بەڵام نووسینگەی کاروباری وڵاتانی رۆژهەڵاتی نزیک و نووسینگەی کاروباری ئابووری و بازرگانی وەزارەتی دەرەوە هۆشــداریان دەدا کە کۆتاییپێهێنانی ئاســانکاری کریدیتی کورتخایەنی ئەمریکا بە عێراق لەوانەیە کۆمەڵێک ئەنجام و ئاکامی خراپی بۆ بەرنامە ئابورییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە عێراق، لەوانە چالاکیەکانی CCC بەدواوە بێت.

عەلی حەســەن ئەلمەجید لە کۆبوونەوەی نووسینگەی باکوور لە ٢١ی کانوونی دووەمــی ١٩٨٩ بۆ پێداچونەوەی پەلامارەکانی ١٩٨٧

و ١٩٨٨ دەڵێت:

«باشـــە دەكرا من ئەمانە هەروا بە سلامەت بهێڵمەوە. پەیامێكم لە پیاوە مەزنەكە، لە باوكەوە (واتا ســـەدام حوســـەین) پێگەیشت. چـــاوم لەمانە بێت؟ نەخەیر بە بۆلدۆزێـــر دەیانكەم بە ژێر خاكەوە. ئـــەی من ئەم خەڵكە لە ئەژمارنەهاتووە لە كوێ دابنێم. بۆیە كەوتمە دابەشكردیان بە ســـەر پارێزگاكاندا. ئەو كاتەش دەبوو بۆلدۆزەرەكان بەملاولادا بڵاوە پێبكەم.» (٥٤)

لـــە كانوونـــی دووەمـــی ١٩٨٩ دەوڵەتـــی ئەمریكا و فەرانســـا كۆنفرانسی پاریسیان بۆ قەدەخەكردنی چەكی كیمیایی وەگەڕخست. لەو كۆنفرانســـەدا ١٤٩ حكومەت جەختیان لەســـەر پابەندبوونیان بە پرۆتۆكۆلـــی ژنێڤ كـــردەوە و رەزامەندیان نیشـــاندا بۆ بەهێزكردنی دەوری نەتەوە یەكگرتووەكان لە بواری پێشـــێلكردنی پرۆتۆكۆلەكەدا. بەڵام هیچ ئامارەیەک بە كیمیابارانی كورد و پێشـــێلكاریەكانی عێراق نەكرا، كە ئەمەش بەڵگەیەكی بەهێزە لە سەر بەردەوامبوونی داشكانی وڵاتانـــی رۆژئاوا بە لای عێراقدا. لێژنەیەكی كورد لە كۆنفرانســـەكەدا بەشـــداری كرد و تەنانەت چەند كەس لە قوربانیە كوردەكانیان بردە نێو كۆنفرانســـەكە، بەڵام كەس گوێی لێنەگرتن و بڕیارنامەی كۆتایی كۆنفرانســـەكە هیچ ئامارەیەكی بە رژێمی عێراق، تەنانەت كارەساتی هەڵەبجـــە نەكرد و تەنها باســـی لیبیا كرا كـــە گوایا ئەمباری چەكی كیمیایی هەیە.

ئەوە دوایین رووداوی پەیوەندیدار بە ئەنفالی كورد لە سیاســـەتی وەزارەتـــی دەرەوەی ئەمریكا لە ســـەردەمی ئیـــدارەی رەیگان بوو. بەو شـــێوەیە مەســـەلەكە لەلایـــەن وەزارەتـــی دەرەوەی ئەمریكاوە كۆتاییپێهـــات و رەوتی رووداوەكانی دواتر مەســـەلەكەی بە تەواوی خستە پەراوێزەوە.

عەلی حەســـەن مەجید قۆناخەكانی ئەنفالـــی یەک لە دوای یەک

جێبەجێکــرد و لە کۆتاییدا کاروباری باکوری ڕادەســتی کەســێکی دیکە کرد. عەلی حەسەن ئەلمەجید لە کۆبوونەوەی دەستبەکاربوونی بەرپرسی نوێی نووسینگەی باکووری حیزبی بەعس لە نیسانی ١٩٨٩ دەڵێت:

«لــە یەکەم کۆبوونەوەم لە نیســانی ١٩٨٧ لەگــەڵ فەرماندەی فەیلەقەکانــی ســوپا، بەڕێوەبەرانی ئەمن و پۆلیــس، پارێزگارەکان و لێپرســـراوانی حیزبی بەعس بڕیارماندا تــەواوی خەڵکی گوندەکان رابگوێزیــن بۆ بنبڕکردنــی تێکدەران (مخربیــن). کارەکەمان لە دوو قۆناخدا جێبەجێ کرد: قۆناخی یەکەم لە ٢١ی نیسان دەستپێکرد و تا ٢١ی گوڵانی خایاند. قۆناخی دووەم لە ٢١ی گوڵان دەستپێکرد و تا ٢١ی حوزەیرانی خایاند. لە ٢٢ی حوزەیران بەدواوە هەر کەسێک لەو ناوچەیە بگیرایا دەســتبەجێ دەکوژرا بە پێی ئەو ڕێوشــوێنانە کە تا ئێســتاش کاریان پێدەکرێت. لە کۆبونەوەیەکدا لەگەڵ سەرۆک ئەرکانەکانی ســوپا یەکێک لە باشــترین فەرماندەکانم داوای لێکردم مانگێــک پەلامارەکان وەدوا بخەم. وتم نەخەیر تەنانەت یەک ڕۆژیش دوای ناخەم و لە ئێســتاوە دروشــمی ئێمە دەبــێ ڕاماڵینی چالاکی تێکدەران بێت. ئەمە ئامانجی ئێمەیە، ئامانجی ئەم قۆناخەیە. کاتێک لێبۆوردنە گشــتییەکەی ئەیلولی ١٩٨٨ ڕاگەیەندرا خەریکبوو عەقڵم تێکدەچوو. دەموت لەوانەیە کەسی باش لە ناو ئەم خەڵکەدا (کوردەکان) هەڵبکەوێت، بەڵام قەد کەســم نەبینی. ئەگەر لە بارەی کاربەدەستە پایەبەرزە کوردەکان پرسیارم لێبکەن کامیان باش و دڵسۆزن، دەڵێم تەنها پارێزگاری هەولێر و ســلێمانی باشــن، جگە لەم دووانە کەسی باش و دڵســۆزیان تێدانییە. کاتێ من هاتــم بۆ کەرکووک، عەرەب و تورکمان ٥١٪ی ســەرجەم دانیشتوانی کەرکووک زیاتر نەبوون، ٦٠ ملیۆن دولارم خەرج کرد تا گەیشــتینە ئەم ئاســتەی ئێستا. پاشان تەعلیماتمان دەرکرد و نەمهێشــت کورد لە کەرکووک، لەم نزیکانە و

گوندەکانی دەوروبەری کار بکەن. گریانم دێت کاتێک شـــانۆگەرییەک یـــان فیلمێکی خەمگین دەبینم. رۆژێکیان دەســـتم کرد بە گریان کە بینیم لە فیلمەکەدا ژنێـــک ون ببوو و لە بنەماڵەکەی دابڕابوو. بەڵام حەز دەکـــەم پێتان بڵێم ئەوەی کە کردم، کردم و رۆیشـــت دەبوایا بمکردایا. بە پشـــتیوانی خوا توانیمان تاقمی تێکدەران و هاوکارانی دوژمن لە باکووری خۆشەویســـتمان لەناوبەرین. ئێســـتا بارودۆخ لە ناوچەی باکوور پێویســـت بە هەندێ ئیجرائات دەکات کە لەگەڵ ئەم قۆناخە نوێیەدا بگونجێت.»[٥٥]

جۆرج بوشـــی باوک پاش بەدەسەڵاتگەیشـــتن لە کانونی دووەمی ١٩٨٩ تیمێکـــی بـــۆ پێداچونەوە بـــە سیاســـەتی دەرەوەی ئەمریکا ســـەبارەت بە عێـــراق پێکهێنا کە هاوکات بوو لەگـــەڵ کۆتایی کاری عەلی حەسەن ئەلمەجید وەک بەرپرسی نووسینگەی کاروباری باکوور. تێمـــی لێکۆڵینەوەکەی جۆرج بوش بەو ئەنجامە گەیشـــت کە عێراق هاوپەیمانێکـــی زۆر کاریگەری ئەمریکایـــە و پارمەتیدەرە بۆ راگرتنی زیادەخوازییەکانی ئێران و بەرەوپێشـــبردنی رەوتی ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئیدارەی بۆش پەرەیدا بە پەیوەندییە بازرگانیەکانی لەگەڵ عێراق و یەک بلیۆن دۆلار یەکەی کشـــتوکاڵی بەخشـــی بە عێراق و بەمشـــێوەیە عێراق بوو بە یەکێ لە سەرەکیترین کڕیارانی بەرهەمی کشتوکاڵی ئەمریکا.

هاوکات بارودۆخی مافی مرۆڤ لە سەراســـەری عێراق و بەتایبەت کوردســـتان لەوپەڕی خراپیدا بوو و ١٢ دەوڵەت لە کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان پشـــتگیری بڕیارێکـــی توندیان کرد بۆ دیارکردنـــی لیژنەیەکی تایبەت بۆ لیکۆڵینـــەوە دەربارەی بارودۆخی مافـــی مرۆڤ لە عێراق بـــەڵام ئەمریکا رازی نەبـــوو لەگەڵ لیژنەکە ســـەردانی عێراق بکات. ئەوە لە کاتێکدا بوو کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە راپۆرتەی ساڵانەی خۆیدا دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ

لە ساڵی ١٩٨٩ ئەوەی پشتڕاست کردبووەوە کە بارودۆخی مافی مرۆڤ لە سەراسەری عێراق لەوپەڕی خراپیدایە.

لە ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٠ جۆرج بوش ڕێوشوێنی ئاسایشی نەتەوەیـــی واژۆ کـــرد کە لە دەرەنجامەکەیدا جەخت لە ســـەر ئەوە کرابووەوە کە:

«پەیوەندی ئاســـایی ئەمریکا و عێـــراق خزمەت بە بەرژەوەندیە درێژخایەنەکانی ئەمریکا دەکات و ئارامی و ســـەقامگیری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســـت و کەنـــداو بەرەوپێش دەبات. کەوابـــوو ئیدارەی بوش هەوڵ دەدات بۆ دۆزینەوەی دەرفەت و ئاسانکاری دەکات بۆ کۆمپانیا ئەمریکیـــەکان بۆ ئەوەی لـــە ڕەوتی بنیاتنانەوەی عێراقدا بەشـــدار بن» (٥٦).

هاوکات هەوڵەکانی کۆمەڵێک لە ئەندامانی کۆنگرێس بەردەوام بوو بۆ ســـزادانی عێراق. کۆنگرێس هـــاوکاری بانکی بۆ هەناردەکردن و هاوردەکردنی کاڵاو شتەمەک بۆ عێراق قەدەخە کرد، بەڵام هەڵاوێرێکی دانابوو بۆ ئەوەی ئەگەر ڕێوشوێنەکانی ئاسایشی نەتەوەیی وایخواست، سزاکان جێبەجێ نەکرێت. دوو مانگ دواتر جۆرج بوش ئەو هەڵاوێرەی بەکارهێنـــا و لە ١٧ی کانوونی دووەمـــی ١٩٩٠ بڕیارێکی دەرکرد بۆ بەخشـــینی نزیکەی ٢٠٠ ملیۆن دولار کریدیتی بانکی بۆ هاوردەکردن و هەناردەکردنی کاڵا بۆ عێراق.

ئەمریکا لە ساڵی ١٩٨٨ تا ١٩٩١ ڕۆژانە ٥٠٠ هەزار بەرمیل نەوتی لە عێراق دەکڕی و کۆمپانیا ئەمریکیەکان ڕێژەیەکی بەرچاو چوکوچۆڵیان بە عێراق دەفرۆشت (٥٧) و ئەو ڕەوتە ڕۆژبەڕۆژ خێراتر دەبوو و لە ئەنجامدا کێشـــەی کورد (تەنانەت لە ڕوانگەی مافی مرۆڤیشەوە) بە تەواوی لە لایەن ئەمریکاوە پشتگوێ خرا. تەنانەت پێش لە داگیرکردنی کوەیت لـــە ٢ی ئابی ١٩٩٠ دەوڵەتی ئەمریکا بڕیاری ئەوەی پەســـەند کرد بایی ٨/٤ بیلیون دولار بەرهەمی تەکنۆلۆژیای پێشـــکەوتوو بدات بە

عێراق، بەڵام داگیرکرانی کوەیت لەلایەن سـەدام حوسەین هەرەسی بەو هەموو هەوڵ و یارمەتیە سـەربازی و سیاسیانە هێنا کە ئەمریکا بۆ پتەوکردنی پێگەی عێراق و سەقامگیرکردنی ئەو وڵاتە دەیدا.

جۆرج شـوڵتز، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە بارەی سیاسـەتی وەزارەتـی دەرەوەی ئەمریـکا لەبەرامبەر عێراق لـە کاتی ئەنفالدا دەڵێت:

«مـاوەی ١٢ تا ١٨ مانگ لە ناوەڕاسـتی هەشـتاکانەوە من و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا پاکانەمان بۆ رژێمی سـەدام دەکرد. ئەو پاکانەیە لە بـەر ئەوە نەبوو کە عێراق دەیەوێت چاک بێت و ریفۆرم بکات، چونکە عێراق قەت ئەو بەڵگەیەی نەدابوو بەدەستەوە، بەڵکوو لە بەر ئەوە بوو کە عێراق دەورێکی سـودمەندی دەبینی لە راگرتنی هاوسـەنگی هێز لـە کەنداو. تۆزێ پیش لـە داگیرکردنی کوەیت لە ١٩٩٠ سەدام بە باڵوێزی ئەمریکای وتبوو کە عێراق بەرژەوەندیەکانی ئەمریکای لە کەنداو پاراستوە و نەیهێشتوە فارسە شیعەمەزهەبەکان، عەرەبسـتانی سـعودی و وڵاتانی کەنداو راماڵن و لە ئەنجامدا عێراق قوربانیەکی بێ ئامانی دا. ئەوە ئێمە بوین کە لە سەردەمی جەنگی ئێراندا دۆسـتەکانی ئێوەمان پاراسـت، دڵنیـات دەکەمەوە ئەگەر ئێرانیـەکان ناوچەکەیان راماڵیبایا هێزەکانـی ئەمریکا نەیاندەتوانی رایانبوەستێنن مەگەر چەکی ئەتومیان بەکارهێنابا».[٥٨]

# هەڵەبجە و ئەنفال لە کۆنگریسی ئەمریکا

یەکەم جار کە مەسەلەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی کورد لە کۆنگریسی ئەمریکا خرایەڕوو ساڵی ١٩٧٣ بوو. لە ٦ی تشرینی دووەمی ١٩٧٣ لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا، کۆنگریسمەن هابز ئامازەی بەوە کرد کە «دەوڵەتی بەغداد گازی کیمیایی لە یەکێتی سۆڤیەت کڕیوە و خۆی ئامادە دەکات کوردەکانی پێقەڵاچۆ بکات. کڕینی گازی ژەهراوی لە سۆڤیەت نیشان دەدات کە بەغداد هەوڵ دەدات دوایین ڕێگاچارەی کێشەی کورد جێبەجێ بکات بە هەمان شێوە کە هیتلێر جوولەکەکانی قەڵاچۆ کرد».

دوای دەستپێکردنی شەڕی ئێران و عێراق، بۆ یەکەم جار سناتۆر پرۆکزمایێر لە ٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ لە ئەنجومەنی پیران ئامازەی بە بارودۆخی دژواری کورد کرد و وتی کوردەکان لەو شەڕەدا گیریان خواردووە. پرۆکزمایێر ئامازەی بە سەرکوتی سیستماتیکی کورد بەدەستی ڕژێمی عێراق کرد و وتی گوندە کوردنشینەکان کاول کراون، بنەماڵە کوردەکان لە یەک جیاکراونەتەوە، کوردە وڵاتپارێزەکان و پێشمەرگەکان بەندکراون یا لەسێدارەدراون، ئاوارە کوردەکان بە زۆر نیشتەجێ کراون و لە بارودۆخی مان و نەماندان. سناتۆر پرۆکزمایێر جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە روونە ئەم کردەوانە بۆ لەناوبردنی کورد وەک گرووپێکی کولتووری داڕێژراوە و ئەم کردەوانە بێ گومان لە ئاستی ژینۆسایددان.

مەسەلەی کورد ئێدی لە کۆنگریسی ئەمریکا باس نەکرا هەتا کیمیابارانی هەڵەبجە. هەشت ڕۆژ دوای کیمیابارانی هەڵەبجە، ئەو مەسەلەیە لە کۆنگریس خرایەڕوو و ژمارەیەک لە ئەندامانی کۆنگریس بە توندی کاردانەوەیان نیشاندا و شەرمەزاریان کرد. ئەندامانی کۆنگریس بەپێچەوانەی وەزارەتی دەرەوە، عێراقیان بە بەرپرسیاری کیمیابارانەکە لەقەڵەمدا، بەڵام هیچ بڕیارنامەیەکیان دەرنەکرد و داوایان لە دەوڵەتی

ئەمریــکا نەکرد بە پەیوەندییە سیاســی و بازرگانیەکانی لەگەڵ عێراقدا بچێتەوە.

لە ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٨٨ لە ئەنجومی پیران، ســناتۆر میشــێل بڕیارنامــەی ٤٠٨ی خســتەڕوو بۆ ئەوەی بەکارهێنانــی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراق شەرمەزار بکرێت و داوا لە سەرۆک کۆمار بکرێت درێژە بە هەوڵەکانی ئەمریکا بدات بۆ ئەوەی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی چەک لە ئاستی نێونەتەوەییدا قەدەغە بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا بڕیارنامەکە زیاتر پەیوەندی بــە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە شــەڕی ئێران و عێراقدا هەبوو نە کیمیابارانی هەڵەبجە و ئەنفال.

دوای کۆتاییپێهاتنــی شــەڕی ئێــران و عێــراق و بەتایبــەت دوای جێبەجێبوونی قۆناغی کۆتایی ئەنفال کە لە ئەنجامیدا ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشــینەکان گیانیان لەدەستدا و نزیکەی ٦٠ هەزار کەس لە خەڵکی ناوچــەی بادینان ئــاوارەی تورکیە بوون، مەســەلەی ئەنفالی کورد لە کۆنگرێــس خرایەڕوو و هــەر دوو لایەنی ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەران بە ماوەی دوو هەفتە مەسەلەکەیان تاوتوێ کرد.

یەکەمین هەوڵ بۆ خستنەڕووی کیمیابارانی کورد لە میانەی شاڵاوی ئەنفــال لە ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨ لەلایەن ســناتۆر پێــڵ لە ئەنجومەنی پیران ئەنجامدرا. ســناتۆر پێڵ گەڵاڵە یاسایەکی ڕادەستی ئەنجوومەن کرد بۆ ئەوەی ســەرجەم یارمەتییە ئابوورییەکانــی ئەمریکا بە عێراق بپچڕێــت و ئەمریکا دژی ئەو قەرزانە دەنگ بدات کە دامەزراوە ئابوورییە نێونەتەوەییــەکان دەیدەن بــە عێراق و ناردنــەدەرەوەی نەوتی عێراق قەدەغە بکرێت. گەڵاڵەیاســاکە هەرچەند بەپەلە لــە ئەنجومەنی پیران تێپەڕ بوو بەڵام سناتۆر پێل دەستبەجێ کەوتە ژێر گوشارەوە بۆ ئەوەی پاشەکشــەی لێبکات. ڕۆژێک دوای تێپەڕبوونی یاســاکە لە ئەنجومەنی پیران، سناتۆر پیتێر گالبرێس بە هاوڕێیەتی سناتۆر کریس ڤان هۆلین سەردانی تورکیان کرد بۆ ئەوەی چاویان بە ئاوارە کوردەکان بکەوێت.

پیتێــر گالبرێس یەکەمجــار ســاڵی ١٩٨٤ وەک ئەندامی کۆمیتەی

پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران ســـەردانی عێراقی کردبوو. گالبرێس ئەو کاتە لەگەڵ ئیدارەی رەیگان هاوڕا بوو کە نابێ ئێران شەڕەکە لە عێراق بباتەوە. ساڵی ١٩٨٧ گالبرێس بۆ جاری دووەم سەردانی عێراقی کرد. گالبرێس بە یاوەری هیود رانکین[٥٩]، کاربەدەستێکی باڵوێزخانەی ئەمریـــکا لە بەغداد گەشـــتێکی کورتی کرد بە ناو عێراقدا، ســـەردانی کوردســـتانی کردو تا شـــەقڵاوە چووەپێش و هەستی بە جیاوازییەکانی کوردســـتان لەگەڵ سەفەرەکەی سێ ســـاڵ لەوەو پێشی کرد. گالبرێس کۆمەڵێـــک دیمەنی بینی کە وایان لێکرد بڕوا بـــەو دەنگۆیانە بکات کە عێراق چەکی کیمیایی دژی کورد بەکارهێناوە.

گالبرێس هەرچەند کە لە سیاسەتی کاولکردنی گوندە کوردنشینەکان باش تێگەیشـــتبوو، بەڵام کاتێک کـــە راپۆرتەکەی لە ژێر ناوی «جەنگ لە کەنداوی فارس: ئەمریکا پاڵپشـــتی لە لایەنێک دەکات» بڵاو بووەوە جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە وێرای دڕندەیی دەوڵەتی عێراق، ئەمریکا ناتوانێـــت رێگە بەوە بدات عێراق لـــەو جەنگەدا بدۆڕێت. گالبرێس تەنها پیشـــنیاری ئەوەی کردبوو کە ئەمریکا لە رێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ کۆتاییپێهاتنی جەنگ هەوڵ بـــدات. گالبرێس داوای ئەوەی نەکردبوو رژێمی عێراق ســـزا بدرێت بۆ تاوانەکانی دژ بە کورد و لە راســـتیدا زۆر بە ئەســـتەم باسی کوردی کردبوو، کاتێکیش باسی کوردی کردبوو وەک کۆمەڵێـــک یاخیبوو باســـیانی کردبوو کە بوونەتـــە هاوپەیمانی ئێران و هۆکاری لاوازبوونی عێراق لە بەرامبەر ئێراندا[٦٠].

پاش کیمیابارانـــی هەڵەبجە، گالبرێس زیاتر بە شـــوێن هەواڵەکانی کوردستانی عێراقدا چوو، دڵنیابوو کە عێراق دەستی کردووە بە شاڵاوی قڕکردنـــی کورد. گالبرێس لـــە ٧ی ئەیلوولی ١٩٨٨ یەکەم هەوڵی خۆی لە ئەنجومەنی پیران دەســـتپێکرد بۆ نووسینی گەڵاڵە یاسای پێشگیری لە ژینۆســـاید. هەفتەیەک دوای کۆڕەوی لێشـــاوی ئاوارە کوردەکان بۆ تورکیە، گەڵاڵە یاســـاکە لە ئەنجومەنی پیران خرایەڕوو و دەنگی لەسەر درا. هاوکات رۆژنامەنووسەکان ( بەتایبەت جیم هۆگلەند لە واشینگتۆن

پۆست و  و ویلیان سەفاییر لە نیۆیۆرک تایمز) هاتنە یارمەتی گالبرێس. راپۆرتەکانی ئەم رۆژنامەنووسانە لە کۆنگریس دەخرایەروو. گالبرێس لەو ماوەیەدا پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ هۆگلاند و ســـەفاییر هەبوو چونکە دەیزانی سەروتاری ئەو رۆژنامانە بۆ ئەندامانی کۆنگرێس گرنگە.

گالبرێس و کریس ڤان هۆلێن  لە تورکیە بەڵگەی هیرشـــی کیمیایی عێراق بۆ سەر نزیکەی ٤١ گوندی کوردنشینیان کۆکردەوە بەڵام دۆزینەوەی ئاسەواری چەکی کیمیایی بەسەر لاشەی ئاوارەکان ئاسان نەبوو.

ئەو رۆژە کە گالبرێس لە تورکیە گەڕایەوە بەدتێگەیشتنێکی بەرفراوانی لە کۆنگریس بەدی کرد. یاسای ســـزادانی عێراق رووبەرووی ناڕەزایەتی توندی کۆشکی سپی و وەزارەتی دەرەوە ببووەوە. تەنانەت زۆربەی ئەو سناتۆرانە کە هەفتەیەک لەوەوەپێش پاڵپشتی یاساکەیان کردبوو  ئێستا بۆچوونـــی خۆیان گۆڕیبوو. ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران کە نیگەرانی جووتیارەکانـــی ویلایەتەکانی خۆیان بوون لـــەوە زەندەقیان چوبوو کە یاســـاکە لە ئەنجومەنی پیران تێپەڕیوە. ئەمریکا ســـاڵانە نزیکەی یەک ملیۆن تەن گەنم و  ٢٣٪ی بەرهەمی برنجی وڵاتەکەی دەنارد بۆ عێراق و سزادانی عێراق زەبری کوشندەی لە جۆتیارە ئەمریکیەکان دەدا. تەنانەت کۆمەڵێک کۆمپانیای کیمیایی داوایان کردبوو بزانن ئەگەر ئابڵۆقە خرایە سەر عێراق، چارەنووسی بەرهەمەکانیان بە چی دەبێت.

گالبرێس ناوی راپۆرتەکەی نابوو «دوایین رێگاچارەی عێراق» بەڵام سەرپەرەشـــتیاری کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران هەوڵیدەدا لەو تەنگژەیـــە دوور بکەوێتەوە کە گالبرێس هەوڵی ورژاندنی دەدا و پێی لە ســـەر گۆڕینی ناوی راپۆرتەکە دادەگرت بۆ «دوا شالاوی عێراق»  ناوبراو پێیوابوو کە بە بەراورد لەگەڵ هۆلۆکاستدا[٦١] ئەو ناوە هەندێ لـــە ئەندامانی ئەنجومەنی نوینـــەران دەتۆرێنێت و ئەوانەش کە پشتگیری یاساکە دەکەن پێویستیان بە ئاماژەیەکی وەها ئاشکرا نییە.

دوای پەســـەندکرانی یاســـاکە لـــە ئەنجومەنی پیـــران و ناردنی بۆ ئەنجومەنـــی نوێنـــەران، گالبرێـــس پێیوابوو کە ئەنجومەنـــی نوێنەران

پێشـــوازی لێدەکات و پەســـەندی دەکات، پێیوانەبوو کـــە بەرژەوەندی بازرگانیش لەوێ ســـەرهەڵبداداتەوە. ســـەرۆکی «کۆمیتەی رێگاکان و کەرەســـتەکان»ی ئەنجومەنی نوێنەران لە ژێر شەپۆلی ناڕەزایەتیەکاندا یاســـاکەی رەوانەی ئەنجومەنی پیران کـــردەوە بە بیانووی ئەوەی وەک یاسایەکی ئابووری نادەستوریانە دارێژراوە. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک لە ئەندامانی ئەنجومەن دەقێکی تایبەتیان دارشت کە لایەنگرەکانی ناویاننا «گەلاڵە یاسای کاردانەوەی هاوســـەنگ» بۆ پێشگیری لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی. گەلاڵەکە ئەرکی سەلماندنی ژینۆسایدی کوردی لە کۆڵ کۆشـــکی ســـپی کردەوە و هەموو ئامارژەیەکی بە ژینۆساید لابرد. پاش کۆمەڵێک دەســـتکاری یەک لە دوای یەک لە کۆمیتەکان، تەنها سزایەک کە لە نێو گەلاڵەکەدا مابووەوە قەدەخەکردنی یارمەتیەکانی ئەمریکا بوو بە عێراق بۆ کڕینی کەرەســـتەی پیشەسازی و ئەو کەرەستە کیمیاییانە کە دەکرێـــت بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی کەڵکیان لێوەربگیردرێت. تەنانەت کۆمەڵێک لە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران بەوەش رازی نەبوون چونکە دەیانگوت زیان بە پیشەســـازی ئەمریکا دەگەیەنێت. بەهەرحاڵ گەلاڵە یاســـاکە لە ٢٧ی ئەیلوولی ١٩٨٨ بە زۆرینەی دەنگی ئەندامانی سەر بە هەر دوو حیزبی دیموکرات و کۆماریخواز لە ئەنجومەنی نوێنەران پەسەند کرا، هەرچەند کە یاساکە بە هۆی دژایەتیکردنی توندی وەزارەتی دەرەوە قەد جێبەجێ نەکرا.

ماوەی ١٨ مانگ بوو سەدام سەرقاڵی کاولکردنی گوندە کوردنشینەکان بوو و شـــەپۆڵ شەپۆل زانیاری لە بارەی شاڵاوەکە دەگەیشتە وەزارەتی دەرەوە، بەڵام کاربەدەستانی ئیدارەی ریگان تەنها ئەو کاتە وەدەنگ دەهاتن کە دەکەوتنە ژێر گوشاری رەخنەی رۆژنامەنوسەکان یان لەگەڵ هەڕەشەی کۆنگرێس رووبەڕوو دەبونەوە. سناتۆر پێل و گالبرێس درێژەیان بـــە هەوڵەکانیاندا بۆ ســـزادانی عێراق، چونکە پێیانوابوو وەســـتاندنی ژینۆســـاید لە بەرژەوەندیە ئابووری و سیاسیەکان گرنگترە بەڵام هاوکات لەگەڵ کەمبونەوەی شـــاڵاوەکانی ئەنفال لە پاییزی ١٩٨٨ هەوڵەکانیان

بە تەواوی شکستی خوارد.

لە مانگی نیســـانی ١٩٩٠ وەفدێکی کۆنگرێس ســـەردانی عێراقی کرد و چاوی بە ســـەدام کەوت و دڵنیای کردەوە کە ســـەرۆک بوش هەموو یاســـایەک ڤیتۆ دەکات کە کۆنگرێس بۆ ئابلۆقەدانی عێراق پەســـەندی بـــکات. وەفدەکەی کۆنگرێس زۆر بە شـــانوباڵی ســـەدامدا هەڵیدا وەک ســـەرکردەیەک کە دەتوانێت وڵاتەکەی خۆشـــبەخت بـــکات و ئەمریکا دەتوانێت کاری لەگەڵ بکات[٦٢].

لـــە ئەنجامی پشـــتیوانی ئابـــووری ئەمریکا لە عێراق لـــە رێکخراوە بازرگانیە جیهانیەکان، ســـەدام حوســـەین توانی سوپاکەی پاش شەڕی ئێران و عێراق نۆژەن بکاتەوە و بۆ داگیرکردنی کوەیت ئامادەی بکات. ســـەدام حوسەین لە ٢ی ئابی ١٩٩٠ کوەیتی داگیر کرد و عەلی حەسەن ئەلمەجیدی وەک سوپاسالاری کوەیت دەستنیشان کرد. چەند رۆژ پاش داگیرکرانی کوەیت، گەلاڵە یاســـای ســـزادانی عێراق بۆ قەدەخەکردنی هەناردەکردن و هاواردەکردنی کالاّ بۆ عێراق بە کۆی دەنگ لە ئەنجومەنی نوێنەران پەســـەند کرا. ســـەرۆکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنـــی نوێنەران داوای ئابلۆقەی رەهای عێراقی کرد و جۆرج بوش بە گەرمی پێشوازی لێکرد.

ئیدی پاش ئـــەوە دەوڵەتی ئەمریکا باســـی کیمیابارانی هەڵەبجەی نەکرد تا ساڵی ١٩٩٨ بۆ یەکەمجار لە ١٦ی ئاداری ١٩٩٨ واتا ١٠ ساڵ دوای کیمیابارانی هەڵەبجە بوو کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بە فەرمی رایگەیانـــد دەوڵەتی عێراق بووە کە هەڵەبجەی کیمیاباران کردووە. پاش ئاشـــکرابوونی بڕیاری جۆرج بوش بۆ روخاندنی رژێمی سەدام، دەوڵەتی ئەمریکا کیمیابارانی هەڵەبجەی وەک پاســـاوێک بۆ شەڕی ئازادی عێراق بەکارهێنـــا. لە ١٥ ئاداری ٢٠٠٣ چەند رۆژ پێش لە هێرشـــی ئەمریکا بۆ ســـەر عێراق جۆرج بوش لـــە وتارێکی رادیۆییدا ئاماژەی بە ســـاڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجە کرد و وتی عێراق چەکی کۆمەڵکوژی هەیە و پێشتر هاووڵاتیانـــی خۆی کیمیاباران کردووە. پاش ئازادی عێراق، کالین پاوڵ،

وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە ئەیلوولی ٢٠٠٣ سەردانی هەڵەبجەی کرد و وتی بەداخـــەوە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی کیمیابارانی هەڵەبجەی لە کاتی خۆیدا پشتگوێ خستووە.

کۆنگرێسمەن دیلانهوت لە دانیشتنێکی ئەنجومەنی نوێنەران لە ١٦ی ئەیلوولی ٢٠٠٣ لەو پەیوەندییەدا دەڵێت:

«وەزیـــری دەرەوەی ئەمریـــکا، کالیـــن پاوڵ ئەم حەفتـــەی دواییە ســـەردانی هەڵەبجـــەی کرد کە تێیـــدا ٥ هەزار کوردی عێـــراق بەهۆی کیمیابارانی سەدام حوسەین گیانیان لەدەستدا. وەزیری دەرەوە جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە کیمیابارانی هەڵەبجە بەڵگە و نیشانەی ئەوەیە کە دەوڵەتی ســـەدام حوســـەین چەکی کۆمەڵکوژی بـــووە و ئەمەش راستبوونی بڕیارەکەی ئەمریکا بۆ راگەیاندنی شەڕ دژی عێراق دردەخات. کیمیابارانی هەڵەبجە لە ١٩٨٨ روویدا و هەروا بەسەرچوو. دەبوایا کاتی خۆی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی وەڵامـــی ئەوەی دابایەوە و دادگایەکی بۆ لێپرسینەوە لە تاوانەکانی سەدام پێکهێنابایا و بڕیاری دەستبەسەرکردنی ســـەدامی دەرکردابایا و پاشـــان دادگایی بکردایا. لە ١٩٨٨ ئەو تاوانە قێزەون و دزێوە دژی کوردەکانی عێراق لە شـــاری هەڵەبجە ئەنجامدرا. ئێســـتا پاش ١٥ ســـاڵ جەنابی وەزیری دەرەوە دەڵێت کە کیمیابارانی هەڵەبجە بەڵگەیە بۆ دروســـتبوونی بڕیاری دەســـتێوەردانی ئەمریکا لە عێراق. بەڵام چیرۆکەکە لێرە کۆتایی پێنایەت. ئێمە دەمانزانی کە عێراق چەکـــی کیمیایـــی بەکاردێنێت. لە ١٩٩٠ ئەوەمـــان دەزانی بەڵام چیمان کرد؟»

هەروەها کۆنگرێسمەن هینچی لە دانیشتنێکی ئەنجومەنی نوێنەران لە ١٧ی ئادار و ١٣ی تەموزی ٢٠٠٤ دەڵێت:

«سەدام حوسەین کوردەکانی هاووڵاتی خۆی لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ کیمیاباران کرد. بەڵێ بە شـــێوەیەکی شـــەیتانی کیمیابارانی کردن و ٥ هەزار کەس یان زیاتـــر کوژران. ئەو کاتە وەڵامی دەوڵەتی ئەمریکا چی بوو؟ ئەوە بوو کە زیاتر پشـــتیوانی لە عێراق کـــرد، زانیاری هەواڵگری

لەگــەڵ عێراق ئاڵوگۆڕ کرد، کریدیتی کومپانیاکانی بەخشـــی بە عێراق، چــەک و تەقەمەنـــی و چەکی کیمیایی زیاتری دا بـــە عێراق. ئەوە بوو وەڵامـــی ئەمریکا بـــە کیمیابارانی کـــوردەکان. کیمیابارانـــی هەڵەبجە کردەوەیەکـــی دڕندانە بوو کە گەلێک کەس، لەوانە وەزیرەکانی کابینەی ســـەرۆک کۆماری ئەمریکا وەک پاســـاوێک بەکاریانهێنا بۆ داگیرکردنی عێراق. بەڵام ئەگەر کیمیابارانکردنی کوردەکان هۆکاری شەڕی عێراق لە ۲۰۰۳ بوو، بۆ ئیدارەی رەیگان و بوشی باوک پاش کیمیابارانی هەڵەبجە یارمەتیەکانیان بە رژێمی سەدام زیاتر کرد و هاوکاریان کرد و پەیوەندیە بازرگانـــی و هەواڵگرییەکانیان لەگەڵ عێراق پەرەپێدا؟. گەلێک لەوانەی کە ئێســـتا بە چاوی پیرۆزەوە سەیری هێرشـــی ئەمریکا بۆ سەر عێراق دەکەن هەر هەمان ئەو کەســـانەن کە کاتـــی کیمیابارانی کوردەکان لە دەوڵەتی ئەمریکادا خاوەن پۆست بوون. ئەم بەرێزانە کە پۆستی باڵایان هەبوو و دەسەڵاتێکی زۆریشـــیان هەبوو بۆ وەدەنگ نەهاتن ئەوکاتە کە ئەم کیمیابارانە دڵتەزێنە روویدا؟

هەروەها کۆنگرێســـمەن دیلانهوت لە هەمان دانیشـــتنی ئەنجومەنی نوێنەراندا دەڵێت:

«بڕیارنامەکەی بەردەستمان دەیەوێت بڵێت کە کۆمەڵکوژی هەڵەبجە تاوان دژی مرۆڤایەتییە (کە هەرواشـــە) و پاساوە بۆ داگیرکردنی عێراق پاش ۱۵ ســـاڵ لە کیمیابارانی هەڵەبجە. راستیەکی دڵتەزێن هەیە کە بۆ ئێمە جێگای شـــەرمەزارییە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە لە ۱۹۸۸، ۱۹۸۹ و ۱۹۹۰ هیچمان لە پەیوەندی لەگەڵ تاوانی هەڵەبجەدا نەکرد.

کارەســـاتی هەڵەبجـــە لە ئاداری ۱۹۸۸ روویـــدا و ئێمە کاتی خۆی هیچمان نەکرد چونکە سەدام هاوپەیمانمان بوو. زۆرێک لەو کەسانەی کە ئێستا لە ئیدارەی بوشـــدا کار دەکەن، ئەو کاتە ئەندازیاری هاوپەیمانی ئەمریکا و ســـەدام بوون. لە کاتی ســـەرۆک کۆماری رەیگان و بوشـــدا، ئەمریـــکا عێراقی لە ناو لیســـتی وڵاتانی پشـــتیوانی تیروریزم دەرهێنا، پەیوەندیە دیپلۆماتیکە هەمەلایەنەکانی لەگەڵ عێراق دەســـتپێکردەوە،

ملیاردها دۆلار قەرزی کریدیتی دا بە سەدام، تەکنۆلۆژی وایدا بە سەدام کــە دەیتوانی بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ بەکاریبهێنێت. کەوابوو جێگەی سەرســوڕمان نییە کە پاش جەنگی یەکەمی کەنداو، ئێمە بەو ئەنجامە گەیشــتین کە عێراق بەرنامەیەکی پێشــکەوتوی چەکی ناوکی هەیە، چونکە لەڕاســتیدا خۆمان یارمەتیمان دابوو ئەو چەکانە دروست بکات. ئێمە ئامرازەکەمان دا بە دەستی کاربەدەستانی عێراق بۆ ئەوەی چەکی کۆمەڵکوژ بەرهەمبهێنن، ڕێگەشــمان بەوە دا کە وڵاتانی دیکەش چەکوچۆڵی ئەمریکایی بفرۆشــن بە ســەدام. ئێمــە تەنانەت کۆمەڵێک زانیاری زۆر هەستیاری هەواڵگریشمان دا بە سوپای سەدام کە لە ڕێگای ســەتەلایت لە ئاســمانەوە وەدەستمان خستبوو. ســەرەڕای ئەوەی کە دەشــمانزانی سەدام چەکی کیمیایی دژی هێزەکانی ئێران بەکاردەهێنێت نەمانهێشت نەتەوە یەکگرتوەکان عێراق شەرمەزار بکات.

کۆنگرێسمەن کریس ڤان هۆڵێن لە دانیشتنێکی ئەنجومەنی نوێنەران لــە ١٤ی ئاداری ٢٠٠٨ لە بــارەی هەوڵەکانی خۆی و پیتیر گالبرێس بۆ ســزادانی عێراق بە هۆی ژینۆســایدی کــورد و دژایەتیەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەڵێت:

«لــە ١٩٨٨ لــە کۆتایی شــەڕی ئێران و عێراق مــن وەک ئەندامی کۆمیتەی پەیوەندییەکانــی دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لەگەڵ هاوکارم، پیتیر گالبرێس ســەردانی ســنووری عێراق و تورکیەمان کرد. ئــەو کاتە هەزاران کــورد لە عێراق هەڵاتبــوون و پەنایان بۆ تورکیە هێنابــوو. ئێمە لەگەڵ ســەدان کــەس لەو ئاوارانــە گفتوگۆمان کرد و بەڵگەمان لەسەر کیمیابارانکردنی خەڵکی کورد کۆ کردەوە. ڕاپۆرتەکەی ئێمــە بووە بنەمایەک بۆ ئەوەی ئەنجومەنی پیران گەڵاڵە یاســایەک بۆ ســەپاندنی ئابڵۆقەی ئابووری بەســەر عێراقدا پەســەند بکات بە هۆی ئەوەی چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکارهێنابوو. گەڵاڵە یاســاکە لە لایەن ئەنجومەنی پیرانەوە پەسەند کرا، بەڵام ئیدارەی ڕەیگان (کە گەڵێ لە کاربەدەســتە سەرەکییەکانی ئێســتا لە ئیدارەی بوشدا کار دەکەن)

دژی ئەو گەلالە یاســایە راوەستا و نەیهێشت گەماڕۆکانی گەلالە یاساکە دژی عێراق جێبەجێ بکرێت. باشــە چۆن ئێوە ئەو کاتە دژی سەپاندنی ئابلۆقەی ئابووری بەســەر عێراقدا بوون (بە هۆی ئەوەی چەکی کیمیایی دژی خەڵکی مەدەنی بەکارهێنابوو)، بەڵام ئەمڕۆ باتان داوەتەوە و دەڵێن بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی خەڵکی مەدەنی عێراق هۆکاری شەڕی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دژی عێراق لە ٢٠٠٣ بوو. جگە لەوەش ئەگــەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن ســەدام حوســەین دژی هاوڵاتیانی خۆی، هۆکاری ئەو شــەڕە بوو، ئێمە دەبوایا لە کاتی شەڕی کەنداوی فارس لە ١٩٩١ کۆتاییمان بە کاری ســەدام حوسەین هێنابایا، چونکــە عێراق لە دوای ١٩٨٨ چەکــی کیمیایی بەکارنەهێناوە، واتا لەو کاتــەوە کــە من و هاوکارم پیتیر گالبرێس لە کۆتایی شــەڕی ئێران و عێراق سەردانی سنووری تورکیە و عێراقمان کرد. بەڵام سێ ساڵ دوای ئەوە لە ١٩٩١ ئێمە نەتەنها ســەدامماان لەسەر دەسەڵات لانەبرد، بەڵکوو لە کۆتایی شــەڕدا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا خۆی بە شــتی دیکەوە خەریک کردبوو لە کاتێکدا کە ســەدام شــیعەکانی لە باشوور و کوردەکانی لە باکووری ســەرکوت دەکرد. ئەم بەسەرهاتە دووڕوویی ئەم هەوڵە نیشــان دەدات بۆ سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژوو بۆ ئەوەی هۆکارەکانی شەڕی عێراق لە ٢٠٠٣ چەواشە بکرێت»

## لە بارەی چۆنیەتی کۆکردنەوەو وەرگێڕانی ئەم بەڵگەنامانە

لەکۆتایی ســاڵی ٢٠١١ سەردانی ئارشــیڤخانەی نیشتمانی ئەمریکام لەواشــینگتۆن کردو کۆمەڵێک بەڵگەنامەی نهێنــی ئەمریکام لە بارەی کێشەی کورد، بەتایبەت کوردستانی عێراق دۆزییەوە. دەستبەجێ دەستم کرد بەوەرگێڕانی ئەو بەڵگەنامانەی کە لە بارەی شۆڕشی ئەیلوول (٦٣)و هەڵەبجە و ئەنفال بوون و بەم شێوەیە کە دەیبینن خستمە بەر دەستی خوێنەران.

وەرگێڕانــی بەڵگەنامە زۆر لە وەرگێڕانی دەقی ئاســایی زەحمەتترە چونکە زانیاریەکانی نێو بەڵگەنامە لە نێوان دوو کەسدا ئاڵوگۆڕ دەکرێت کە خۆیان باش ئاگاداری بابەتەکەن، بەڵام هەموو شــتەکان بە راشکاوی باس نەکەن. ئەزموونی پێشترم لەگەڵ وەرگێڕانی بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریــکا (٦٤) زۆر یارمەتیدام بــۆ ئەوەی لە کۆمەڵێک لــە زانیارییە باسنەکراوەکانی ئەم بەڵگەنامانە تێبگەم و بە زمانێکی سادە و کوردیانە بەڵگەنامەکان وەرگێڕم.

لە پەراوێــزی بەڵگەنامەکاندا ئاماژەم بە هەندێ زانیاری پەیوەندیدار بە ناوەڕۆکی بەڵگەنامەکان کردوە کە لەوانەیە بۆ تێگەیشــتنی زیاتر لە مەســەلەکە یارمەتی خوێنەر بدات. هەروەها هەوڵمداوە لە پەراوێزەکاندا کورتەیەک لە ناوەڕۆکی ئــەو بەڵگەنامانە بخەمەڕوو کە پەیوەندییان بە بابەتی بەڵگەنامە سەرەکییەکەوە هەیە. هەندێ بەڵگەنامەشم وەرنەگێڕان کە شتێکی نوێیان تێدا نەبووە و ناوەڕۆکەکەیان دووپاتکردنەوەی بابەتی بەڵگەنامەکانی دیکە بووە.

لە هەندێ لــە بەڵگەنامەکانــدا ناوی کەســایەتییەکان و کۆمەڵێک مەســەلەی زۆر نهێنی و تایبەت بەهۆی هەستیاربوونی بابەتەکە لەلایەن پســپۆڕانی ئارشیڤخانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە رەش کراوەتەوە

و ئەگـــەر وەرگێڕ لە شـــوێنێکدا ناوی کەســـایەتییەکان یـــا ناوەڕۆکی بابەتە رەشـــکراوەکەی زانیبێت لە پەراوێزدا ئامـــاژەی پێکردوە. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە هیچکام لە بەڵگەنامەکانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە دەربارەی چۆنیەتی کیمیابارانی هەڵەبجە لە پۆلێنبەندی دەرنەهێنراون کە وادیارە یەکێ لە هۆکارەکانی ئەوەیە کە باڵوێزخانەی ئەمریکا رژێمی سەدام حوسەینی بە تاوانباری کیمیابارانەکە لەقەڵەمنەداوە و تۆمەتی کیمیابارانەکەی خستوەتەپاڵ ئێران.

راســـتە ئەمە بەڵگەنامەیە، بەڵام مەرج نییە هەرچی وتبێت راست و دروســـت بێت. بەڵگەنامە هەڵەشی تێدایە و روانگە و حەزی شەخسی و بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشـــتمانی کاری لەسەر دەکات و بەتایبەت ئەو شتانەی کە لە زمانی کەسانی دیکەوە باس دەکرێن، لەوانەیە وەک خۆی وانەبن. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئەو شتانە کە لە بەڵگەنامەکاندا ئامازەیان پێدەکرێت راستن و خوێنەر دەتوانێت زۆربەی راستیە شاراوەکانیان تێدا ببینێت.

وریا رەحمانی
GMAIL.COM@ARBABA٢٨٠

## ١- هەڵەبجە و ئەنفال لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی CIA و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا

لـــە لێژنەی نوێنەرایەتی ویلایەتـــە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە نیۆیۆرک بۆ:

وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن، ٩٣١٤

نیسانی ١٩٨٧

بابەت: مانگرتنی نوێنەرە کوردەکان بۆ شەرمەزارکردنی کیمیابارانکردنی کوردەکانی عێراق

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە ئانکارا و بەغداد

١- وتەبێـــژی رۆژنامەوانی نەتەوە یەکگرتوەکان رۆژی ٢٧ی نیســـان رایگەیاند کە تۆزێک پێش لە نیوەڕۆی هەمان رۆژ گرۆپێکی ١٦ کەســـی لـــە ژووری Nations United Trusteeship Council مانیـــان گرتووە و بە ماوەی دوو کاتژمێر ئەو شوێنەیان بە جێنەهێشتووە. ئەو گروپە داوایان کردووە نەتەوە یەکگرتوەکان گوێ لە داواکاریەکانیان بگرێت.

٢- پاش ئەوەی هێزەکانی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان نامەیەکیان لە گروپەکە وەرگرتوە کە بۆ ســـکرتێری گشـــتی نەتـــەوە یەکگرتوەکان نووسراوە، خۆپیشاندەران بە شێوەیەکی ئارام ژورەکەیان بەجێهێشتوە. بە وتەی رۆژنامەنووسێک ئەوانە نوێنەری لقی ئەمریکای پارتی دیموکراتی کوردســـتان بوونە و نامەیەکیان نووســـیوە دژ بە هێرشی عێراق بۆ سەر کوردەکان لە پارێزگای هەولێر و ســـلێمانی لە ١٥ی نیسان و بانگەشەی ئەوەیـــان کـــردووە کە دەوڵەتی عێـــراق لەو هێرشـــەدا چەکی کیمیایی بەکارهێناوە.

لـــە نامەکـــەدا هەروەها بانگەشـــەی ئەوە کراوە کە لـــە ئەنجامی ئەو هێرشـــانەدا ١٠ کورد کوژراون و داوا لە ســـکرتێری گشـــتی نەتەوە یەکگرتوەکان کراوە لەو مەسەلەیە بکۆڵێتەوە.

ئوکون[٦٥]

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ:
## وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٣٩٤٨
## گوڵانی ١٩٨٧

بابـــەت: دەوڵەتـــی عێـــراق گازی کیمیایـــی دژی کـــوردەکان بەکاردەهێنێت

نهێنی

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانـــەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لـــە عەمان، ئانکارا، دەمیشـــق، لەندەن، پاریس، کوەیت، کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنە و لێژنەی نوێنەرایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە ژنێڤ
USCINCCENT MACDILL AFB FL

١- رەش کراوەتەوە

٢- کورتـــە: سیاســـەتی دەوڵەتی عێراق بۆ چۆڵکـــردن و کاولکردنی گوندە کوردنشـــینەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان بەرەوپێش دەچێت. لەو بەرنامەیەدا لە گازی موستارد و هەندێ لە گازە کوشندە تایبەتەکانی دیکە کەڵک وەردەگیردرێت. وادیارە رێبەرایەتی عێراق بەهۆی ســـەرنەکەوتنی هەوڵەکانـــی بۆ نزیکبوونەوە لەجەلال تاڵەبانی و بزووتنەوەی کوردەکانی ئێران، کەوتوەتە جموجۆڵ.

٣- (ناوەکـــەی رەش کراوەتەوە) راپۆرتیداوە کە هێزەکانی عێراق لە باکووری ئەو وڵاتە بەشـــێوەیەکی بەرفراوان لە ئامرازگەلی دڕندانە دژی کـــوردەکان کەڵک وەردەگرن. ناوبـــراو دەڵێت هێزەکانی عێراق نزیکەی ٣٠٠ گوندیـــان لە باکوور چۆڵ کردووە و هەنـــدێ لەو گوندانەیان کاول کردوە. شـــارۆچکەگەلی گەورە وەک کۆیە (٦٦) کە دەکەوێتە ٣٥ مایلی رۆژهەڵاتی هەولێر و گوندگەلی بچووک بوونەتە قوربانی ئەو سیاســـەتە. ئەو ســـەرچاوەیە جگە لە کۆیە نـــاوی ١٧ گوندی دیکەی برد کە بریتین لە: پردەسپی، شێخانی، عەمەلا، سەرتک، هاروس، میکاییلئاوا، کیسکا، کیتام، کاکی میرزا، تیلیۆم، محەمەد شەریف، محەمەد پردێ، سەرچنار، دارکیتیار، کانیبی، بوکات و حەراب (٦٧).

ئێمە تەنها توانیمان شـــوێنی ٦ لەو گوندانە ( بە وتنی ناوەکانیان بە شـــێوەی جۆراوجۆر) لە سەر نەخشە بدۆزینەوە کە بریتین لە: سەرتک، تیلیان، دارەئیختیار، کانیبی، بوگاد و هاراک (٦٨) کە هەمویان لە ناوچەی ٢٥-٣٥ مایلی باکور و باکوری رۆژهەلاتی کەرکووک هەڵکەوتوون.

بە گوێرەی زانیارییەکانی ئەو ســــەرچاوەیە زۆربەی ئەو گوندانە کە کاول و چۆڵ کراون لە ناوچەی نێوان کەرکوک و سلێمانی هەڵکەوتوون. ئێمە پێشتر کۆمەڵێک راپۆرتی دیکەمان لە بارەی کاولکردن و چۆڵکردنی گوندەکانی نێوان موســـڵ و زاخۆ و ناوچەکانی رواندز بە دەستگەیشتوە. (ناوەکـــەی رەش کراوەتـــەوە) راپۆرتی داوە کە تەنها لە ســـەر رێگای کەرکوک- هەولێر ١٠-١٢ گوندی خاپورکراوی بینیوە.

٤- راپۆرتی پزشکی قوربانیەکان لە نەخۆشخانەکان نیشان دەدات کە هێزەکانی عێراق لە رێگای هیلیکۆپتەرەوە گازی موســـتارد، گازی سارین و تابـــون (٦٩) یان دژی گوندنشـــینەکان بەکارهێناوە. (ناوەکەی رەش کراوەتـــەوە) کۆمەڵێک راپۆرتی لە بـــارەی بەکارهێنانی گاز لە ناوچەی سلێمانی بۆمان ناردوە و (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) سەربازەکانی عێراقی تەنانەت لە شـــەقامەکانی سلێمانیدا بینیوە کە جلوبەرگی دژەکیمیاییان پۆشیوە.

راپۆرتی (رەش کراوەتەوە) هەر دوویان نیشـــان دەدات کە کاولکردن و چۆڵکردنی گوندەکان تەنها بە گوندە کوردنشـــینەکان سنووردار نییە. گوندە ئاسورینشـــینەکانی کوردســـتانیش کاولکراون. دژمنایەتی نێوان کوردەکان و مەســـیحیەکان، رێگای بۆ ئەوە خۆشـــتر کردوە گوندنشینە مەســـیحیەکان پوانی (ئیمیتیازی) باشتر لە دەوڵەتی عێراق وەربگرن لە بەرامبەر چۆڵکردنی گوندەکانیاندا. ئەو کوردانە کە گوندەکانیان چۆلکراوە دەنێردرێن بۆ کۆمەڵێک ناوەندی نیشـــتەجێبوونی جۆراوجۆر، لە ناوچە دەشـــتەکانی پاڵ کوردستانەوە بگرە تا ناوچە دوورەکان وەک رومادیە و حیللە (٧٠)و تەنانەت روتبە (٧١) ( لە ســـەر سنووری ئوردون). وادیارە دەوڵەتی عێراق ئەو گوندنشینانە لە شارۆچکەکاندا نیشتەجێ دەکاتەوە، بەڵام مافـــی ئەوەیان ناداتێ چالاکی ئابـــووری ئەنجام بدەن. ١٣ هەزار

دینـــاری عێراقی (بە گوێرەی نرخی رەســـمی هەر دینارێک ٣ دولار و ٢٢ ســـنتە) دەدرێت بەو کوردانـــەی کە گوندەکانیان پێچـــۆڵ کراوە، بەڵام نرخـــی خانوویەکی ٣٠٠ مەتـــری دەوروبەری ٣٥ هـــەزار دینارە. رێژەی قەرەبووکردنەوەی گوندنشینەکان کەمتر لە هەزار دینارە.

بە گوێرەی راپۆرتی (ناوەکـــەی رەش کراوەتەوە) ژمارەیەکی زۆر لە لاوە کوردەکان کۆکراونەتەوە و لە ئوردوگاکاندا دەستبەســـەر کراون بۆ ئەوەی نەچنە ریزی پێشـــمەرگەکان. بە گوێرەی راپۆرتێک هێرشکراوەتە ســـەر بنکەی پۆلیسی شـــارێک و ژمارەیەک لە ئەفســـەرە پۆلیسەکان کوژراون.

٦- لەگەڵ ئەوەشدا سەدام حوســـەین، سەرۆک کۆماری عێراق ١٥ی گـــولان لە گـــەڵ فەرماندەکانی فەیلەقـــی یەک (ســـلێمانی) و فەیلەقی ٥ (باکوور)ی سوپای عێراق کۆبووە کە وەزیری بەرگری، خەیرولا و عەلی حەســـەن ئەلمجید (٧٢) (ســـەرۆکی هەواڵگری ناوخۆ کە لەم مانگانەی دواییـــدا زۆربەی کاتی خۆی بۆ کاروباری کوردەکان تەرخان کردووە) لە دانیشـــتنەکەدا ئامادەبوون. لە ١٧ی گولان ســـەدام لەگەڵ فەرماندەی گشـــتی هێزە چەکدارەکانی عێراق کۆبووەوە و عەلی حەسەنئەلمجیدیش لە کۆبوونەوەکەدا بەشداربوو.

سەرجەم راپۆرتە دیپلۆماتیکەکان جموجۆڵی بەرچاوی سەربازانی عێراق لە باشـــوور بەرەو کوردستان لە باکووری ولاتیان پشتڕاست کردوەتەوە، هەرچەنـــد کە زۆربەی چاودێران ئەوە بـــە دوور دەزانن هێزەکانی گاردی کۆمـــاری بەرەو باکوور رۆیشـــتبن. بە گوێرەی راپۆرتـــەکان فایلەکانی نەخۆشـــخانەی ســـلێمانی دەنێردرێن بۆ بەغداد و پزشکی زیاتر رەوانەی نەخۆشخانەکانی ســـلێمانی دەکرێت، چونکە پێشبینی دەکرێت شەڕەکە بەرفراوانتر بێت. (بەگوێرەی راپۆرتی هەمان ســـەرچاوە، رێوشـــوێنگەلی هاوشـــێوە لە نەخۆشخانەی عەمارە (٧٣) گیراوەتەبەر، چونکە پێشبینی دەکرێت شەڕی زیاتر لە زۆنگاوەکان روو بدات).

١١- زانیـــاری پێویســـت لە باکوورەوە بەدەســـتمان گەیشـــتوە کە نیشـــان دەدات بە دڵنیاییەوە دەوڵەتی عێراق شـــالاوێکی بەرفراوان لە

کوردســـتان بەڕێوە دەبات. پێمانوایە کە ئیدی کاتی ئەوە بەسەرچووە دەوڵەتـــی عێراق هەوڵ بدات لانیکەم لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، ســـەرۆکی یەکێتی نیشـــتمانی کوردستان وتووێژ بکات. کاتێکی بەرچاو لە ناوچەی ســـلیمانی هەم لەلایەن جێگری ســـەدام، عیـــزەت ئیبراهیم (ئەلدوری) (٧٤)و هـــەم لەلایەن عەلی حەســـەن المجیدی خزمی نزیکی ســـەدام و سەرۆکی ئیستیخباراتی ناوخۆوە تەرخان کراوە و هەردوویان بەو ئەنجامە گەیشتوون کە کاتی وتووێژ تەواو بووە. ئەم سیاسەتە نوێیەی عێراق (بۆ وتووێژ لەگەڵ کوردەکان) هاوکات بووە لەگەڵ ئوپەراسیۆنی «فتح ٥» و «کربلا ١٠»ی ئێران و کوردەکان[٧٥]کە لە ناوچە شـــاخاویەکانی نێوان پێنجوێن و سلێمانی بەڕێوەچووە.

ژمـــارەی ئەو گوندانە کـــە کاول کراون (٣٠٠ گونـــد) گەلێک زۆرە و بەتایبـــەت راپۆرتی چۆڵکردن و کاولکردنی کۆیە زۆر دڵتەزێنە. لەوانەیە لە هەندێ لە زانیاریەکانی ئەم راپۆرتانەدا زیادەڕۆیی کرابێت، بەڵام روونە کە سیاسەتی « زەوی سوتماک» لە لایەن دەوڵەتی عێراق لە سەراسەری کوردســـتانی عێراق بەڕێوەچووە و ئەو سیاسەتە لانیکەم کاری کردوەتە ســـەر ناوەندە ناســـراوەکانی بزووتنەوەی کورد. هیچ گومان لەوەدا نییە کە دەوڵەتی عێراق هیواداره لە رێگای تێکشـــکاندنی کوردە راپەڕیوەکان و دەرکردنـــی کـــوردەکان لە زێدی خۆیـــان و زەوی و مەزراکانیان ( کە ســـەرچاوەی بژیویانە) و راگوازتنەوەی بەکۆمەڵی بنەماڵەکان، ئیرادە و ورەی خۆڕاگری و بەربەرەکانی کوردەکان تێکبشـــکێنێت. بەهەرحاڵ لە ماوەی چەند دەیەی رابردوودا دەوڵەتی عێراق ئەم سیاسەتە دڕندانانەی دژی کـــوردەکان بەکارهێناوە، بەڵام ئەم سیاســـەتە هەمیشـــە ئەنجامی پێچەوانەی بەدواوە بووە و کوردەکان بە شێوەیەک لە شێوەکان هەمیشە توانیویانە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتە شـــاخاویەکەی خۆیان و توندتر لە جاران دژی عەرەبە باڵادەستەکانیان راپەڕنەوە. لە هەمان کاتدا پێشبینی ئەوە دەکەیـــن خەڵک زیاتر روو لە ریزەکانی تاڵەبانی و بارزانی بکەن و ورە و ژمارەی هێزە جاشەکانی «فورسان» ( کە بۆ پارە کار دەکەن) کەم بێتەوە.

نیۆتۆن[٧٦]

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ:
## وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن
## حوزەیرانی ١٩٨٧

بابەت: شاڵاوی کاولکردنی گوندەکانی سەر بە شاری رواندز لە باکوری عێراق

**نهێنی**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، دەمیشق، عەمان، کوەیت و کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنا

ئاماژە بە:

تیلیگرامی ٢٣٢٣ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغداد

١- رەش کراوەتەوە

٢- (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) کە ٢٤ی گوڵان سەردانی رواندزی کردووە راپۆرتیداوە کە ئەو شارە لە کۆنترۆڵی دەوڵەتی عێراقدایە نە ئێران. پێشتر سەربازانی دەوڵەتی عێراق نەیاندەتوانی بێخەم برۆن بۆ شارۆچکەی سنووری ماوەت لە (باکووری) سلێمانی.

سەرچاوەکە وتی لە کاتی سەردانەکەی بۆ رواندز لە ٢٤ی گوڵان بینیویەتی کە ژمارەیەکی زۆر لە گوندە کوردنشینەکان کاولکراون کە یەکێکیان گوندێک بوە کە ١٠ هەزار کەسی تێدا نیشتەجێ بووە. دەوڵەتی عێراق ئەو گوندانەی کاول کردووە کە خەڵکەکەی بەڵێننامەی وەفاداری بە دەوڵەتی ناوەندیان واژۆ نەکردووە و خەڵکەکەی گوازتوەتەوە بۆ ئوردوگاکانی بیاوانەکانی نزیک عەرعەر و روتبە (٧٧)و ئوردوگاکانی نزیکی رومادی و حیلە (٧٨)لە دەوروبەری بەغداد.

لانیکەم ٥٦ گوند بەم شێوەیە کاول کراون هەرچەند کە سەرچاوەکانی دیکە ئاماژە بەوە دەکەن کە ٣٠٠ گوند بەم شێوەیە کاول کراون. ئامانجی ئەم سیاسەتە ئەوەیە کە سەرچاوەی پشتیوانی لە پێشمەرگەکان وشک

بكرێت. ٤ هەزار کەس لە دانیشـــتوانی ئەم گونـــدە کاولکراوانە چونەتە ریزی پێشـــمەرگەکان. تەنانـــەت ژمارەیەک لە فورســـانە کوردەکان کە گوندەکانیـــان لە لایەن دەوڵەتەوە کاول کـــراوە چونەتە ریزی هێزەکانی بارزانـــی و تاڵەبانـــی. هەروەها گوندەکانی ئـــەو ناوچانەی کە نەوتیان هەیە ( بەتایبەت کەرکوک) کاول کراون.

## لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن، ٤٤٢٧ تەموزی ١٩٨٧

بابەت: دوایین زانیاریەکان لە بارەی بارودۆخی کوردەکان و سیاسەتی راگوازتنەوەیان

نهێنی

بۆ زانیاری: لایەنە پەیوەندیدارەکانی شەڕی کەنداو

١- رەش کراوەتەوە

٢- لە کاتێکدا کە ئێمە نەمانبیستوە ئەم دوایانە کێشەیەکی ئەوتۆ لە شار و گوندە کوردنشینەکان روویدابێت، بەڵام وادیارە ئەمدوایانە هێزەکانی دەوڵەت لەو شوێنانە قایم کراون و کێشە لەو ناوچانە بەردەوامە و ژمارەیەکی زیاتر لە عەشیرەتە کوردەکان لەبەرامبەر سیاسەتی کاولکردنی گوندەکانیان یا چەکهەڵگرتن (جاشایەتی- وەرگێڕ) رادەوەستن. کاربەدەستانی عێراق درێژە بە جێبەجێکردنی سیاسەتە توندوتیژەکەیان دەدەن و دەڵێن سوپای عێراق دەتوانێت تەنانەت ژمارەیەک زیاتر میلیشیا ( جاش- وەرگێڕ) بەکاربێنێت.

سوپای عێراق ئەگەر ببینێت پیاوێک لە ناو گوندەکەیدا نەماوە، حیسابی پێشمەرگەی بۆ دەکات و بنەماڵەکەی دەر دەکات و پێیاندەڵێت برۆن بۆ لای پیاوەکەتان لە شاخ، چونکە بەمشێوەیە دەبن بە بارگرانی بۆ هێزی پێشمەرگە.

لەگەڵ ئەوەدا کە هیچ دیپلۆماتێک هیچ کوردێکی نەبینیوە کە لە دەرەوەی کوردستان نیشتەجێ کرابێت، بەڵام ئێمە کۆمەڵێک بەڵگەی ناڕاستەوخۆمان هەیە کە نیشان دەدات رژێمی عێراق کۆمەڵێک کێشەی لەگەڵ کوردەکاندا هەیە. راپۆرتە جۆراوجۆرەکان نیشان دەدات کە هەندێ لە کوردەکان نێردراون بۆ جودایدات عەرعەر (٧٩)لە سەر سنووری عەرەبستانی سعودی. جودایدات عەرعەر یەکێ لە شوێنە دووردەست و

پەرتەکانـــی جیهانی عەرەبە. هەروەهـــا ژمارەیەکی دیکە لە کوردەکان نێردراون بۆ ناوچە بیابانیەکان، لەوانە پوتبا (٨٠) (لە ســـەر ســـنووری ئوردون) و دەریاچەی تەراتەر (٨١) لە نزیک رۆمادی. ئەم ناوچانە زۆر لە کوردستان دوورن و لە ناوەراستی هاویندا یەکجار زۆر گەرمە.

بـــە گوێرەی راپۆرتەکان شـــەڕ لە باکووری رۆژهەلات و باشـــووری رۆژهەلاتی ســـلێمانی توندتر بووە و کوردە عێراقیەکانی دژبەری دەولەت لەگەل هێزەکانی ئێران هێرشیان کردوەتەسەر هێزەکانی عێراق. (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) راپۆرتیداوە کە هێزەکانی دەولەت چەکەکانیان فرێداوە و هەلاتوون. ئەو شەرە هەرچەند کە قورس بووە بەلام وادیارە شەرێکی محەلی بووە و هێزەکانی ئێران ئەنجامێکی ئەوتۆیان دەســـتنەکەوتووە. وادیارە سوپای عێراق ژمارەی هێزەکانی لە باکوور زیاتر دەکات و ئەوە نیشان دەدات کە لەوانەیە شەڕی گەورەتر روو بدات. هەروەها لە ماوەی دوو مانگی رابردوودا کۆمەلێک زانیاریمان لە بارەی گەڕانەوەی لاشـــەی پارچەپارچەکراوی ســـەربازانی عێراق لە باکوورەوە بیستوە. بە گوێرەی راپۆرتەکان یەکینەیەکی ١٤ کەسی هێزەکانی سەر بە (رەش کراوەتەوە) چونەتە ناو گوندێکی کوردنشـــین بەلام کەوتونەتە ناو بۆسە و کوژراون و سەریان براوە.

نیۆتۆن

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن، ٥٢٦٨ تشرینی یەکەمی ١٩٨٧

بابەت: بارودۆخی کوردستانی عێراق لەوپەڕی خراپیدایە

بۆ زانیاری:

لایەنە پەیوەندیدارەکانی شەڕی کەنداو

٠٠٣٧ USCINCCENT MACDILL AFB

ئاژانسی هەواڵگری بەرگری (DIA)، واشینگتۆن ٠٠٧١

کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنە

ئاماژە بە:

ئەلـف- تیلیگرامـی ٤٥٩٥ی باڵوێزخانـەی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە

ب- تیلیگرامی ١٢١٧١ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ئانکارا

١- ڕەش کراوەتەوە

٢- کورتە: ئەو زانیارییانە کە ئەمدواییانە لە کوردستانەوە بەدەستمان گەیشتوون و سەفەرەکانی خۆمان بۆ کوردستان نیشان دەدات کە دەوڵەتی عێراق درێژە بە سیاسەتی گەمارۆدانی ناوچە دەدات و پێکدادان لە نێوان کوردەکان و هێزەکانی ئاسـایش بـەردەوام ڕوو دەدات کە هەندێ جار کوژراو و برینداری لێکەوتوەتەوە. کوردەکان شارۆچکەیەکی سەرەکیان لە نزیک سـنووری تورکیە گرتووە. لەوانەیە سـەرنجام دەوڵەتی عێراق لەگەڵ ئەو ڕاسـتیە بەرەوڕوو بێتەوە کە بە هەڵسـوکەوتی توندوتیژانە ناتوانێت کوردەکان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی و باشـترە لەگەڵیان ئاشـت بێتەوە هەرچەند کە تەنها تێپەڕبوونی کاتە کە دەتوانێت ڕاستبوونی ئەو مەسەلەیەمانە پێنیشان بدات.

٣- ئەنجامی سـەفەرەکانمان بۆ کوردستانی عێراق (بۆ نموونە بنواڕن بۆ تیلیگرامی سـەفەر بۆ سـلێمانی لە بـەرواری ٦-٧ی ئەیلوول) ئەو ڕاپۆرتە جۆراوجۆرانە پشتڕاست دەکاتەوە کە دەیانگوت دەوڵەتی عێراقی

سیاسەتی کاولکردنی گوندەکان لە سەراسەری کوردستان جێبەجێ دەکات لە ناوچەی زاخۆ لە باکووری ڕۆژئاوای عێراق بگرە تا ناوچەی دەوروبەری کەلار لە باشووری ڕۆژهەلات. کاولکردنی گوندەکان لە سەراسەری ناوچەکانی دەوروبەری شارۆچکە و شارە سەرەکییەکان، بەنداوەکان و ناوچە پیشەسازییە - ئابورییەکان جێبەجێ دەکرێت لە کاتێکدا کە هەندێ لە گوندەکان لەو ناوچانە کە تازە دروست دەکرێن و لە ژێر کۆنترۆلی دەولەتدان، نەڕوخێندراون. ڕەوتی کاولکردنی هەندێ لە گوندەکان هێشتا بەردەوامە هەرچەند کە زۆربەی ڕاپۆرتەکان نیشان دەدەن کە بەرنامەی ڕوخاندنی گوندەکان تا مانگی حوزەیران تەواو بووە.

٤- (ناوەکەی ڕەش کراوەتەوە) لە ٣ی تشرینی یەکەم وتی کە بارودۆخی باکووری عێراق قەد ئەوەندەی ئێستا خراپ نەبووە. ئەو سەرچاوەیە وتی لە دوو حەوتووی ڕابردوودا دەولەتی عێراق سەربازی زۆر زیاتری ڕەوانەی باکوور کردووە. لەم ڕۆژانەی دواییدا سوپای عێراق ٨٨ تانکی ڕەوانەی ناوچە کوردنشینەکان کردووە و هێزەکانی عێراق کەلکی زۆر زیاتریان لە هیلیکۆپتری سەربازی دژی کوردەکان وەرگرتوە.

٥- زۆربەی ڕاپۆرتەکان باس لەوە دەکەن کە شارۆچکەی کانیماسی (٨٢) لە ٢٠ی ئەیلوول (یان لەو ڕۆژانەدا) کەوتوەتە دەستی پێشمەرگە کوردەکان. کانیماسی ١٠ کیلۆمەتر لە باکووری شارۆچکەی کوردنشینی ئامێدی و تەنها ٥ کیلۆمەتر لە سنووری تورکیە و ٨٠ کیلۆمەتر لە سنووری ئێران دوورە. گرتنەوەی کانیماسی ئامانجی یەکەمی هێزەکانی عێراقە و لەوانەیە لە چەند ڕۆژی داهاتوو هێزەکانی عێراق هێرش بکەنە سەر کانیماسی. گرنگی کانیماسی تەنها لەوەدایە کە گرتنی ئەو شارۆچکەیە دەبێتە هەڕەشە بۆ ئامێدی و گرتنی ئامیدیش ( کە بەهەرحال دوورە شتی وا ڕوو بدات) دەبێتە هەڕەشە بۆ زاخۆ و ڕێگای سەرەکی موسل - تورکیە.

٥- بە گوێرەی ڕاپۆرتەکان، عەلی حەسەن ئەلمەجیدی خزمی سەدام

(که له سـه‌ره‌تای ١٩٨٧ه‌وه بووه به به‌رپرسی ئاسایشی باکوور) (٨٣) له مانگی ته‌موز له سـه‌رکار لابردراوه. ( ناوه‌که‌ی ره‌ش کراوه‌ته‌وه) وتی له‌وانه‌یه ئه‌م هه‌واڵه راست بێت، چونکه ئێستا هیچ ده‌نگوباسێک له باره‌ی عه‌لی حه‌سـه‌ن ئه‌لمه‌جید نییه. به‌هه‌رحاڵ ئه‌و سه‌رچاوه‌یه وتی گومانی له‌وه‌دا هه‌یه که له‌سه‌رکارلابرانی عه‌لی حه‌سه‌ن ئه‌لمه‌جید ( ئه‌گه‌ر راست بێت) هیچ ئاڵوگۆڕێکی به‌رچاو له سیاسـه‌تی عێـراق پێکبێنێت، ته‌نها ئه‌وه نه‌بێت که هیوای کـورده‌کان و کۆمه‌ڵگای دیپلۆماتیک زیاتر بکات بۆ ئه‌وه‌ی عێراق تۆزێ نه‌رمونیانتر بێت. له راسـتیدا سیاسـه‌تی عێراق سـه‌باره‌ت به باکوور هه‌روا زۆر توندوتۆڵ ده‌بێت و به ناردنی تانک و هیلیکۆپته‌ر بۆ باکوور سه‌ختتر ده‌بێت.

٩- ئـه‌و راپۆرته جۆراوجۆرانه که به ده‌ستمانگه‌یشـتووه به روونی نیشان ده‌دات که سیاسه‌تی توندوتۆڵی عێراق دژی کورده‌کان به‌رده‌وامه و سوپای عێراق ئه‌و کوردانه‌ی که گومانی لایه‌نگری له پێشمه‌رگه‌کانیان له سـه‌ره بێبه‌زه‌ییانه ئـازار ده‌دات. به گوێره‌ی ئه‌م راپۆرته سـوپای عێراق لیسـتێکی ئه‌و بنه‌ماڵانه‌ی له که‌رکـووک و ده‌ۆک ئاماده کردووه کـه گومانی ئه‌وه‌یان له‌سـه‌ره که یه‌کێ له ئه‌ندامه‌کانیان پێشـمه‌رگه بێـت و داوای کردووه که شـوێنی ژیانی نێرینه‌کانیـان دیاری بکرێت و ئه‌گـه‌ر ئاماده‌نه‌بوونی نێرینه‌کانیان هیچ پاسـاوێکی نه‌بێت، ئه‌ندامانی بنه‌ماڵه‌کانیان یه‌کسـه‌ر سـواری لۆری ده‌کرێن بێ ئه‌وه‌ی کاتی ئه‌وه‌یان پێبدرێت که‌لوپه‌لی ناو ماڵ له‌گه‌ڵ خۆیان هه‌ڵگرن و یه‌کسه‌ر ده‌نێردرێن بـۆ ئوردوگا زۆره‌ملیه‌کان له رۆمادی. بـه گوێره‌ی ئه‌م راپۆرته ژماره‌ی ئه‌و بنه‌ماڵانه که به‌م شـێوه‌یه راگوازراونه‌ته‌وه ئه‌وه‌نده زۆرن که لۆری سـه‌ربازیی به‌شـی نه‌کـردوون و سـوپای عێراق لۆری شه‌خسـی بۆ گوازتنه‌وه‌یان به‌کارهێناوه. زێده‌باری ئه‌وه‌ش مه‌ترسـی ئه‌وه له ئارادایه کـه هـاوکات له‌گه‌ڵ نزیکبوونه‌وه له سـه‌رژمێری نیشـتمانی عێراق له ١٧ی تشـرینی یه‌که‌م، شالاوی گوازتنه‌وه‌ی خه‌ڵک له رووی چۆنیه‌تی و چه‌ندایه‌تییه‌وه توندتر بێت. له کاتی سـه‌رژمێری نیشتمانیدا رێوشوێنی

نائاسایی له سەراسەری عێراق دەگیردرێتەبەر.

٦٣- تێبینـــی: ئێمە زانیاری تەواومان له بـــارەی ئەوە نییه که چی له کوردســـتان روو دەدات، بەڵام دەتوانین لەو پەیوەندیەدا به کۆمەڵێک ئەنجـــام بگەین. ســـاڵی ١٩٨٧ رووی له کۆتاییه و لەم ســـاڵەدا رژێمی عێـــراق بەو ئەنجامە گەیشـــت که هەوڵدان بۆ دانوســـتان و وتووێژکردن لەگەڵ کوردەکان بێ سودە: کوردەکان له نێو خۆیاندا هاوڕا نین و قەت دەربـــارەی داواکاریەکانیان واقعبین نەبوونە ( بۆ نمونە کوردەکان قەت له ســـەر ئەو داواکارییه پێداگرییان نەکردووە که کەرکووک و سەرچاوە نەوتیەکانی دەبێ بگەڕێندرێتەوە سەر هەرێمی ئوتونومی کوردستان).

٦٤- دەوڵەتـــی عێراق بڕیاریداوە به شـــێوەیەکی توندوتیژانە لەگەڵ کوردەکان هەڵسوکەوت بکات لەوانە کوردەکانی بەکۆمەڵ گوازتەوەتەوە بۆ شار و شارۆچکە نوێکانی دەرەوەی زێدی خۆیان بۆ ئەوەی پێشمەرگەکان له یارمەتی و پەنادانی خەڵک بێبەش بکات و له ژیانی کۆنی خۆیان که سەرچاوەکەی کشتوکاڵه بێبەشـــیان بکات و له راستیدا زۆربەی خەڵک له ئیش و کار بخات و به شێوەیەکی بێبەزەییانه لەگەڵ پێشمەرگەکان هەڵســـوکەوت بکات و بنەماڵەکانیـــان دوور بخاتەوە. ئەڵبەتە دەوڵەتی عێراق وێنای (تەســـەور) ئەوەی نەدەکرد که ئەم تاکتیکانه کوردەکانیان زیاتـــر لێ هانبدات و لای خۆیان وا حیســـابیان کردبوو که ئەنجامەکانی هەڵسوکەوتی توندوتیژانه لەگەڵ کوردەکان له ئەنجامەکانی هەڵسوکەوتی نەرم زیاتر دەبێـــت، هەرچەند که دەبێ چاوەڕوان بین و بزانین ئایا ئەم هەڵسەنگاندنه له جێی خۆیدا بووە یا نا

بووک

## ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

بابـــەت: کورتەیەک لە راپۆرتێکی هەواڵگری لە بـــارەی کیمیابارانی هەڵەبجە لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨

٢٤ی ئاداری ١٩٨٨

بە تەواوی نهێنی

بەڵگە و شـــەواهیدەکان لە بارەی کەڵکوەرگیران لە چەکی کیمیایی لە شـــەڕ لە نزیک هەڵەبجە لە باکووری عێراق روون نین و پڕۆپاگەندای ئێـــران و عێراق دژ بە یەکدی لەو پەیوەندییەدا، بارودۆخەکەی ئەوەندەی دیکـــە ئاڵۆز کردووە، بەڵام بەهەرحاڵ روونە کە هەم ئێران و هەم عێراق لەو شـــەڕەدا چەکی کیمیاییان بەکارهێناوە و وادیارە دەیانەوێت درێژە بە کەڵکوەرگرتن لە چەکی کیمیایی بدەن.

(درێژەی راپۆرتەکە رەش کراوەتەوە).

ئـــەو وێنانە کە لە تەلەڤزیۆنەکان بڵاو بووەتەوە بە روونی نیشـــان دەدات کە گازی موســـتارد (٨٤)و جۆرە سیانیدێک (٨٥) کە بە خێرایی کار دەکات، دژی قوربانیـــان بەکارهاتووە. ئەگـــەری ئەوە زۆرە کە ئەو جۆرە ســـیانیدە کە بەکارهاتووە، سیانۆگین کۆلۆرید (٨٦) (CK) بێت نە سیانیدی هیدرۆژن (٨٧) (HCN) چونکە HCN لە هەوا سووکترە و ئەو کەسانە ناکوژێت کە لە ناو بیر و چاڵی ئاودان. لەوانەیە گازی دەماریش بەکارهاتبێیت بەڵام هیچ ئاســـەوارێک لـــە مەرگی توندوتیژانە و کەف بە سەر دەمی قوربانییەکانەوە ( کە کاریگەری گازی دەمارە) نەبینراوە.

(درێژەی راپۆرتەکە رەش کراوەتەوە).

CIA تا ئیســـتا لە ســـەر ئەو باوەڕەیە کە عێراق گازی دەمار، گازی موستارد و گازی فرمێسکهێنەری هەیە.

(درێژەی راپۆرتەکە رەش کراوەتەوە).

## بەڕێوەبەرایەتی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی(CIA)
## national intelligence daily[88]

بابەت: بەخت و شانسی کوردە ڕاپەڕیوەکان ڕوو لە تاریکی دەکات

دووشەمە، ١٦ی گوڵانی ١٩٨٨

بە تەواوی نهێنی

بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن دەوڵەتی عێراق دژی پێشمەرگە کوردەکان لە ناوچە شاخاویەکانی باکووری عێراق گەیشتوەتە ئەوپەڕی خۆی. پێشمەرگە کوردەکان ناچار کراون دەست لە شەڕی بەرەیی لەگەڵ عێراق هەڵبگرن و بە شێوەی گروپگەلی بچوک بچوک کتوپڕ هێرش بکەنەسەر هێزەکانی عێراق و رابکەن.

ئەو زەبرە توندە کە بەتایبەت لە مانگی ئادار لە هەڵەبجە لە کوردەکان کەوت، گەڵێ لە پێشمەرگەکانی ناچار کردوە مەسەلەی شالاوە هاوبەشەکانیان لەگەڵ هێزەکانی سپای پاسدارانی ئێران ببەنە ژێر پرسیار. بە گوێرەی ڕاپۆرتی ڕاگەیاندنە گشتیەکان، کوردەکان داوایان لە دەوڵەتی ئێران کردووە پشتیوانی لە دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد بکات و لەبەرامبەر ئەوەدا کوردەکانیش درێژە بە هاوکارییە سەربازییەکەیان لەگەڵ ئێران دەدەن. هاوکات کوردەکان درێژە بە هەوڵەکانیان دەدەن بۆ ئەوەی وڵاتانی ڕۆژئاوایی گوشار بخەنە سەر عێراق بۆ ئەوەی کۆتایی بە کەڵکوەرگرتن لە چەکی کیمیایی بهێنێت[89]

تێبینی: کەڵکوەرگرتنی بێبەزەییانەی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی خەڵکی مەدەنی و پێشمەرگەکان لە بەهاری پارساڵەوە و ئەو زەبرەی کە لە ئەلفاو[90] لە هێزەکانی ئێران کەوت، کوردەکانی ناچار کردووە شەڕەکەیان لەگەڵ هێزەکانی عێراق بە شێوەیەکی بەرچاو کەم بکەنەوە. لەوانەیە کوردە ڕاپەڕیوەکان پەرە بە کردەوەگەلی تیرۆریستی لە ناو شارە کوردنشینە گەورەکانی باکووری عێراق بدەن، بەڵام لە شوێنەکانی دیکەی عێراق شتێکی ئەوتۆیان لە دەست نایێت. پێناچێت ئێران پشتیوانی لە سەربەخۆیی کوردەکان بکات، چونکە لە هاندانی کوردە ناڕازییەکانی خۆی دەترسێت.

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەرۆم(رۆما) بۆ: وەزارەتی دەرەوە، ١٢٨١

بابەت: بەرنامەی راگوازتنەوەی خەڵک لەلایەن دەوڵەتی عێراق
حوزەیرانی ١٩٨٨
بۆ زانیاری:
US INS WASHDC
ئاماژە بە:
ئەلف- تیلیگرامی ٢٠٠٤٧٤١ی وەزارەتی دەرەوە بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە رۆم
ب- تیلیگرامی ١٣٤٠٦ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە رۆم بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- سپاستان دەکەین کە وەڵامی گونجاوتان بە داواکاریەکەی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە رۆم دایەوە بۆ ئەوەی لە بارەی بەرنامەی راگوازتنەوەی خەڵک لە لایەن عێراقەوە پەیامتان بۆ بنیرین.

٢- لە وەڵامی پاراگرافی ٢ی تیلیگرامی ٢٠٠٤٧٤١ی وەزارەتی دەرەوە، باڵوێزخانەی ئەمریکا لە رۆم داوا دەکات حیساب بۆ زانیاریەکانی (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) لە پەیوەندی لەگەڵ بەرنامەی راگوازتنەوەی خەڵک لەلایەن دوڵەتی عێراقەوە بکرێت چونکە زانیاریەکانی دەربارەی دەستبەسەرکردنی سەرەرۆیانە و ئەشکەنجەکردنی خەڵک بە تەواوی باوەڕپێکراوە و لەگەڵ راپۆرتی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی دیکە یەکدەگرێتەوە.

زانیارییەکان نیشان دەدات کە سەرجەم شارۆچکەکانی کوردستان لە سەروبەندی شاڵاوی کۆنترۆڵکردنی پێشمەرگە کوردەکان لەلایەن هێزەکانی دەوڵەتەوە خاپور کراون. بە گوێرەی زانیارییەکان، کوردەکان بە کۆمەڵ راگوازراونەتەوە و رێکخراوی» لێبوردنی نێونەتەوەیی» بانگەشەی ئەوەی کردووە کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی مەدەنی، لەوانە

خوێندکاران پاش دەستبەسەرکرانی سەرەڕۆیانە لە سێدارەدراون یان بێ سەروشوێن کراون.( ناوەکەی رەش کراوەتەوە) کە سەرباز بووە لە سوپای عێراقدا فەرمانی پێدراوە تەقە لە خۆپیشاندەران لە هەولێر بکات، بەڵام فەرمانەکەی جێبەجێ نەکردووە. دەوڵەتی عێراق هیچ چەشنە نەیارێتێکی سیاسی تەحەمول ناکات و بە ئەشکەنجە و کوشتن وەڵامی چالاکی سیاسی دژبەرانی حکومەت دەداتەوە.

٣- لە پەیوەندی لەگەڵ برگەی ١٠١ (الـف) (٤٢) دا، باڵوێزخانەی ئەمریکا لە رۆم لە گەڵ ئەوەدایە کە عێراق لە ناو لیستی وڵاتانی کێشەدار لە NEA (نووسینگەی کاروباری وڵاتانی رۆژهەڵاتی نزیکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا) دا بمێنێتەوە.

راب

**لە وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن بۆ:**

- سەرجەم ناوەندە دیپلۆماتیکەکانی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا

- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لە بەیروت و کابۆل و کونسولخانەی ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لە ئالیکسەندێریا، کەراچی و لاهور

بابەت: ناوەڕۆکی دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی لە وەزارەتی دەرەوە حوزەیرانی ١٩٨٨

بۆ زانیاری: سەرجەم ناوەندە دیپلۆماتیکەکانی ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لە ئوروپا و کونسولخانەی ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لە ئەدەنە، ئیستانبول، ئیزمیر

CINCPAC HONOLULU HI

UNCENTCOM MCDILL AFB FL

ئێمە وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەمان رێنوێنی کردبوو کە ئەگەر لە

کۆنفرانســـه رۆژنامەوانیەکـــەدا له ١٤ی حوزەیران پرســـیاریّ لیّکرا بەم شیّوەیه وەڵام بداتەوە:

پرسیار: ئایا کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ ریّبەری یەکیّتی نیشـــتمانی کوردستان، جەلال تاڵەبانی دیداریان کردوە؟ ناوەڕۆکی ئەو گفتۆگوانه چی بووە؟

وەڵام: بەڕیّز تاڵەبانی له کاتی سەردانەکەی له ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا داوای کردبوو چاوی بکەویّت به کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە. بەڕیّز تاڵەبانی له ٩ی حوزەیران لەگەڵ بەرپرسی بەشی کاروباری وڵاتانی باکووری کەنداو له ئیدارەی رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا و هەروەها هەندیّ له کاربەدەستانی پەیوەندیدار به مەسەلەی ئاوارەکان و مەسەلەی مافـــی مرۆڤ دیداری کـــرد. بەڕیّز تاڵەبانـــی بیروبۆچوونەکانی خۆی له بارەی دوایین رووداوەکانی پەیوەندیدار به ناوچه کوردنشینەکانی عیّراق دەربڕی لەوانه شـــەڕ له دەوروبەری هەڵەبجه لــــه ئادار که تیّیدا چەکی کیمیایی دژی دانیشتوانی مەدەنی بەکارهیّنراوە.

کاربەدەستانی ویلایەته یەکگرتوەکانی ئەمریکا سیاسەته ئاشکراکانی ئیّمەیان ســـەبارەت به ناوچه بۆ بەڕیّز تاڵەبانی دووپاتِ کردەوە، لەوانه مەسەلەکانی پەیوەندیدار به مافی مرۆڤ و ئەوە که ئیّمه کەڵکوەرگرتنی نایاسایی له چەکی کیمیایی شەرمەزار دەکەین.

له بارەی هەڵویّستی ئیّمه سەبارەت به کوردەکان، سیاسەتی ویلایەته یەکگرتـــوەکان ئەوەیه که کوردەکان دەبیّ به شـــیّوەی ئاشـــتیخوازانه بگەن به مافەکانیان له چوارچیّوەی وڵاتانی ئیّســـتای ناوچەدا. ویلایەته یەکگرتـــوەکان له کاروباری ناوخۆیی ئەو وڵاتانه دەســـتیّوەردان ناکات. ویلایەتـــه یەکگرتوەکان لەســـەر ئـــەو باوەڕەیه که ســـەرجەم خەڵکی عیّـــراق و ئیّران، لەوانه کـــوردەکان، له کۆتاییپیّهاتنی شـــەڕی ئیّران و عیّراق ( بەگویّـــرەی بڕیارنامەی ٥٩٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشـــی نەتەوە

یەکگرتوەکان) ســود وەربگرن و ئێمە درێژە بە هەوڵەکانمان دەدەین بۆ ئەوەی مەرجەکانی ئەو بڕیارنامەیە جێبەجێ بکرێت.

پرســیار: گرنگــی ئامادەبوونی ئەمڕۆی بەڕێز تاڵەبانی لە بەشــی «OPEN FORUM»ی وەزارەتی دەرەوە لە چیدایە؟

OPENFORUMی وەزارەتــی دەرەوە بەرنامەیەکــی ســەربەخۆیە بۆ ئەوەی کاربەدەســتانی ئاژانســەکانی کاروبــاری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانــی ئەمریــکا لە گــەڵ بیروبۆچوونە جۆراوجــۆرەکان ( کە گەلێکیــان نایەکانگیرن) ئاشــنابن. هەمووی ئەو شــتانە کە لە OPEN FORUMدا بــاس دەکرێت تۆمار ناکرێن. مەســەلەی هەڵبژاردنی ئەو کەســانە کە تێیدا بەشــدار دەبن و بیروبۆچوونەکانیان هیچکام دەربڕی سیاســەت یا روانگە و بیروبۆچوونەکانــی وەزارەتی دەرەوە یا دەوڵەتی ویلایەتــە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نیە و ئامادەبوونی بەڕێز تاڵەبانی (یان هەر کەســێکی دیکە) لە OPEN FORUM بە واتای پشــتیوانییکردنی وەزارەتی دەرەوە لە تاڵەبانی نییە.

شوڵتز

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن

بابەت: بەردەوامبوونی شاڵاوی کاولکردنی گوندە کوردنشینەکان حوزەیرانی ١٩٨٨

بۆ زانیاری: لایەنە پەیوەندیدارەکانی شەڕی کەنداو
DIA WASHDC

USCINCCENT MACDILL AFB FL

١- بە تەواوی رەش کراوەتەوە

٢- کورتە: عێراق بانگەشـــەی ئەوە دەکات کـــە زنجیرە چیایەکی لە کوردســـتان گرتووەتەوە. رێگای سەرەکی دەربەندیخان کە لە ژێر هێڵی تۆپبارانی ئێراندایە کراوەتەوە. ســـێ شاری زۆر گەورەی نیشتەجێکردن دروســـتکراوە بـــۆ نیشـــتەجێکردنی دەیان هـــەزار کورد کـــە لە گوندە رووخاوەکانیـــان دەرکراون. شـــاڵاوی روخاندنی گونـــدەکان بەردەوامە. پێناچێـــت هێزەکانـــی گاردی کۆماری عێراق لەم چالاکیە ســـەربازییە دواییانەدا لە کوردســـتان تێوەگلابن، چونکە ئامادە کراون بۆ ئەوەی لە باشووری عێراق چالاکی بکەن.

٣- عێراق بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە ١٤ی حوزەیرانەوە زنجیرەیەک هێرشـــی لە کوردستان دەستپێکردووە بۆ ئەوەی پاشەکشە بە هێزەکانی ئێران بکات کە لە ئۆپەراســـیۆنی «محمد رســـول الله» دا هاتونەتە ناو خاکـــی عێراق. بە گوێـــرەی راپۆرتەکان، عێراق زنجیـــرە چیایەکی لە ناوچەی نێوان ماوەت و دوکان گرتوەتەوە کە تا کاتی هێرشەکەی ئێران لە ســـەرەتای مانگی حوزەیران لە دەستی هێزەکانی عێراقدا بووە (یان لانیکەم لە دەســـتی هێزەکانی ئێراندا نەبووە)، کەوابوو ئەم شـــاڵاوەی عێراق (ئەگەر بەو شـــێوەیە کە عێراق بانگەشـــەی دەکات سەرکەوتوو بووبێت) هێزەکانی ئێران دەگەڕێنێتەوە بۆ چوارگۆشـــەیەک لە پشـــتی ناوچەی ماوەت.

٤- کاربەدەستێکی باڵوێزخانەی ئەمریکا و ئوسترالیا لە بەغداد لە ١٣ تا ١٧ی حوزەیران سەردانی کوردستانیان کردووە و بینیویانە کە سەرجەم گوندە کوردنشینەکانی سەر ڕێگای موسل تا زاخۆ کاول کراون و سێ ناوەندی گەورەی نیشتەجێکردنی زۆرەملێ بۆ کوردەکان دروست کراوە کە دەوروبەریان بە درکی ئاسنی گیراوە و لە ژێر چاودێری سەربازیدان. هەروەها لە ناو شاری هەولێر کۆمەڵێک ئوتومبیلی سەربازی تویتایان بینیوە کە چەکیان بەسەرەوە بووە و کوردە فورسانەکانی تێدا بووە. لە سەر ڕێگای کەرکوک- سلێمانی ناوەندێکی نیشتەجێکردنی زۆرەملێیان بینیوە کە لە بازیان دروست کراوە.

هەروەها سەرجەم گوند و شارۆچکەکانی دەشتەکانی ڕۆژئاوای دوکان کاول کراون و تەنانەت خودی دوکان بە تەواوی چۆڵ کراوە. ژمارەیەکی زۆر خاڵی پشکنین لە سەر ڕێگای دوکان-کۆیە و کۆیە-ڕانیە دانراوە و بارودۆخی ئاسایش لە کۆیە زۆر توندوتۆڵ بووە. دەوروبەری شاری سلێمانی بە تەواوی لە ژێر کۆنترۆلی سوپای عێراقدا بووە. لە باشووری عەربەت، ناوەندێکی گەورەی نیشتەجێکردنی زۆرەملێیان بە ناوی «قەریەت ئەلنەسر» بینیوە کە خەریکی دروستکردنی بوونە. هەروەها ناوەندێکی نێشتەجێکردنی زۆرەملێی زۆر گەورەیان لە ڕۆژئاوای کەلار بینیوە کە خەریکی دروستکردنی بوونە بۆ ئەوەی خەڵکی ئەو گوندانە کە لە ناوچەی دیالە کاول کراون تێیاندا نێشتەجێ بکرێن.

تێبینی: بارودۆخی ئاسایش لە کوردستان ئێستا زیاتر لە هەر کاتێکی دیکە پتەو و قایمە. یەکێ لە هۆکارەکانی ئەوەیە کە ژمارەی سەربازەکان زیاتر کراوە. بارودۆخی ئاسایش لە شوێنگەلێک وەک مەخمور، کۆیە و کفری توندوتۆڵترە. لەگەڵ ئەوەشدا زیاتربوونی ژمارەی سەربازەکان هەموو مەسەلەکە نییە. بە بۆچوونی ئێمە شاڵاوی کاولکردنی گوندەکان کاریگەر بووە واتا هاوکات لەگەڵ ئەوەی ناڕەزایەتی کوردەکان لە دەوڵەتی عێراق ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێت، کوردەکان کەوتونەتە ژێر کاریگەری توندی ئەو شاڵاوەی عێراق.

نیلاتۆن

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن ٨٠٨٣

بابەت: بارودۆخی ئۆردوگاکانی کوردە راگوێزراوەکان
ئەیلوولی ١٩٨٨
نهێنی
بۆ زانیاری:
باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە ئانکارا
کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنە
لێژنـــەی نوێنەرایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانـــی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە نیۆیۆرک و ژنێڤ

١- رەش کراوەتەوە

٢- کاتێک کە ســـەرەتا روون بوەوە ســـەدام حوســـەین شێلگیرە لە ســـەر جێبەجێکردنی شـــاڵاوی کاولکردنی گوندە کوردنشـــینەکان، لـــە بەهاری ١٩٨٧ ئێمە کۆمەڵێک زانیاریمان بەدەســـت گەیشـــت لە بارەی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان لە ناوچە شـــاخاویەکان راگوازراونەتەوە بۆ ئۆردوگای روتبە[٩١] لە بیابانەکانی نزیک ســـنووری ئۆردون و ئۆردوگاکانی نزیک فەلوجەو رومادی. ئەم زانیاریانە لەگەڵ نمونەکانی پەیوەندیدار بە شـــاڵاوی عێراق دژ بە کوردەکان لە دەیەی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ یەکدەگرێتـــەوە. ئێمـــە نەمانتوانیـــوە زانیاری تەواو لە بارەی ژمارەی کوردە راگوێزراوەکان و شـــوێنی راگوازتنیان وەدەست بخەین. بە بۆچوونی ئێمە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک نەبوونەتە قوربانی ئەم راگوازتنـــەوە بەرفراوانە و ئەوانەی کـــە گوازراونەتەوە بنەماڵەی پێشمەرگەکان بوونە.

لـــە کاتی ســـەفەرەکەی خۆمان بـــۆ کوردســـتان، بینیمان کە ژمارەیەکـــی زۆر لە گوندەکان و تەنانەت هەندێک لە شـــارۆچکەکانی ســـەر رێگا سەرەکییەکان لە پارێزگای سلێمانی، هەولێر و دهۆک کاول

کراون. بارودۆخی پارێزگای موسڵ بە بەراوەرد لەگەڵ سێ پارێزگاکەی دیکە تۆزێ باشترە. دانیشتوانی گوندە سەرەکییەکانی پارێزگای موسڵ زیاتر مەسیحیی، عەرەبی سوونە، تورکمان و ئیزەدین چونکە کوردەکان لە دەیەی ١٩٧٠ لە ڕۆژئاوای موسڵ دەرکران ( لەوانەیە بە هۆی نزیکبوونیان لە سنووری سوریە بووبێت).

٤- ئێمە سێ ناوچەی گەورەمان لە پارێزگای سلێمانی بینی کە تێیاندا شارۆچکە بۆ نیشتەجێکردنی ئەو کوردانەی کە لە دەوروبەرەوە ڕاگوازراونەتەوە دروستکرابوو: ١- دۆڵی بازیان[٩٢] کە لە نێوان شاخەکانی نێوان سلێمانی و کەرکوک هەڵکەوتوە. ٢- دەشتەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی عەربەت کە لە باشووری سلێمانی هەڵکەوتوە ٣- تەپۆڵکەکانی ڕۆژهەڵاتی کەلار کە لە سەر چۆمی دیالە هەڵکەوتوە و خوارترین شوێن لە باشووری کوردستانی عێراقە. وادیارە دڕکی ئاسنی بە دەوری ئەم شارۆچکە نوێنانەدا ڕانەکێشراوە یا وەک ئوردوگاکان لە ژێر چاودێریدا نین. ئەڵبەتە سەرچاوەی بژێوی نەریتی کوردەکان کە کشتوکاڵە لەم شارۆچکانەدا بوونی نییە.

٥- دیپلۆماتە ئوسترالیاییەکان لە مانگی حوزەیران سێ گوندی نوێیان لە ڕۆژئاوای پارێزگای دهۆک لە نێوان ڕووباری دیجلە و سنووری سوریە لە ڕۆژئاوای فیشخابور[٩٣] بینیوە. ئەم گوندانە بە دڕکی ئاسنی گەمارۆ دراون و بە بورج لە ژێر چاودێریدان و ناوەندی ڕاگرتنی خەڵکن، بەڵام بنەماڵەکان بە شێوەی کوردەواری ژیان دەکەن ( ژنەکان جلی ڕەنگاورەنگی کوردیان لەبەرە، پیاوەکان پانتۆڵی کوردیان لەبەرە، قازەکان بە دەوروبەردا دەسوڕێنەوە و منداڵەکان لە ناو پەیین و سەریندا یاری دەکەن).

٦- ئێمە هیچ کەسێکی ڕۆژئاواییمان نەبینیوە کە لەم ساڵانەی دواییدا سەردانی باکووری هەولێر یان ڕۆژهەڵاتی ئامێدی[٩٤] کردبێت کە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی بارزانییە و لە پاڵ سنووری شاخاوی ئێران و تورکیەدا هەڵکەوتوە.

پێمانوایە کە عەشیرەتی سورچی و هەرکی کە هەر لە کۆنەوە لایەنگری رژێمی عێراق بوونە و لە نزیک باکووری هەولێر دەژین و هەروەها ئەو عەشیرەتانە کە دەوڵەتی عێراق وەک ئامرازێک کەڵکیان لێوەردەگرێت بۆ پاراســتنی کرێکارەکانی بەنداوی بێخمە[٩٥] لە ســەر رووباری زاپی گــەورە، نەکەوتونەتــە بەر شــاڵاوی کاولکردنــی بەرفراوانی گوندە کوردنشینەکان.

ئەم هەڵێنجاندنەی ئێمە لە ســەر بنەمای ئەو راستیەیە کە رژێمی عێراق هەر کاتێک بۆی برەخســێت بارزانیەکان لە ناو ئۆردوگاکانیاندا لــە ناو دەبات.[٩٦] ئێمە هیچ زانیاریەکمــان لە بارەی ئەوە نییە کە ناوچەی بارزانیەکان چەندە پێش لەم قۆناخی دواییە کاول کراوە، بەڵام روونە کە (بە گوێرەی لێدوانە گشــتیەکانی کوردەکان و ئەو راپۆرتانە کە لە تورکیەوە دێن) ئەو شــتانە کە پێشــتر لە باشــوور و باکووری رۆژئاوای کوردســتانی عێراق روویداوە ئێستا بە شێوەیەکی چڕوپڕ لە باکووری رۆژهەڵاتی کوردستانی عێراق روو دەداتەوە. ئێمە نەمانتوانی دروستکردنی شــارۆچکە نوێکان یان ئوردوگا زۆرەملێکان لە باکووری رۆژهەڵات ببینین، چونکە ســەفەرکردن تەنانەت لە هەولێر بۆ شەقڵاوا و رواندز تا ئێستا قەدەخە بووە.

٧- شــارەکانی موسڵ، دهۆک، هەولێر و ســلێمانی لە باکوور پڕ بــووە لە خەڵک و بە خێرایەکی زۆر بەرەو دەوروبەر بەرفراوانتر دەبن. موســڵ کە پێشتر دانیشــتووی کوردی زۆری نەبووە ئێستا پڕ بووە لە کورد، زێدەباری عەرەبە ســوننە و مەســیحیەکان کە لەمێژە لەوێ دەژین. پێمانوایە کە گەلێک لەو کوردانەی کە لە گوندەکانیان دەرکراون گوازراونەتەوە بۆ ئەم شارانە.

**گلاسپی**[٩٧]

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن، ٨٠٨٥

بابەت: ناوەرۆکی دیداری باڵوێزی ئەمریکا لەگەڵ جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق لە بارەی شاڵاوەکان دژی کوردەکان

ئەیلوولی ١٩٨٨

نهێنی

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە ئانکارا و ریاز

کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنە

لێژنەی نوێنەرایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە نیویۆرک و ژنێڤ

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٨٩٦١٨ی وەزارەتی دەرەوە بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغداد

١- رەش کراوەتەوە

٢- کورتە: لە کاتێکدا کە حەمدون[98] ئەوەی پشتڕاست نەکردەوە کە عێراق چەکی کیمیایی دژ بە کوردەکان بەکارهێنابێت، پێشبینی ئەوەی کرد کە شەڕی عێراق دژ بە کوردەکان لە چەند رۆژی داهاتودا کۆتاییپێدێت. ئەو لێدوانەی حەمدون دوابەدوای راوڕاوێژی عێراق و تورکیە لە سەرەتای ئەم هەفتەیەدا ئەنجامدرا. کۆتایی کورتە

٣- باڵوێزی ئەمریکا توانی سەرلەبەیانی ٤ی ئەیلوول چاوی بە حەمدون، جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق بکەوێت پاش گەڕانەوەی لە سەفەرەکەی یوگسلاڤی کە لەگەڵ تەها رەمەزان[99] کردبووی. باڵوێز ئاماژەی بەوە کرد کە ئەمریکا بایەخی زۆر بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق دەدات و ئاواتی ئەوەیە کە پەیوەندی نزیکتری لەگەڵ عێراق هەبێت. باڵوێز هەروەها جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە پەیوەندی باشتری ئەمریکا لەگەڵ وڵاتانی دیکەی ناوچە، وەک ئێران، لە سەر حیسابی پەیوەندیەکانمان

لەگـــەڵ عێراق نابێت. بەهەرحـــاڵ هەروەها کە باڵوێزی ئەمریکا لە بەغداد چەند رۆژ پێش لای زەهاوی[١٠٠] جەختی لە ســـەر کردبوەوە، شـــالاوەکانی عێـــراق دژ بە کوردەکان لەوانەیە توانایی ئەمریکا کەم بکاتەوە بۆ ئەوەی هاوکاریەکانی لەگەڵ عێراق (بەو شێوەیە کە عێراق و ئەمریکا دەیانەوێت) بەهێزتر بکات. ئێمە نەتەنها دەربارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق، لەوانە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی کوردەکان و راگوازتنی زۆرەملێی هـــەزاران کەس لە کوردەکان نیگەرانین بەڵکوو دەربارەی گوشـــارەکان لە ســـەر تورکیە کە هاوپەیمانی ئێمەیە لە ناتۆدا نیگەرانین چونکە لەوانەیە ببێتەهۆی ناسەقامگیربوونی ناوچە لە داهاتوودا.

٤- باڵوێـــزی ئەمریـــکا جەختی لە ســـەر ئەوە کردوەتـــەوە کە ئەم مەســـەلەیە بە واتای دەســـتێوەردانی ئەمریکا لە کاروباری ناوخۆی عێراق نییـــە و ئێمە باش ئـــاگاداری ئەوەین کە راپەڕینـــی چەکداری (کوردەکان دژ بـــە دەوڵەتی عێراق- وەرگێر) بەردەوامەو ئێران (کە هێشـــتا لەگەڵ عێراق لە شـــەڕدایە[١٠١] یارمەتی کوردەکان دەدات، بەلام شـــالاوی عێراق دژ بـــە کوردەکان پەیوەندی بە کاروبـــاری ئەمریکا و هەروەها کۆمەڵگای نێونەتەوەییەوە هەیە. باڵوێـــز هەروەها ئامارەی بەوە کردوە کە هەفتەی پێشـــوو سەدام حوسەین، ســـەرۆک کۆماری عێراق قسەی بۆ باڵوێزەکانی ٥ دەوڵەتی دۆســـتی عێراق کردوە و وتویەتی دۆســـتەکان دەبێ پێکەوە سەمیمی و شەفاف بن کەوابوو بڕیارەکانی سەرۆک کۆمار سەدام حوسەین ســـەبارەت بە شـــالاوەکانی دژ بە کوردەکان نیگەرانی ئێمە سەبارەت بە داهاتووی پەیوەندیە دوو لایەنەکانمان قوڵتر دەکات.

٥- لـــە کۆتاییـــدا باڵوێزی ئەمریکا ئامارەی بـــەوە کرد کە کۆمەڵگای نێونەتەویی گلەو گازندەی زۆری لە عێراق هەیە و ئەوە دەربڕی نیگەرانییە راستەقینەکانی کۆمەڵگای نێونەتەوەییە ئەو کێشانە کە کوردەکان لەگەڵی روبەروو بوونەتەوە بووە بە بابەتی سەرەکی ئاژانسی دەنگوباسی جیهانی BBC. لە لایەن خۆمانەوە ئێمە تا ئێســـتا نەمانویســـتوە دەربارەی ئەو مەسەلەیە لێدوانی گشتی بدەین و ویســـتومانە سەرەتا نیگەرانییەکانمان

راستەوخۆ لەگەڵ حەمدون باس بکەین و بەتەواوی حیساب بۆ وەڵامی عێراق لەو پەیوەندیەدا بکەین و دیپلۆماسی گشتی خۆمان لە بارەی ئەم مەسەلە گرنگە پێشبخەین.

٦- پاشان حەمدون بە تێروتەسەلی لە بارەی مێژووی راپەڕینی کورد قسەی کرد و وتی عێراق بە هۆکەلی مێژوویی دەرک بە نیگەرانیەکانی بریتانیا دەکات، بەڵام بەهەرحاڵ جیهان بە تەواوی ئاگاداری ئەوە نیە کە تەنانەت پێش لە شاڵاوەکەی ئێستا دژ بە کوردەکان، هەندێ لە ناوچەکانی کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عێراقدا نەبووە و کەس نەیتوانیوە بۆ ئەو ناوچانە بێ مەترسی سەفەر بکات. هەروەها وتی دەوری ئێران لەو مەسەلەیەدا بۆ هەمووان ئاشکرایە و ئێستا یەکێ لە رێبەرە کوردەکان، تاڵەبانی، بە ئاشکرا باسی دابڕانی کوردەکان لە عێراق دەکات.

٧- لە بارەی تورکیە، حەمدوون لە درێژەی قسەکانیدا وتی کوردەکان ئێش و ئازاریان بەدەست کەلەڕەقی خۆیانەوە بینیوەو دەبێ هەر دوو لای سنوور (مەبەستی عێراق و تورکیەیە -وەرگێڕ) دڵنیا بن کە سنوور لەو کەسانە پاک بووەتەوە کە بیانەوێت کێشە ساز بکەن. حەمدون وتی لە کۆبوونەوەیەکدا لە ٣٠ی ئاب لە بەغداد بەشداری کردوە کە جێگری وەزیری دەرەوەی تورکیە، نوزهەت خاندمیر[١٠٢] لەگەڵ راوێژکارە سەربازیەکانی تورکیە تێیدا ئامادە بووە و خاندمیر بە تێروتەسەلی بۆ ئەفسەرەکانی سوپای عێراق قسەی کردووە و هەر دوو لا بە تێروتەسەلی ئاڵوگۆڕی بیروڕایان کردووە. حەمدون لە سەر ئەو بڕوایە بوو کە شەڕ ( لە گەڵ کوردەکان ) لە ماوەی ئەم چەند رۆژەدا کۆتاییپێدێت.

٨- باڵوێزی ئەمریکا نیگەرانییەکانی ئێمەی دووپات کردەوە و لەو پەیوەندیەدا جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە عێراق چەکی کیمیایی (دژی کوردەکان) بەکارهێناوە. باڵوێزی ئەمریکا بە حەمدونی وت کە عێراق لانیکەم لە بواری پەیوەندییە گشتییەکاندا کێشەی گەورەی هەیە و ئاماژەی بەوە کرد کە ئەگەر عێراق چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکار نەهێناوە و کوردەکانی بۆ ئوردوگا زۆرەملیەکان رانەگوازتوەتەوە، بۆ

ئاسانکاری نەکات بۆ ئەوەی کەسانی پەیوەندیدار لە وڵاتانی دیکەوە (سەر بە ڕێکخراوە نێونەتەوەیەکان، لیژنە دیپلۆماتیکەکان یا میدیاکان) سەردانی شـــار و ناوچە کوردنشـــینەکان بکەن. حەمدون وتی ئێستا ئەوە مومکین نیە بەڵام دەوڵەتی عێراق پێشتر هەنگاوێکی وای تاوتوێ کردوە. حەمدون ئـــەوەی دووپات کردەوە کە بە بڕوای ئەو، شـــەڕ (لەگەڵ کوردەکان) لە ماوەی چەند ڕۆژی داهاتوودا کۆتایی پێدێت.

٩- هەڵســـەنگاندن: حەمدون بە وریاییەوە خۆی بوارد لە باســـکردن یان دانپێدانان بە مەسەلەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی (دژی کوردەکان). کاتێک کە باســـی ئەوەی کرد کە شـــەڕ بەمزوانە کۆتاییپێدێت، حەمدون بەو کەســـەی کە قســـەکانی تۆمار دەکرد وتی ئـــەو زانیاریە لەرادەبەدەر هەستیارە. لە کاتێکدا کە بە بۆچوونی ئێمە دیپلوماتگەلێک وەک حەمدوون بە تەواوی ئـــاگاداری ئەوەن کە عێراق بە هۆی تاکتیکە دڕندانەکانی دژی کوردەکان خەســـارێکی نێونەتەوەیی قەرەبوونەکراوی لێدەکەوێت، لەمێژە روون بوەتەوە کە ســـەدام بڕیاری داوە ئـــەو کارانە جێبەجێ بکات کە بە بڕوای سوپای عێراق بۆ ئارامکردنەوەی باکوور پێویستە. کەوابوو زۆرترین کارێک کە حەمادی بۆ وەڵامدانەوە بە نیگەرانیەکانی ئێمە لەدەســـتی دێت بیکات ئەوەیە کە قســـەکانی ئێمە بگەیەنێت بە سەدام (کە بە دڵنیاییەوە بە زووترین کات ئەوە دەکات) و بە شـــێوەیەکی نهێنی ئاگادارمان بکاتەوە کە شەڕ بەمزوانە کۆتایی پێدێت.

١٠- باڵوێزی عێراق لە ئەمریکا، ئەلئەنباری[١٠٣]، ئێســـتا لە بەغدادە و دەیەوێت لەگەڵ (سەعدون) حەمادی[١٠٤]، وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق، ڕۆژی ٨ی ئەیلوول سەردانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بکات. ئێمە هەوڵ دەدەیـــن ئەم بۆچونانەی خۆمان بۆ ئەلئەنبـــاری دووپات بکەینەوە پێش ئەوەی بەغداد بەجێبێڵێت و لە تیلیگرامی مانگی ئەیلوولدا پێشـــنیاری ئـــەوە دەکەین کە وەزارەتی دەرەوە مەســـەلەی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی ڕاستەوخۆ لەگەڵ حەمادی باس بکات[١٠٥].

**گلاسپی**

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە ستۆکهۆڵم بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٢٤١٠

بابەت: دوایین زانیارییەکانی جەلال تاڵەبانی، ڕێبەری کورد لە بارەی شاڵاوەکانی عێراق دژی کوردەکان

تشرینی یەکەمی ١٩٨٨

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانـــەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لـــە ئانکارا، بەغداد، کۆپینهاگن، هلبسینکی، ڕەیکجاویک[١٠٦]

UNCLAS STOCKHOLM

١- جەلال تاڵەبانی، ڕێبەری یەکێتی نیشـــتمانی کوردستانPUK)) لە میانەی سەفەرەکەی بۆ هەندێ لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی، سەردانی سوئیدی کردوە. تاڵەبانی بە ڕاگەیاندنە گشـــتییەکانی سوئیدی وتووە کە ٥ هەزار گوندی کوردنشین لە کوردستانی عێراق خاپور کراوە. تاڵەبانی هەروەها بە هەواڵنێرەکانی وتووە کە لە کاتی ئاگربەستی ئێران و عێراق، دەوڵەتی عێراق دەســـتی ئاوەڵا بووە بۆ ئەوەی سەرجەم هێزە چەکدارەکانی دژی باکووری وڵات تەیار بکات کـــە کوردەکان ناوچەی ئازادکراوی گەورەیان تێدا پێکهێناوە. تانکەکانی عێراق لە مانگی ئابی ئەمســـاڵدا هەوڵیانداوە هێرش بکەنە سەر ئەم ناوچانە، بەڵام کاتێک کە هێرشەکەیان لە ئەنجامی خۆڕاگری پێشـــمەرگەدا شکســـتی هێناوە فڕۆکەکانـــی عێراق بە چەکی کیمیایی ناوچەکەیان بومباران کردوە. بە وتەی تاڵەبانی دوایین هێرشی کیمیایی ڕۆژی ٥ی تشرینی یەکەم لە نزیک شارۆچکەی دوز[١٠٧]لە نێوان بەغداد و کەرکووک ڕوویداوە.

٢- تاڵەبانی هەروەها بە ڕاگەیاندنەکانی وتووە کە کاتێک کە ٢٠٠ هەزار کورد بەرەو سنووری تورکیە ئاوارەبوونە، گەلێک لە ڕێکخراوە فریاگوزارییە نێونەتەوەییەکان کاردانەوەیان نیشانداوە و هەوڵیانداوە یارمەتی بنێرن بۆ ئاوارەکان، بەڵام دەوڵەتی تورکیە نەیهێشـــتوە ڕێکخراوە فریاگوزارییەکان ســـەردانی ئۆردوگاکانی ئاوارەکان بکەن. تاڵەبانی وتوویەتی تورکیە دوو

رووی هەیـــە، لە لایەکەوە دەیەوێت لەڕێگای قبوڵکردنی ئاوارە کوردەکان خۆی وەک خێرخواز بە وڵاتانی ڕۆژئاوایی نیشان بدات و لە لایەکی دیکەوە بە دڵنیایەوە وتویەتی کە هیچ ئاســەوارێکی بومبی کیمیایی بە لاشـــەی قوربانیانـــی گازی کیمیایـــەوە نەبینیوە، کەوابوو تورکیە بەمشـــێوەیە یارمەتی ڕژێمی عێراق دەدات.

تاڵەبانـــی بانگەشـــەی ئەوەی کردوە کە بـــەردەوام زانیارییەکانی لە ڕێگای پەیوەندیە تەلەفۆنییەکانی لەگەڵ بەرەی کوردســـتان لە ئێرانەوە نوێ دەکاتەوە و ڕاگەیاندنەکانی ســـوئیدی ئاگادار کردوەتەوە کە ئێران ١٥ی تشرینی یەکەم ڕایگەیاندوە کە ئەگەر ئاوارە کوردەکان لە تورکیە بچن بۆ ئێران، دەوڵەتی ئێران پێشوازیان لێدەکات.

٣- تاڵەبانی بە ڕاگەیاندنە گشـــتیەکانی وتووە کە کوردەکان ئێســـتا لـــە چـــاو ١٩٧٥ دۆســـتی زۆر زیاتریـــان هەیە کە یەکێ لەم دۆســـتە نوێیانـــە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە کـــە توندتر لە وڵاتانی دیکە کەڵکوەرگرتنی عێـــراق لە چەکی کیمیایی شـــەرمەزار کردوە. تاڵەبانی بەتایبـــەت ئاماژەی بە ڕاپۆرتێکـــی ئەنجومەنی.پیرانی ئەمریکا لە بارەی ئـــاوارە کوردەکان لە تورکیە کـــردووە کە تێیدا بێ هیچ گومانێک ڕوونی کردوەتەوە کە ئاوارەکان بونەتە قوربانی چەکی کیمیایی عێراق.

نیوێل[١٠٨]

## له وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌، واشینگتۆن بۆ:
## باڵوێزخانه‌ی ویلایه‌ته‌ یه‌كگرتوه‌كانی ئه‌مریكا له‌ به‌غداد

بابه‌ت: راپۆرتی ٤٥ی كۆمیسیونی مافی مرۆڤی نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتوه‌كان درباره‌ی عێراق

كانوونی یه‌كه‌می ١٩٨٨

بۆ زانیاری:

لێژنـــه‌ی نوێنه‌رایه‌تی ویلایه‌تـــه‌ یه‌ككرتوه‌كانی ئه‌مریـــكا له‌ نه‌ته‌وه‌ یه‌ككرتوه‌كان له‌ نیۆیۆرک و ژنێڤ

٥- UNHRC (كومیســـیونی باڵای نه‌ته‌وه‌ یه‌ككرتوه‌كان بۆ كاروباری په‌نابه‌ران) دوو نامه‌ی له‌ به‌رواری ٢/٥/٨٨ ده‌رباره‌ی پێشێلكرانی مافی مـــرۆڤ له‌ عێراق ناردوه‌ (بۆ وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌). له‌ درێژه‌دا كورته‌یه‌ك له‌ ناوه‌رۆكی ئه‌م نامانه‌ ده‌خرێته‌ڕوو. وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ داواتان لێده‌كات هه‌ر زانیاریه‌كتان ده‌رباره‌ی ئه‌م بانگه‌شـــانه‌ له‌ په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ پێشێلكرانی مافی مرۆڤدا هه‌یه‌ بۆمانی بنێرن بۆ ئه‌وه‌ی راســـتبوونی ئه‌و بانگه‌شـــانه‌ هه‌ڵبســـه‌نگێنین (ئه‌گه‌ر باڵوێزخانه‌ی ئه‌مریكا له‌ عێراق پێشتر زانیاری ده‌ربـــاره‌ی ئه‌م بابه‌ته‌ بۆتـــان ناردووه‌ ژماره‌ی نامه‌كه‌مـــان بۆ بنێرن). وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ هه‌روه‌ها ده‌یه‌وێت بزانێت ئایا ده‌وڵه‌تی عێراق ده‌یه‌وێت وه‌ڵامی ئه‌م بانگه‌شانه‌ بداته‌وه‌ و ئه‌گه‌ر ده‌یه‌وێت وه‌ڵام بداته‌وه‌، وه‌ڵامه‌كه‌ی به‌ چی شێوه‌یه‌ك ده‌بێت.

له‌ كورته‌ی راپۆرته‌ نهێنیه‌كه‌ی UN به‌ ژماره‌ ٢٨٦ به‌رواری ٢/٥/٨٨ دا هاتـــوه‌: كۆمه‌ڵـــه‌ی كورد له‌ هۆڵه‌ند له‌ نامه‌یه‌كـــدا له‌ به‌رواری ٢٩ی ئاداری ١٩٨٨ بانگه‌شـــه‌ی ئه‌وه‌ی كردوه‌ كه‌ ده‌وڵه‌تی عێراق كورده‌كانی به‌ چه‌كی كیمیایی به‌ كۆمه‌ڵ كوشـــتوه‌ و خه‌ڵكی ئه‌شـــكه‌نجه‌ كردووه‌ و خه‌ڵكی به‌ زۆره‌ملێ راگوازتوه‌ته‌وه‌. كۆمه‌ڵه‌ی كورد له‌ هۆڵه‌ند داوای له‌ نه‌ته‌وه‌ یه‌ككرتوه‌كان كردووه‌ له‌و مه‌سه‌له‌یه‌ بكۆڵێته‌وه‌.

بانگه‌شه‌ی ئه‌وه‌ ده‌كرێت كه‌ له‌ نیسانی ١٩٨٧ه‌وه‌ هێزه‌كانی سوپای

عێراق  بە چەکی کیمیایی هێرشیان کردوەتە سەر ٢٨ گوند و شارۆچکەی کوردنشـــین لە پارێزگاکانی هەولێر، ســـلێمانی و دهۆک کە لە ئەنجامدا ١٣٠ کەســـی مەدەنی کوژراون و زیاتر لە ٣٥٠ کەسی دیکە بریندار بوونە کە زۆربەیان ژن و منداڵن[١٠٩]. لە دوایین هێرشی عێراق لە ١٩٨٨ بۆ سەر شارۆچکەی هەڵەبجە ٥ تا ٧ هەزار کەس  کوژراون.

هەروەها بانگەشەی ئەوە کراوە کە لە ساڵی ١٩٧٠وە دەوڵەتی عێراق سیاســـەتی  راگوازتنەوەی زۆرەملێی  خەڵکی کورد و کاولکردنی گوندە کوردنشـــینەکانی جێبەجێ کردوە. لە نێوان ١٩٧٥ و ١٩٧٩  زیاتر لە ٢ هەزار گوند لە سەر سنووری باکوور و رۆژهەڵاتی عێراق (سنووری تورکیە و  ئێـــران) کاول  کراون و نزیکـــەی  ٣٠٠ هەزار کەس گوازراونەتەوە بۆ ئوردوگاکانی باشـــووری رۆژئاوای عێراق. لە نیســـانی ١٩٨٧ەوە  زیاتر لـــە ٧٠٠ گونـــدی کوردنشـــین کاول کراون و زیاتر لـــە ١٤٠ هەزار کەس گوازراونەتەوە. ئەم خەڵکە لە کاتی راگوازتنەوەدا ئەشـــکەنجە دراون و هەڵسوکەوتی خراپیان لەگەڵدا کراوە.

لە راپۆرتێکی دیکەی رێکخـــراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی لە بەرواری ٦ی گوڵانی ١٩٨٨دا بانگەشەی ئەوە کراوە کە کە مافی مرۆڤ لە عێراق بە شـــێوەیەکی بەرفراوان پێشـــێلکراوە و بەتایبەت ئاماژە بە کوشـــتن، بێسەروشوێنکردن، ئەشـــکەنجەکردن، دەستبەسەرکردنی سەرەڕۆیانە و دادگاییکردنی نادادپەروەرانە کراوە و داوا لە نەتەوە یەکگرتوەکان کراوە هەموو هەنگاوێک بگرێتەبەر بۆ ئەوەی پێش لەو پێشـــێلکاریانە بگرێت. رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی بۆ سەلماندنی بانگەشەکانی، راپۆرتێکی ١٣ لاپەڕەیی لەگەڵ ٣ هاوپێچی دیکە کە بە گشتی ٥٣ لاپەڕەیە، ناردووە بۆ نەتەوە  یەکگرتوەکان.

بەگوێرەی راپۆرتەکان ســـەدان کەس بە هۆی بیروباوەڕی سیاســـی دەستبەســـەر کـــراون بێ ئـــەوەی هـــۆکاری دەستبەســـەرکردنەکەیان پێڕابگەیندرێـــت و بـــێ ئەوەی دەستبەســـەرکردنیان هیـــچ بنەمایەکی

یاســـایی هەبێت. دەستبەسەرکراوەکان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بە تەنیا رادەگیردرێن و دەســـتیان بە پارێزەر، خزم و کەســـوکار یان پزیشـــک ناگات و پاش دادگاییکردنێکی کورت ژمارەیەکی زۆریان حوکمی قورسیان لەسەر دەدرێت وەک ســـزای لەسێدارەدان. لە ماوەی دەستبەسەرکردنی درێژخایەنــدا کە دەستبەســـەرکراوەکان لە کەســـانی دیکـــە دابڕاون؛ دەستبەسەرکراوەکان، لەوانە منداڵەکان بێسەروشوێن کراون.

لـــە کۆتایی ١٩٨٥، ٣٠٠ منداڵ و لاوی کوردی خەڵکی ســـلێمانی لە تۆڵـــەی چالاکیە سیاســـیەکانی بنەماڵەکەیان لە لایەن دەوڵەتەوە وەک بارمەتە دەستبەسەرکراون و لە سەرەتای کانوونی دووەمی١٩٨٧ لانیکەم ٢٩ کەسیان بێ دادگاییکردن لەسێدارەدراون و چارەنووسی زیاتر لە ٢٥٠ کەسی دیکە هێشتا دیار نییە بە هەمان شێوەی ئەو ٨ هەزار بارزانییە کـــە کە لە ئابی ١٩٨٣ لـــە لایەن هێزەکانی ئاسایشـــەوە بە تۆمەتی پەیوەندی سیاســـی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانەوە دەستبەسەر کران و چارەنوسیان هێشتا دیار نییە و باس لەوە دەکرێت کە زۆربەیان لەسێدارەدراون(١١٠).

لە نێوان ئاب و تشـــرینی دووەمی ١٩٨٥ ژمارەیەکی زۆر لە زندانیانی سیاسی و ئەوانەی لە سوپای عێراق هەڵاتوون لە بەندیخانەی ئەبووغرێب و موسل لەسێدارەدراون، لەوانە تەنها لە هەفتەی یەکەمی تشرینی دووەمی ١٩٨٥، ٦٠ زیندانی لە بەندیخانەی ئەبوغرێب لە بەغداد لەســـێدارەدراون. لـــە ٣٠ و ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٧ زیاتر لـــە ١٥٠ زیندانی، لەوانە مێرمنداڵی تەمەن ١٤ تا ١٧ ســـاڵ لە لە بەندیخانەی ئەبووغرێب بە گولە کوژراون کە هەندێکیان بە زیندان حوکم درابوون. لە هاوپێچی ژمارە ٢ی راپۆرتەکەی رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی ئاماژە بە ناونیشانی ئەم قوربانیانە کراوە.

هەروەهـــا ئەندامانی گروپە کوردەکانی نەیـــاری حکومەت و خزم و کەســـوکارەکانیان لەســـێدارەدراون. بۆ نموونە ٣٦٠ کەس لە تشرینی

دووەم و کانوونی یەکەمی ١٩٨٧ بە شـــێوەی جیاجیا لەسێدارەدراون کە زۆربەیان زیندانی سیاســـی کورد بوونە و ١٧ کەسیان منداڵی ١٤ تا ١٧ ساڵ بوونە. لە رووداوێکی دیکەدا لە ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٨٧ هێزە چەکدارەکانـــی عێراق ماڵ بە ماڵیان پشـــکنیوە و ١٠٠ تا ١٥٠ کوردیان لەسێدارەداوە و لانیکەم ٤٠ کوردی نەیاری حکومەت لە کۆتایی ١٩٨٧ لە لایەن هێزەکانی ئاسایشەوە بە دەرمانی مشک کوژراون.

**شۆڵتز**

**لەلایەن ریچارد مورفی(١١١) لە NEA، ئالان لارسۆن(١١٢) لە EB، ریچارد شیفتێر(١١٣) لە HA بۆ: وەزیری دەرەوە**

**لە رێگای:**

**د - بەرێز وایتیند(١١٤)**

**پ - بەرێز ئارماکۆست(١١٥)**

**ی - بەرێز والیس(١١٦)**

بابەت: پەیوەندییە بازرگانییەکانی ئەمریکا و عێراق و پەیوەندی ئەو مەسەلەیە بە سەرکوتی کوردەکانەوە

٢٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨

بابەتێک بۆ بڕیاردان:

ئایـــا بانکی هەنـــاردە و هاوردەکردن دەبێ گارانتـــی هەناردەکردنی مامناوەند بۆ عێراق درێژ بکاتەوە.[١١٧] NEA و EB[١١٨] پێیانوایە کە نابێ وەزارەتی دەرەوە دژایەتی سیاســـی خۆی لەگەڵ گارانتی هەناردەکردنی مامناوەند بۆ عێراق دەربببڕێت. HA[١١٩] پێیوایە کە عێراق لە ساڵی ١٩٨٨ بە شـــێوەی جدی مافی مرۆڤی پێشـــێل کردووە و دەبێ دژی زیادکردنی کریدیت[١٢٠] لە لایەن EXIM BANKی ئەمریکا بە عێراق رابوەستین.

## هۆكاره سەرەكییەكان:

ئێستا EXIM BANK خزمەتگوزاری بیمەی كورتخایەن بە عێراق پێشكەش دەكات كە بە ڕێژەی ٢٠٠ ملیون دولار سنووردارە. كارمەندانی EXIM BANK پێیانوایە كە بۆ ئەوەی بە شێوەیەكی كاراتر لە عێراق كار بكەن، EXIM BANK دەبێ كریدیتی مامناوەند بدات بە عێراق و بە شێوەی فەرمی كریدیتی كورتخایەن بۆ عێراق درێژەی هەبێت. یەكێ لە ڕێگاكان ئەوەیە كە ١٠٠ ملیۆن دولار زیاد بكەین بە سەر كریدیتی كورتخایەنی ١٠٠ ملیۆن دولاری لەگەڵ ٥٠ میلیۆن دولار كریدیتی مامناوەندی زیادە كە بە گشتی دەبێت بە ٢٠٠ ملیۆن و هەر جارێك ٥٠ ملیۆنی بە شێوەی كورتخایەن دەگەڕێتەوە. ئەم ڕێگایە كە دەبێ قۆناخ بە قۆناخ زیاد بكرێت دەبێتە هۆی ئەوەی كە عێراق بەردەوام قەرزەكانی بە EXIM BANK بداتەوە و عێراق هان دەدات كە بە كریدیتی كورتخایەن كاڵای ئەمریكایی هاوردەی وڵاتەكەی بكات.

## هۆكاره یاساییەكان:

بە گوێرەی یاسا، EXIM BANK خۆی دەبێ لە بارەی هۆكارە مادی و بازرگانییەكان بڕیار بدات. تەنها ناوێزەیەك (ئیستسنا) كە لەم پەیوەندییەدا هەیە ئەوەیە كە سەرۆك كۆمار لە چی شوێنێك ئەم كردەوانە بە هۆكارێك دژ بە سیاسەتی ویلایەتە یەككگرتوەكانی ئەمریكا لە پەیوەندی لەگەڵ مەسەلەگەلێك وەك مافی مرۆڤ دەزانێت. ئێوە بە گوێرەی فەرمانی E-O١٢١٦٦ی ١٩ی كانوونی یەكەمی ١٩٧٠ دەسەڵاتی ئەوەتان هەیە كە لەم پەیوەندییەدا بڕیار بدەن. هەروەها بە گوێرەی فەرمانی E-O١٢١٦٦ پێش لە بڕیاردان لەم پەیوەندییەدا ئێوە دەتوانن لەگەڵ وەزارەتی بازرگانی و سەرۆكی ئاژانسە پەیوەندیدارەكانی دیكە ڕاوێژ بكەن.

بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخەكە «L» پێیوایە كە لە جێی خۆیدا نییە كە وەزارەتی دەرەوە پێشنیاری ئەوە بكات كە EXIM BANK حیساب

بۆ مەســـەلەی مافی مرۆڤ بکات مەگەر ئەوە کـــە ئێوە پاش راوڕاوێژی پێویســـت، بڕیاری خۆتان لەو پەیوەندییەدا دابێت. ئەم بڕیاردانە دەبێ وەڵامی ئەو پرســـیارە بداتەوە کە ئایا وەزارەتی دەرەوە پێشنیاری ئەوە دەکات کـــە EXIM BANK کریدیت بـــە عێراق نەدات یان بڕیاردانی EXIM BANK وەدوا بخرێـــت. بەهەرحاڵ «L» پێیوانیە کە بڕیاردانی رەســـمی پێویســـت بکات بۆ ئەوەی لە بارەی مەســـەلەکانی پەیوەندیدار بە مافی مرۆڤ (کـــە لە لایـــەن وەزارەتی دەرەوە تاوتـــوێ دەکرێت ئەگەر EXIM BANK داوای هەڵوێســـتی وەزارەتی دەرەوە بکات یان وەزارەتی دەرەوە داوا لـــە EXIM BANK بکات بڕیارەکەی بۆ ماوەیەکی کورت وەدوا بخات) ئاڵوگۆڕی بیروڕا لەگەڵ ستافی ئاسایی EXIM BANK بکرێت.

## بیروبۆچوونەکانی NEA و EB

NEA و EB پێیانوایـــە کـــە کۆمەڵێـــک هۆکاری گرنگ و هەســـتیار هەیە بۆ ئەوەی ئێســـتا لە ســـەر بنەمای هۆکار و رێوشوێنە ئابووری و بازرگانییەکان دەربارەی ئەم مەســـەلەیە بڕیـــار بدرێت. عێراق بازارێکی ســـەرەکییە (بۆ ئەمریکا) و ئەمریکا دەتوانێت لە چەند ساڵی داهاتوودا بایی چەندان بلیۆن دولار کاڵا هەناردەی عێراق بکات بۆ ئاوەدانکردنەوەی عێراق (کـــە لە ئەنجامی شـــەڕی ئێـــران و عێراقدا زیانـــی لێکەوتووە). کومپانیا ئەمریکییەکان پێویســـتیان بە گارانتـــی کریدیتی درێژخایەنتر هەیـــە بۆ ئەوەی بتوانن لەو دەرفەتە بازرگانییە نوێیانە کەڵک وەربگرن کە لە ئەنجامی کۆتاییپێهاتنی شـــەڕی کەنداودا رەخســـاوە. بۆ نموونە کۆمپانیـــای OCCIDENTAL PETROLEUM بایـــی ٥٠٠ میلیۆن دولار بۆ پـــرۆژەی پەرەپێدانی گۆڕەپانەکانی نەوت ســـەرمایەگوزاری کردوە. بێ گارانتـــی EXIM BANK، کومپانیای OCCIDENTAL PETROLEUM ناچار دەبێت پشت بەو بانکە بیانیانە ببەستێت کە گارانتی مادییان هەیە.

پشـــتیوانی مادی EXIM BANK، یارمەتییەکی گـــەورەی ئابووری و

سیاســـی بۆ کومپانیا ئەمریکییەکان دەڕەخســـێنیت بۆ ئەوەی بتوانن لە عێـــراق بازرگانی بکـــەن. هەم کومپانیـــای WESTENGHOUSE و هەم کومپانیـــای OCCIDENTAL PETROLEUM وەک هۆکارێکـــی ســـەرەکی ســـەیری EXIM BANK دەکـــەن بۆ ئەوەی بتوانن لەگـــەڵ کومپانیاکانی دیکەدا ململانێ بکەن و کومپانیاکانی دیکەی ئەمریکاش بە هەمان شێوە سەیری EXIM BANK دەکەن.

ســـەرکردایەتی عێراقیش دەیەوێت پەیوەندیە بازرگانییەکانی لەگەڵ ئەمریـــکا پەرەپێبدات. پەیوەندییـــە بازرگانییـــەکان دەتوانێت رێگا بۆ باشـــتربوونی پەیوەندییە سیاسیەکانیش خۆش بکات. عێراق گەورەترین بازاری کشـــتوکاڵی ئێمە بووە لە جیهانی عەرەبدا و زیاتر لە یەک بلیۆن دولار کریدیتـــی تەنها لە ســـاڵی ١٩٨٨دا لـــە COMODOTIES CREDIT CORPORATION(CCC) وەرگرتووە و چاوەڕوان دەکرێت کاڵای ئەمریکایی هەناردەی عێراق بکرێت.

## بیروبۆچونەکانی نووسینگەی HA

بە بۆچوونی HA (نووســـینگەی مافی مرۆڤ لـــە وەزارەتی دەرەوە) بە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق بە شـــێوەیەکی درندانە لەگەڵ بەشـــێک لە دانیشـــتوانی کوردی عێراق هەڵســـوکەوتی کردووە، ئێمە دەبێ دژی پێشـــنیاری زیادکردنی ئاســـانکاری کریدیت لەلایـــەن EXIM BANK بە عێراق رابوەســـتین. لە راستیدا سەرکوتکردنی کوردەکان هاوکاتە لەگەڵ ســـەرکوتی خەڵکی عێراق بە گشتی لەلایەن سەدام حوسەینەوە. رژێمی ســـەدام حوسەین نەیارە راستەقینە و ناڕاستەقینەکانی خۆی بە شێوەی نایاسایی لەســـێدارە دەدات و دەزگای ترسناکی هەواڵگری کە لە هەموو شـــوێنیکدا ئامادەیە خەڵک ئەشـــکەنجە دەکات و هـــەوڵ دەدات هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگا کۆنترۆڵ بکات.

HA هەروەهـــا ئاماژە بەوە دەكات كە نزیكـــەی ٤ مانگ لەمەو پێش دەوڵەتی عێراق شـــاڵاوێكی بەرفراوانی ســـەربازی ئەنجام داوە كە تێیدا چەكی كیمیایی دژی بەشێك لە هاووڵاتییانی كوردی خۆی بەكارهێناوە. زیاتر لە ٦٠ هەزار كورد لە عێراق هەڵاتوون كە ٤٠ هەزاریان كە زۆرتر ژن و منداڵن لە نێو ئوردوگاكانی ئاوارەكان لە توركیەدا ماونەتەوە. ویلایەتە یەككگرتوەكانـــی ئەمریكا دەوری ســـەرەكی گێڕاوە لە شـــەرمەزاركردنی كردەوەكانی عێراق و دەستپێشـــخەر بووە بۆ هەوڵدان بۆ بەڕێوەچوونی كۆنفرانســـێكی نێونەتەوەیی لە بارەی چەكـــە كیمیاییەكان كە بڕیارە لە سەرەتای ١٩٨٩ لە پاریس بەڕێوەبچێت[١٢١]

HA پێیوایـــە كـــە بەكارهێنانی گازی كیمیایی لە كاتی هێرشـــكردن بۆ ســـەر گوندە كوردنشـــینەكان تەنها یەكێ لە نموونە راستەقینەكانی شـــاڵاوە گەورە و دڕندانەكەی دەوڵەتی عێراق دژی كوردەكانە. ستافی ئەنجومەنی پیران بەم شێوەیە لە بارەی ئەو مەسەلەیە راپۆرتیداوە:

«عێراق سیاسەتێكی سەربازیی بەڕێوە دەبات بۆ ئەوەی كوردستانی عێراق چۆڵ بكات. تایبەتمەندییەكانی ئەم سیاسەتە بریتین لە: ١- روخاندنی گوندەكان و شـــارۆچكەكان لە سەراسەری كوردستان ٢- نیشتەجێكردنی كـــوردەكان لـــە ناوەندە نوێكان كە لە ژێر كۆنترۆلی ســـەربازیدا بن. ٣- دوورخســـتنەوەی كوردەكان بۆ ناوچەكانی دەرەوەی كوردســـتان و ٤- بەكارهێنانـــی تاكتیكە تیرۆریســـتییەكان، لەوانە چەكە كیمیاییەكان، بۆ دەركردنی خەڵك لە زێدی خۆیان و چۆڵكردنی ناوچە».

خاتون گلاســـپی، باڵوێزی ئەمریكا لـــە عێراق لە تیلیگرامێكدا كە لە ٢٨ی تشـــرینی دووەم ( بۆ وەزارەتی دەرەوەی ناردووە) وردەكارییەكانی سەردانەكەی بۆ كوردســـتان باس كردووە و پشتڕاستی كردوەتەوە كە ژمارەیەكـــی زۆر لە گوندەكان خاپوور كراون و دانیشـــتوە كوردەكانیان راگوازراونەتەوە. بە گوێرەی هەڵســـەنگاندنی خاتون گلاسپی، زیاتر لە ٤٠٠ هەزار كەس راگوازراونەتەوە و ئاوارە بوونە.

ڕژێمی ســـەدام حوســـەین لەمێـــژە وەك یەكـــێ لـــە دڕندەترین و

ســـەرکوتکارترین دەوڵەتانی جیهان ناسراوە بەڵام کردەوەکانی لە ١٩٨٨ زۆر لـــە کردەوەکانی پێشـــتری توندتر بوو و بوو بـــە توندترین جۆری پێشـــێلکاری مافی مـــرۆڤ لە دەیەی ١٩٨٠دا. ئـــەو کردەوانە کە دژی کوردەکان ئەنجامدرا کاری ســـەرباز یان هێزەکانی پۆلیس نەبوو، بەڵکوو ئەوان تەنها فەرمانیان جێبەجێ دەکرد. فەرمانی ئەو کردەوانە لە ئاستی زۆر بەرزی ڕژێمی عێراقەوە دەرکرابوو و ئامانجی کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لـــە کوردەکان و ناچارکردنـــی خەڵک بە هەڵاتن لە وڵات و خاپوورکردنی بەشـــێکی زۆر لـــە ناوچە گوندیە کوردنشـــینەکان بوو کە ســـەرچاوەی کولتووری کوردەکانی عێراقە.

ئەگەر خەڵکی ئەمریکا بە گشتی ئاگاداری پێشێلکرانی مافی مرۆڤ لە عێراق بن ( بەو شـــێوەیە کە ئاگاداری پێشـــێلکرانی مافی مرۆڤ لەو وڵاتانەن کە میدیاکان زیاتر دەســـتیان پێـــڕادەگات) زۆر لە یارمەتیدانی ئەمریکا بە عێراق تووڕە دەبن. هەرچەند کە خەڵک بە گشـــتی ئاگاداری ڕاستییەکان لە بارەی پێشـــێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لەلایەن عێراقەوە نییـــە، بەڵام ئێمە باش ئاگادارین و دەبێ لەبەرچاوی بگرین. HA پێیوایە کـــە یارمەتیدانی ئەمریکا بە عێراق لەگەڵ سیاســـەتی جیهانیی ئەمریکا ســـەبارەت بە مافی مـــرۆڤ ناگونجێت. کەوابوو HA پێشـــنیاری کردوە کە ئێمە دەبێ نامەیەک بۆ ئێوە ئامادە بکەین و پێشـــنیارێک لە بارەی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە عێراق ( کە بۆ مەسەلەی EXIM BANK پێویستە) بخەینەڕوو.

جگە لەوەش کاردانەوەی کۆمیتەکانی کاروباری دەرەوەی ئەنجومەنی نوێنـــەران و ئەنجومەنی پیران لەو پەیوەندیەدا نەرێنی دەبێت. ســـتافی HAFAC (کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجومەنی نوێنەران) بە شێوەی نافەرمـــی بـــە NEAی وتووە کـــە لەوانەیە کۆمیتە کاردانـــەوەی نەرێنی سەبارەت بەو مەسەلەیە نیشـــان بدات مەگەر ئەوە کە چاوەڕوان بکەین تا کۆنفرانســـی چەکە کیمیاییەکان لە پاریس تەواو بێت، کەوابوو ئەگەر ئێستا دەســـت بە کار بین چاوەڕوان دەکرێت لەگەڵ دژکردەوەی هەندێ

لایەن رووبەڕوو بینەوە. کۆمیتەی بازرگانی ئەنجومەنی نوێنەران و کۆمیتە بازرگانییە پەیوەندیدارەکانی دیکە لەوانەیە بەشێوەی تاک پشتیوانی لە ئێمە بکەن. HA پێیوایە کە کاردانەوەی ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەران سەبارەت بە زیادکردنی کریدیت بۆ عێراق بە تەواوی نەرێنی دەبێت ئەگەر بڕیار لە سەر ئەو شتە بدرێت لە کاتێکدا کە کۆنگرێس تاوتوێکردنی ئەو مەسەلەیەی خستووەتە کاتێکی دیکە.

## ئەنجام

NEA لەگەڵ هەڵێنجاندنەکانی شیکردنەوەکەی HA هاوڕا نییە کە زیاتر پشتی بەو تۆمەتانە بەستووە کە پێشمەرگە کوردەکان و راپۆرتی SFRC خستویانەتە پاڵ دەوڵەتی عێراق. شاڵاوی سەربازی عێراق هەرچەند کە دڕندانە بووە بەڵام ئامانجی ئارامکردنەوەی ئەو ناوچانە بووە کە لەلایەن پێشمەرگەکانەوە بە ماوەی چەند ساڵ داگیرکرابوون. پێشمەرگە راپەڕیوەکان هاوپەیمانی نزیکی ئێران بوون و وەک بەرەی دووەمی شەڕی ئێران کاریان دەکرد و لە لایەن ئێرانەوە پشتیوانی مادیان لێدەکرا و ئێران چەکداری دەکردن. ئێمە هیچ شتێک نابینین کە نیشان بدات عێراق هەوڵ دەدات کوردەکان بە تەواوی لە ناوبەرێت. شاڵاوی سوپای عێراق لە ناوچەیەکدا ئەنجامدراوە کە (بە وتەی سەرچاوە کوردە راپەڕیوەکان) تەنها ١٥٠ هەزار کەس لە رێژەی دوو میلیۆن کەسی کوردەکانی عێراق تێیدا نیشتەجێن.

NEA لەگەڵ ئەوە هاوڕایە کە سروشتی راستەقینەی رژێمی بەعسی عێراق لەگەڵ حەز و خواستی ئێمە یەکناگرێتەوە. ئێمە دەبێ درێژە بە چاودێریکردن بە سەر بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق بدەین و بە توندی دژی پێشێلکرانی مافی مرۆڤ قسە بکەین، بەڵام دەبێ سەبارەت بەوە وریا بین کە لە ئەنجامی گوشارە ئابوریەکانمان لە سەر عێراق چاوەڕوانی

چــی ئەنجامێک دەکەین. ئەو کریدیتە بچوکە کە ئێمە دەمانەویت بیدەین بە عێراق ( و بۆ نموونە لەلایەن کریدیتی FY ٨٩ CC) کەم کراوەتەوە، زۆر لـــەوە کەمترە کە دەوڵەتی عێراق وەک هۆکارێکی هاندەرانە کەڵکی لێوەربگرێت.

NEA و EB ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەو جۆرە پێشـــێلکاریانەی مافی مرۆڤ کە HA باسی کردووە تا ئەو شوێنە کە ئێمە دەزانین قەت ئەوەندە تونـــد نییـــە کە پێش لە چالاکی EXIM BANK بگرێت بەو شـــێوەیە کە پێشتر پێشی لە چالاکی EXIM BANK لە یەکیتی سۆڤیەت و رۆژهەلاتی ئوروپـــا گرتووە. بڕیارێکی وەها لەوانەیـــە بە واتای ئەوە بێت کە EXIM BANK کۆتایی بە ئاســـانکاری کریدیتی کورتخایەنی ئێســـتای بۆ عێراق بهێنێـــت و ئـــەوەش لەوانەیـــە کۆمەڵێک ئەنجام و ئاکامـــی خراپی بۆ بەرنامـــە ئابورییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە عێراق، لەوانە کریدیتەکانی کۆمپانیای کشوکاڵی CCC، بەدواوە بێت.

بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە پێگەی ململانێـــی ئابووری ئەمریکا لە سەراســـەری جیهاندا رۆژبەرۆژ تووشـــی کێشـــەی زیاتر دەبێت و لەگەڵ گیروگرفتی جدی هاوســـەنگیی بازرگانی رووبەڕوویە ئێمە نابێت خۆمان لە بازاری جیهانی دابڕین بێ ئەوەی سیاسەتێکی روون و واقعبینانەمان بـــۆ دەســـتکەوتە ئابورییەکانمان هەبێت لەکاتێکدا کە ئێســـتا ئێمە بە دڵنیایيـــەوە لە بازاری ململانێی ئابووری لـــە رۆژهەلاتی ئوروپا و ژاپۆن چالاک نیـــن. هاوپەیمانەکانمان، لەوانە بریتانیا (کە تەنها دەوڵەتێکە کە پشتیوانی لە بانگەشەکانی ئێمە لە بارەی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دەکات)، زۆر پێیانخۆشـــە کە کریـیتی زیاتر بۆ سەرمایەگوزاری لە بەشـــی ئاوەدانکردنەوەی عێراق (پاش کۆپتاییپێهاتنی شەڕ لەگەڵ ئێران) تەرخان بکەن.

جگە لەوەش NEA پێیوایە کە بازرگانی لەگەڵ عێراق لەلایەن هەندێ لە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیرانەوە قەت پێشوازی لێناکرێت، بەڵام بەرنامەی EXIM BANK ئەوەندە شتی شایانی تێدایە کە

ئێمە دەبێ سەرەڕای ئەو نیگەرانیانە درێژەی پێبدەین.

بـــە کورتـــی NEA پێیوایە کە ئێمە دەبێ هاوســـەنگییەک لە نێوان سەرجەم بەرژەوەندیەکانمان لە وڵاتی عێراق ( کە رۆژبەرۆژ گرنگی زیاتر پەیـــدا دەکات) رابگرین بۆ ئەوەی بگەین بە ئامانجەکانمان لە پەیوەندی لەگـــەڵ کەڵکوەرنەگرتن لە چەکـــی کیمیایی و رێزگرتن لە مافی مرۆڤدا. بە کۆتاییپێهاتنی شـــەڕ لە کەنداو، کاتەکە گونجاوە بۆ ئەوەی کەڵک لە دەرفەتە نوێکان وەربگرین بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانمان بکەین بە پرۆژە. بە وەدواخستنی کات یا گۆڕینی ئاراستەی شتەکان، ئەو بەرژەوەندییانە بۆمان دەستەبەر نابێت.

## پێشنیارەکان:

پێشـــنیار دەکەیـــن رێگامان پێبدەن بانکی هەنـــاردە و هاوردەکردن ئـــاگادار بکەینـــەوە کە وەزارەتـــی دەرەوە لە رووی سیاســـیەوە هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ بەخشینی گارانتی کریدیتی هەناردەکردنی مامناوەند بۆ عێراق نییە (NEA و EB لەگەڵ ئەم پێشـــنیارەدان بەڵام HA دژی ئەم پێشـــنیارەیە). رێگای دووەم ئەوەیە کە ئێمە پێشنیاری ئەوە نەکەین کە بڕی کریدیتەکە بۆ عێراق زیاد بکرێت بەڵکوو نامەیەکتان بۆ ئامادە بکەین و کۆمەڵێک پێشـــنیار لە بارەی مافی مرۆڤ لـــە عێراق بخەینەڕوو (HA لەگەڵ ئەم پێشنیارەدایە بەڵام NEA و EB دژی پێشنیارەکەن).

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە لەندەن بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد

بابەت: راپۆرتی میدیاکان لە بارەی راگوازتنەوەی کوردەکانی عێراق

نیسانی ١٩٨٩

بۆ زانیاری:

وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن ٧١٩٤

ئاماژە بە: تیلیگرامــی ٢٠٢٩ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- راپۆرتــەکان لە ربارەی راگوازتنــەوەی زۆرەملێی کوردەکان ئەم حەفتەیــە تەنها لە رۆژنامەی «دەیلــی تیلیگراف»[١٢٢]دا بڵاو بوەوە. لە لاپەڕەی ١٠ی رۆژی ١١ی نیساندا «دەیلی تیلیگراف» بانگەشەی ئەوەی کردبــوو کە نزیکەی ٢٥٠ هەزار کوردی عێراق لە شــاری قەڵادزێ ئاوارە و دەربــەدەر کراون یــان گوازراونەتەوە بۆ ئــوردوگا بیابانیەکانی نزیک عەرەبســتانی ســعودی لەبەر ئەوەی دەوڵەتی عێراق بڕیاریداوە شاری قەڵادزێ خاپــور بکات. ســەرچاوەی راپۆرتەکــەی رۆژنامەی «دەیلی تیلیگراف» یەکێتی نیشــتمانی کوردســتان بووە. هەروەها ئاژانســی دەنگوباسی «ئیرنا»[١٢٣] رایگەیاندوە کە سەربازانی عێراق بڵاقۆکیان بڵاو کردوەتــەوە و داوایان لــە خەڵکی قەڵادزێ ( کە بە وتەی «ئیرنا» ١٠٠ هەزار کەس دەبن) کردووە تا ٢٥ی نیســان قەڵادزێ چۆڵ بکەن چونکە لەو رۆژە بەدواوە قلادزێ خاپور دەکرێت.

٢- رۆژنامەی»تیلیگرام» لە ١٣ی نیسان لە زاری یەکێتی نیشتمانی کوردســتانەوە بڵاوی کردەوە کە ســەربازانی عێــراق ژمارەیەکی زۆر لە خانوەکانی قەڵادزێیان رووخاندووە پاش ئەوەی خەڵک نارەزایەتی خۆیان لە بەرامبەر راگوازتنەوەیان بۆ ئوردوگا زۆرەملیەکان دەربڕیوە. وتەبێژی کوردەکان رایگەیاندووە ئێستا چەند هەزار کەس ئاوارە و دەربەدەرن.

**سیتز**[١٢٤]

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە لەندەن بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن ٧٢٨٥

بابـــەت: دەوڵەتی عێراق لە راگوازتنەوەی بەشـێک لـــە کوردەکان چاوپۆشی کردووە

نیسانی ١٩٨٩

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد

لایەنە پەیوەندیدارەکانی شەڕی کەنداو

ئاماژە بە: تیلیگرامـــی ٢١٠٧ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریـــکا لـــە بەغـــداد و تیلیگرامـــی ٧٩٧٢ی باڵوێزخانـــەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە لەندەن.

١- رەش کراوەتەوە

٢- رۆژنامەکانی بریتانیا لە ١٦ و ١٧ی نیســـان بانگەشەی ئەوەیان کـــرد کە دەوڵەتی عێـــراق بۆ ئارامکردنـــەوەی ناڕەزایەتیەکان لە ناوخۆ و دەرەوەی عێـــراق لە فەرمانی راگوازتنـــەوەی زۆرەملێی کوردەکان لە باکووری رۆژهەڵاتی وڵات چاوپۆشـــی کردووە. عیزەدیـــن بەرواری[١٢٥]، وتەبێژی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە دیمەشق رایگەیاندوە کە وەدواخســـتنی راگوازتنی کوردەکان مانۆڕێکی کاتییە. بەرواری داوای لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی کردوە دەستبەکار بن بۆ ئەوەی پێش لە شاڵاوی قڕکردنی کوردەکان لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە بگرن.

٣- لە هەمان کاتدا ئاژانســـی دەنگوباسی «ئیرنا» بڵاوی کردەوە کە بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانی عێراق رایگەیاندوە کە بۆلدۆزر (شۆفڵ) هێنراوە بۆ قەڵادزێ و دانیشتوانی قەڵادزێ بە زۆرەملێ گوازراونەتەوە بۆ ئوردوگا کاتییەکانی سەر سنووری عەرەبستانی سعودی.

**سیتز**

**له وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌، واشینگتۆن بۆ:**
**- باڵوێزخانه‌ی ویلایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له‌ به‌یروت**
**- سه‌رجه‌م باڵوێزخانه‌ په‌یوه‌ندیداره‌کانی ویلایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا**

SECDEF WASHDC/ISA 0000
JCS WASHDC/>OJCSi J-5 0000
DIA/DER W*SHDC
NSC WASHDC 0000
USMISSION USVIENNA
CINCUSNAVEUR LONDON UK
USCENCTOM MACDILL AFB FL/POLAD
USDOCOSOUTH NAPLES ITzINTAFxFOR, POLAD KRUSE
COMSIXFLT
USCINCEUR VAIHINGEN GE
NSA FT MEADE MD
USIA WASHDC
NAVOPINTCEN SUITLAND MD
COMIPAC HONOLULU HI
LONDON FOR NILLIKEN
PARIS FOR W INN
ROME ALSO FOR VATICAN AND FOR MFO CLUVERIUS
DOD/ISA FOR NESA
C INCEUR FOR POLAD
CINCUSNAVEUR FOR INTAF
NSC FOR RODNAN
NSA FOR CH IEF G GROUP
COMIPAC FOR AI-5

## گولانی ١٩٨٩

بابەت: گوشـــارە سەربازی و سیاسییەکانی ســـەدام حوسەین لەسەر کوردەکان بەردەوامە

رەشنووســـی ئەم نووســـراوەیە لە لایەن INR/MESA ئامادەکراوە و پەسەندکراوە

١- سەرۆک کۆماری عێراق، سەدام حوسەین درێژە بە گوشاری سیاسی و سەربازی لەسەر کوردەکان دەدات بۆ ئەوەی رێبەرانی کوردە راپەڕیوەکان ناچار بکات لەگەڵ دەوڵەتی عێراق وتووێژ بکەن. بەڵام بە هۆی ئەوەی کە مەترسی سەربازی کوردەکان لەسەر دەوڵەتی عێراق بەشێوەیەکی بەرچاو پوچەڵ کراوەتەوە، پێناچێت ســـەدام جارێکی دیکە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکاربێنێت. ئەو بانگەشـــەیە پشتڕاست نەکراوەتەوە کە عێراق دەیەوێت کۆمەڵێک لە گوندەکانی سەر سنووری ئێران کاول بکات، بەڵام وادیارە سەدام دەیەوێت کوردەکان بەرەولای کۆمەڵگای عێراق رابکێشێت.

٢- ســـەدام زیاتر لە هـــەزار گوندی کاول کـــردوە و ٤٠٠ تا ٥٠٠ هەزار کەس لەو کەســـانەی راگوازتوەتەوە کە بـــە لایەنگری بزوتنەوەی راپەڕینی کوردیـــان دەزانێت و رێبەرانی راپەڕینی کوردی بانگهێشـــت کردوە لەگەڵ دەوڵەت وتووێژ بکەن، بەڵام هەوڵەکان بۆ دەستپێکردنی وتووێژەکان هێشتا سەرنەکەوتووە.

٣- لەگەڵ ئەوەشـــدا سەدام بەردەوام هەڕەشەی ئەوە دەکات کە هێزی ســـەربازیی بەکاردێنێت بۆ ئەوەی نەهێڵێت ئەو گروپە بچوکە کە لە کوردە راپەڕیوەکان ماوەتەوە، دەســـتیان بگات بە پشـــتیوانی ئەو گوندانەی کە پێشتر پشتیوانی ســـەرەکی کوردە راپەڕیوەکان بوونە ئێمە ناتوانین ئەو بانگەشانە پشتڕاســـت بکەینەوە کە باس لەوە دەکەن کە دەوڵەتی عێراق دەیەوێت شـــاری قەڵادزێ و گوندەکانی نزیک سنووری ئێران کاول بکات بۆ ئەوەی پشتێنەیەکی ئەمنی لە ناوچەی سنووری دروست بکات.

٤- قەڵادزێ دەستی لێنەدراوە بەڵام لەوانەیە سەدام بەرنامەی کاولکردنی قەڵادزێی وەدواخســـتبێت بەهۆی ئەو هەڵمەتـــی راگەیاندنە کە کوردەکانی

نەیـــاری حکومەتی عێراق لە لەندەن بەڕێوەیان برد. قازانجی هەرەشـــەی دەستپێکردنەوەی ئەم کردەوانەی سەدام تەنها ئەوەیە کە ڕێبەرانی ڕاپەڕینی کورد دەست لە هەڵوێســـتە توندەکەیان هەڵگرن و لەگەڵ دەوڵەتی عێراق وتوویژ بکەن[١٢٦]

## لە وزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن بۆ:
## باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد

بابـــەت: ناوەرۆکی دیداری جێگری وەزیـــری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ نوێنەرێکی کورد لە بارەی شاڵاوەکانی عێراق دژ بە کوردەکان

حوزەیرانی ١٩٨٩

بـــۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە لەندەن، پاریس، ڤییەن، دەمیشق، ئانکارا و کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنا

١- بە تەواوی ڕەش کراوەتەوە

٢- محەمەد دۆســـکی، نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ( گروپی بارزانی) لە واشینگتۆن ڕۆژی ١ی حوزەیران لەگەڵ ریچارد شیفتێر[١٢٧]، جێگری وەزیری دەرەوە دیداری کرد. محەمەد دۆســـکی داوای کرد ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا یارمەتی ئاوارە کوردەکانی عێراق لە تورکیە بدات و شێوەی هەڵسوکەوتی عێراق لەگەڵ کەمینەی کورد شەرمەزار بکات.

٣- بەتەواوی ڕەشکراوەتەوە

٤- دۆســـکی ئاماژەی بە بارودۆخی کـــوردەکان لە ناوخۆی عێراق کرد و پرســـیاری کرد هەڵوێستی ئەمریکا ســـەبارەت بە روخاندنی گوندەکان و تەعریبی کوردســـتان چییە. شیفتێر لە وەڵامدا وتی بەجدی هەوڵ دەدەین بۆ ئەوەی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق باشـــتر بێت هەرچەند کە تەنها دەرکردنی بەیاننامەی ڕەســـمی لەو پەیوەندیەدا بـــاش نیە. هەروەها وتی ئێمە هەوڵ دەدەین لەگەڵ دۆســـتە ئوروپایەکانمـــان کار بکەین بۆ ئەوەی هەڵوێستێکی هاوبەشمان لەو پەیوەندیەدا هەبێت.

٥- بەتەواوی ڕەش کراوەتەوە

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا له لەندەن بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن ٩٤٤٨

بابـــەت: دواییـــن زانیاریـــەکان دەربـــارەی شـــاڵاوی راگوازتنەوەی کوردەکان

حوزەیرانی ١٩٨٩

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانـــەی ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لـــە بەغداد، ئانکارا، دەمیشق و کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنا

ئاماژە بە: تیلیگرامـــی ٣١٤٦ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- رۆژنامەکانی بریتانیا درێژە بە بڵاوکردنەوەی بانگەشـــەکانیان لە بارەی راگوازتنەوەی کوردەکان دەدەن و دەڵێن ئەمجارە ١٧ هەزار کەس لە دانیشـــتوانی شارۆچکەی سەنگەسەرو دێگەڵە[١٢٨] راگوازراونەتەوە. لە وتارێکدا کـــە رۆژی ١٢ی حوزەیران لە گۆڤاری «تایمز»ی لەندەندا بڵاو بوەوە (کە دەقی وتارەکە لە پاراگرافی ٣ی ئەم تیلیگرامەدا هاتوە) هەژیر تەیموریان[١٢٩]، ئەندامی یەکێتی نیشـــتمانی کوردستان و کەسایەتییەکی عێراقی دیکە کە ســـەردانی لەندەنی کـــردووە و ناوی بڵاو نەکراوەتەوە، بانگەشـــەی ئەوەیان کردووە کە سەرجەم ٢٤٠٠ خانووەکەی سەنگەسەر لەگەڵ زەوی تەخت کراون و دانیشتوەکانی بە زۆر راگوازراونەتەوە. ناوبراو راپۆرتیـــداوە کە رەوتی راگوازتنەوەی ١٠٠ هەزار کەس لە دانیشـــتوانی قـــەڵادزێ تا ١٨ی حوزەیران بـــە تەواوی جێبەجێ کـــراوە و بەرنامەی تەعریـــب ( کە بە گوێرەی ئەوە تەنها عەرەبەکان دەتوانن خانوو بکڕن و بفرۆشن) لە شاری کۆیە جێبەجێ کراوە.

٢- لـــە راپۆرتێکـــی جیـــاوازدا کـــە ١١ی حوزەیـــران لـــە گۆڤاری «ئۆبزێرڤێر»[١٣٠]ی لەندەندا بڵاو بوەتەوە، هێلگا گراهام[١٣١] بانگەشـــەی ئەوەی کرد کە ٣ هەزار ئاوارەی کورد تووشـــی نەخۆشـــیەکی کوشندە

بوونـــه پاش ئەوەی نانـــی ژەهراوییان لە ئـــوردوگای ماردین لە تورکیە خواردووە. «ئۆبزێرڤێـــر» لە زمانی وتەبێژێکـــی ئاوارەکانی ئوردوگای ماردینەوە بڵاوی کردوەتەوە کە پێیانوایە کە دەزگای هەواڵگری عێراق لە پشتی ئەو مەســـەلەیەدایە و ئاماژەی بەوە کردوە کە بەکارهێنانی ژەهر دژی نەیارانی سیاســـی یەکێ لە تاکتیکە باوەکانی رژێمی سەرۆک کۆمار سەدام حوسەینە. راپۆرتی ئەو گۆڤارە هەروەها بانگەشەی ئەوەی کردوە کـــە جێگری وەزیـــری ناوخۆی عێراق و باڵوێزی عێراق لە ئەنکارا ســـێ حەوتوو لەمەوپێش سەردانی ئوردوگاکەیان کردووە بۆ ئەوەی قەناعەت بە ئاوارەکان بهێنن بگەڕێنەوە بۆ عێراق. کوردەکان دەڵێن ژەهرخواردکردنی ئـــاوارەکان لەوانەیە تۆڵەســـەندنەوەی رژیم لە ئـــاوارەکان بێت بە هۆی ئەوەی نەگەڕاونەتەوە بۆ عێراق.

٣- دەقی وتارەکەی هەژێر تەیمووریان لە ژێر ناوی «بارودۆخی دژواری کوردەکان: شارۆچکەی زیاتر لە لایەن عێراقەوە چۆڵ دەکرێن»:

حەوتووی رابردوو دەوڵەتی عێراق دانیشتوانی کوردی دوو شارۆچکەی باکووری عێراقی راگوازت و دەستی کردووە بە جێبەجێکردنی بەرنامەیەک بۆ تەعریبکردنی شارۆچکەیەکی دیکە. چاوەڕوان دەکرێت هەنگاوی دواتری دەوڵەتی عێراق (کە تۆمەتبارە بە هەوڵدان بۆ لەناوبردنی کەمینەی کورد کە ٤ میلیۆنە و شوناســـێکی جیاوازی هەیە) راگوازتنەوەی دانیشتوانی شـــارۆچکەی قەڵادزێ بێت کە نزیکەی ١٠٠ هـــەزار کەس دەبن و رەوتی راگوازتنەکەیان تا ١٨ی حوزەیران بە تەواوی جێبەجێ دەکرێت.

یەکێتی نیشـــتمانی کوردســـتان کە یەکێ لە دوو حیزبە ســـەرەکیە سیاســـیەکەی کوردەکانە و لە رابردوودا ســـەرچاوەیەکی متمانەپێکراوی زانیارییـــەکان بـــووە و کەســـایەتیەکی دیکـــەی عێراقی کە ســـەردانی لەندەنی کردوە بانگەشـــەی ئەوەیان کردوە کە نزیکەی ١٧ هەزار کەس لە دانیشـــتوانی شـــارۆچکەی سەنگەســـەر و دێگەڵە گوازراونەتەوە بۆ ئوردوگاکانی دەوروبەری شـــاری کوردنشینی هەولێر. پاشان بە خێرایی ســـەرجەم ٢٤٠٠ خانووەکەی سەنگەســـەر لەگـــەڵ زەوی تەخت کراون و

باغەکانی سوتێندراون.

بە گوێرەی زانیارییەکان، دەوڵەت بە دانیشتوانی قەڵادزێی وتووە کە تا ١٨ی حوزەیران کۆچ بکەن بۆ هەر شـــوێنێک لە ناو خاکی عێراق کە خۆیان پێیانخۆشە. پێشتر ١٠ هەزار بنەماڵەی دەوڵەمەند لە قەڵادزێ کۆچیـــان کردوە، بـــەڵام ٢٠ هەزار بنەماڵەی دیکـــە ئیمکانی ئەوەیان نەبووە بۆ شوێنەکانی دیکە کۆچ بکەن.

ئیمامی جومعەی قەڵادزێ، مەلا محەمەد دەڵگەیی[١٣٢] کە مانگی نیسان چووە بۆ بەغداد بۆ ئەوەی کاربەدەســـتانی رژێمی سەدام حوسەین رازی بکات خەڵک نەگوازنەوە،گیراوەو ناهێڵن بنەماڵەی سەردانی بکەن.

یەکێتی نیشـــتمانی کوردستان هەروەها بانگەشەی ئەوەی کردوە کە قایممەقام و فەرماندەی سوپای شارۆچکەی کۆیە فەرمانی قەدەخەکردنی کڕین و فرۆشـــتنی خانوو لە نێوان کوردەکانیان دەرکردوە. لە ئێستا بە دواوە تەنیـــا عەرەبـــەکان دەتوانن لە کۆیە خانـــوو بکڕن یان خانووی تازە دروســـت بکـــەن. ئەگەر ئەوە راســـت بێت، ئەم سیاســـەتە وەک سیاســـەتی (تەعریبە) کە لە دەیەی ١٩٧٠ لە شاری پێشتر کوردنشینی کەرکووک جێبەجێ کرا.

بـــاس لەوە دەکرێت کە بەمزوانە ژمارەیەکـــی زۆر عەرەب دەهێنرێت بـــۆ کۆیە و ئەو خانوانە کە دەوڵەت بـــە هەرزان لە کوردەکانی کڕیوە، دەدرێـــت بـــەوان. کۆیە نزیکەی ٤٥ میل لە ســـنووری ئێران دوورە و لە کاتی شـــەڕی ئێران و عێراقدا نەکەوتوەتە دەســـتی هێزەکانی ئێران یان هێـــزە کوردەکان. کۆیە بەشـــێک نییە لە پشـــتێنەی ئەمنی کە لە پاڵ سنووری ئێراندایە و دانیشـــتوەکانی راگوازراونەتەوە.(دەوڵەتی عێراق) بانگەشـــەی ئەوە دەکات کە بۆ پاراستنی دانیشـــتوەکانی لە تۆپبارانی ئێران، خەڵکەکەی راگوازتوەتەوە.

کـــوردەکان لەوە دەترســـن کە ئۆردوگاکانی نێو خاکی کوردســـتانی عێراق کە خەڵک بۆ ئەوێ رادەگوازرێنەوە تەنها شـــوێنی مانەوەی کاتی بن و خەڵک لەوێوە بگوازرێنەوە بۆ بیابانەکانی باشـــوری عێراق لە سەر

سنووری کوەیت و عەرەبستانی سعودی، چونکە خەڵک لەوێ لە ناو دەچن. دوێنێ پیاوێکی خەڵکی قەڵادزێ کە ئێستا لە لەندەنە وتی لە نێو ئەم گوندە بە کۆمەڵانەدا کە دەوڵەت بۆ خەڵکە راگوازراوەکە دروستی کردون، ئیش و کار نییە و خەڵک ناتوانن بە ئازادی هاتوچۆ بکەن و دەوڵەت بە هەر شێوەیەک کە پێیخۆش بێت لەگەڵ خەڵک هەڵسوکەوت دەکات. نزیکەی ١٠ هەزار کوردی مەدەنی ساڵی رابردوو لە ئەنجامی هێرشی کیمیایی سوپای عێراق کوژراون و لە ماوەی ١٠ ساڵی رابردوودا سێ هەزار گوند لەگەڵ زەوی تەخت کراون.

هەولێر: کاربەدەستێکی باڵای عێراق ئەو بانگەشەیەی گروپە کوردە ئوپوزوسیونەکانی رەت کردوەتەوە کە دەوڵەت لەپێناو تێکشکاندنی بزووتنەوەی جیاییخوازی کورد، بە زۆر کوردەکان لە دەرەوەی ناوچە شاخاویەکان نیشتەجێ دەکات. ئەو کاربەدەستە عێراقیە وتی راگوازتنی کوردە گوندنشینەکان بەشێکە لە پرۆژەی دەوڵەت بۆ گەشەپێدانی ناوچە و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئەو ناوچەیە لەمێژە گەشەی نەکردوە.

کاتۆ[١٣٣]

## له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە لەندەن بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن ٩٥٦٧

بابەت: دەستپێکردنی راگوازتنەوەی خەڵکی قڵادزێ لەلایەن عێراق
حوزەیرانی ١٩٨٩
بۆ زانیاری:
باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- رۆژنامـــەی «تایمز» و «ئیندیپیندێنـــت»[١٣٤]، چاپی لەندەن لە ١٤ی حوزەیران بڵاویان کردەوە کە سوپای عێراق رۆژی دوشەممە، ١٢ی حوزەیران چوەتە ناو قڵادزێ و دەستی کردوە بە راگوازتنەوەی زۆرەملێی خەڵک بە لۆری ســـەربازی. بە گوێرەی پەیامێک کە بە دەستی رێبەری کورد، جەلال تەڵەبانی گەیشـــتووە، قەڵادزێ دەبێ تا رۆژی یەکشەممە، ١٨ی حوزەیـــران بە تەواوی چۆڵ بکرێت. تاڵەبانی وتویەتی نازانێت ئایا هیچ کەس لەو ســـەروبەندەدا کوژراوە یان نا، بەڵام دانیشتوانی قەڵادزێ لە ناو ماڵی خۆیاندا ســـەنگەریان گرتووە و بەشـــێوەیەکی ئاشتیخوازانە لە بەرامبەر هێزەکانی عێراقدا بەربەرەکانیان کردووە و سوپای عێراق بە ناردنی سەربازی زیاتر بۆ ناو شار وەڵامی داونەتەوە.

٢- تاڵەبانـــی داوای لە زلهێزەکان و نەتـــەوە یەکگرتوەکان کردووە گوشار بخەنە سەر دەوڵەتی عێراق ئەو شاڵاوە رابوەستێنێت. رۆژنامەکان پێشتر لە مانگی نیسان بڵاویان کردبوەوە کە دەوڵەتی عێراق دەیەوێت ١٠٠ هەزار کەس لە دانیشتوانی قەڵادزێ رابگوازێتەوە بەڵام بۆ ماوەیەکی کاتی ئەو سیاسەتەی وەدواخستوە[١٣٥].

هارفەی موریس[١٣٦] لە رۆژنامەی «ئیندیپیندێنت» وتوویەتی لەوانەیە هـــۆکاری وەدواکەوتنی ئەو سیاســـەتە ئەوە بێت کـــە دەوڵەتی عێراق نیگەرانی وەفاداربوونی میلیشـــیا کوردە چەکدارەکانی لایەنگری دەوڵەت واتا جاشەکانە کە دژی راگوازتنەوەی خەڵکن. موریس بانگەشەی ئەوەی کردوە کە دەوڵەت دەســـتیکردوە بە ناردنی جاشـــەکان بۆ شوێنەکانی

دیکەی کوردســـتان پێش ئەوەی بەرنامـــەی راگوازتنی خەڵک جێبەجێ بکات.

٣- رۆژنامەی «گاردیەن»[١٣٧] رۆژی ١٤ی حوزەیران نامەیەکی نائیل ئەلحەســـەن[١٣٨]، راوێژکاری راگەیاندنی باڵوێزخانەی عێراق لە لەندەنی بڵاو کردەوە کە لە وەڵامی وتارەکەی «هیلگا گراهام» لە ٩ی حوزەیران نووســـرابوو کە لە بارەی شـــەڕی کورد بۆ ئوتونومی بوو و تێیدا نائیل حەسەن دانی بە بەرنامەی راگوازتنی کوردەکاندا نابوو و وتبووی کە ئەو بەرنامەیە نەتەنیا لە روانگەی ئاسایشەوە پێویستە بەڵکوو ئامرازێکە بۆ دابینکردنی ژیانێکی باشـــتر بۆ هاووڵاتیانی عێراق لە رێگای دابینکردنی کارەبـــا، ئاو و پێداویســـتییەکانی دیکەی ژیان کە بـــۆ ژیانێکی مودێرن پێویستە.

٤- ئەمە دەقی نامەکەی نائیل حەسەنە کە لە ژێر ناوی « ئۆتۆنۆمی و کوردەکانی عێراق» بۆ رۆژنامەی گاردیەنی نووسیوە:

«هێلگا گراهام لە وتارێکدا لە ژمارەی رۆژی ٩ی حوزەیرانی رۆژنامەی گاردیەن لە بارەی شـــەڕی کـــورد بۆ ئۆتۆنۆمی بانگەشـــەی کۆمەڵێک خاڵی ناڕاســـتی کردووە. یاسای ئۆتۆنۆمی ئێمە بۆ هەرێمی کوردنشینی عێراق لە راســـتیدا لە ١١ی ئاداری ١٩٧٤ دانراوە و کۆمەڵێک رێوشـــوێن لەخۆ دەگرێت بۆ بەشـــداریکردنی کورد لە پرۆسەی دیموکراسی هەرێمی ئوتونومی کوردنشین و عێراق بە گشتی. هەرێمی ئوتونومی ئەنجوومەنی یاســـادانانی هەیە کە لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێردراون و دەزگایەکی چاپ و بڵاوکردنـــەوەی کوردی هەیە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب و رۆژنامە بە زمانی کوردی کە زمانی پەروەردەیشـــە. لە ئەنجامدا کولتووری کورد بوژاوەتەوە و ئەو بانگەشـــەیەی ناحەزان بە درۆ دەخاتەوە کە دەوڵەتی عێراق هەوڵ دەدات شوناسی کورد سەرکوت بکات.

شـــایانی ئامارەپێکردنە کە کەمینەیەک لە کوردەکان بە شێوەیەکی سەرنەکەوتوانە هەوڵ دەدەن بە پشتبەستنی تەواو بە ئێران و ئیسرائیل شۆڕشـــی ١٩٧٤ دووپـــات بکەنەوە لە کاتێکدا کـــە کوردەکانی ئێران و

فەلەستینیەکان دەتوانن شایەتی ئەوە بدەن کە ئێران و ئیسرائیل چەندە بە دادپـــەروەری پابەندن. راگوازتنەوەی هەندێ لە کوردەکانی عێراق لە ناوچە شاخاویەکانی سەر سنووری ئێران هەنگاوێکی ئاسایشی بنەڕەتیە کە ناسەقامگیربوونی بەردەوامی ناوچە بەسەر دەوڵەتی عێراقدا سەپاندوویە. بەڵام ئەم پێویستبوونە تەنها بەشێک لە هۆکارەکانی راگوازتنی خەڵک و دروستکردنی شاری نوێ لە سەراسەری عێراق و کوردستانی عێراقە. ئەو بەرنامەیە ئامرازێکە بۆ دابینکردنی ژیانێکی باشتر بۆ هاووڵاتیانی عێراق لە رێگای دابینکردنی کارەبا، ئاو و پێداویستیەکانی دیکەی ژیان کە بۆ ژیانێکی مودێرن پێویستە.

یاسای ئوتونومی رایگەیاندوە کە هەرێمی ئوتونومی، وڵاتی کوردەکانی عێراق دەبێت و گەلێ شـــاری نوێ لەوێ درســـت دەکرێن. جێگای داخە کە وتارەکەی ئێوە هەوڵیداوە ئەفسانەی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان زیندوو بکاتەوە، چونکە رەتکرانەوەی ئەو تۆمەتە لە لایەن نەتەوە یەکگرتوەکانەوە نیشان دەدات کە ئەو مەسەلەیە راست نیە. بوونی هەرێمی ئوتونومی کوردســـتان، کوردبوونی جێگری سەرۆک کۆماری عێراق و کوردبوونی چەند وەزیر لە ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق، ئەفســـانەی ســـەرکوتی کورد لە لایەن دەوڵەتی عێراق رەت دەکاتەوە. کوردەکانی عێراق درێژە بە بەشـــداریکردن لەو پێشکەوتنانە دەدەن کە ئێســـتا لە عێراق روو دەدات و وەک ســـەرجەم خەڵکی عێراق سود لەو پێشکەوتنانە وەردەگرن».

## له وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن بۆ:
## باڵۆێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بەغداد

بابـــەت: راپۆرتی وەزارەتـــی دەرەوەی ویلایەتـــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ســـەبارەت بە بارودۆخی مافی مرۆڤ لە کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٨٩

شوباتی ١٩٩٠

عێراق دەوڵەتێکی تەک حیزبییە کە لە لایەن حیزبی سۆسیالیستی بەعسی عەرەبی (ABSP) لە رێگای ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش (RCC)ەوە دەسەڵاتداری تێدا دەکرێت کە لە دوو دەسەڵاتی بەڕێوەبەری و یاســـایی بە گوێرەی یاسای بنەڕەتی ١٩٦٨ پێکدێت. هەموو هێزێک بە دەســـتی سەدام حوسەینە وەک ســـەرۆک کۆمار، سەرۆکی RCC و سکرتێری گشتی فەرماندەیی ABSP لە عێراقدا. دوو حیزبی بچووکی دیکەش هەن کە لە بنەڕەتدا پشتیوانی لە حکوومەت دەکەن. لە ساڵی ١٩٨٩ دەوڵـــەت رایگەیاند کە بە نیازە لە رێگای یاســـایەکی بنەڕەتی نوێ، سیستمی چەند حیزبی پێکبهێنێت.

هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نیشـــتمانی- کە دەسەڵاتێکی کەمی هەیە- لە ١ی نیســـان بەڕێوەچوو. رەشنووســـی یاســـای بنەڕەتی لە ١٩٨٩ تەواو بووە کە رێگا دەدات بە پێکهاتی سیســـتمی چەند حیزبی و لـــە ســـەرەتای ١٩٩٠ دەخرێتە رێفراندۆم. بـــە هەرحاڵ ماوە ببینین کە ئایا ئەم سیســـتمە نوێیە پاوانی دەســـەڵاتی ســـەدام حوسەین و ABSP کەم دەکاتەوە یا نا. دانیشـــتوانی عێـــراق لە هەندێ گرووپی (ئایینی و ئەتنیکی) جیاواز پێکدێن کە ســـەرەکیترینیان شیعە و سوننە عەرەبەکان و کورد، تورکمان و گەلێ گرووپی مەسیحین (زۆرتر ئاشووری و کلدانی).

سوپای عێراق گەورەیە و باش مەشقی پێکراوە. بەشێک لەم سوپایە

بەتایبەت هێزی «فورسـانە» کە لە عەشـیرەتە کوردەکان پێکدێت و ئەرکی دابینکردنی ئاسایشی سیاسی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستانی لە ئەستۆیە. پۆلیسیش ئەرکی ئاسایشی مەدەنی لە ئەستۆیە

دەوڵـەت کۆنترۆڵی بەشـێکی زۆری ئابووری وڵاتی لە دەسـتدایە کـە سـەرچاوەکەی زۆرتر داهاتی نەوتە و سـەرجەم پیشەسـازییە گرینگەکان لە دەستی حکوومەتدایە. دەوڵەت بەرنامەی کەرتی تایبەتی جێبەجێکردووە لە بەشی کشتوکاڵ، گەشتیاری، خزمەتگوزاری گشتی و پیشەسازی سووکدا و هەوڵ دەدات سەرمایە لە ئابووری وڵاتدا وەگەڕ بخات. بەهەرحاڵ دەسـەڵاتداری حکوومەت بەسـەر چالاکی ئابووریدا هەروا بەردەوام دەبێت.

کارنامەی مافی مرۆڤی عێراق لە سـاڵی ١٩٨٩ هەروا نەرێنی بوو. هەرچەشـنە بەرهەڵسـتکارییەکی جیدی دژی حکوومەت سـەرکوت دەکرێت. دەزگای سیخوڕی لە بەرامبەر چالاکییە دژە حکوومەتییەکان لە کۆمەڵێک ئامرازی نایاسـایی کەڵکوەردەگرێت وەک ئەشـکەنجە و کوشـتن. مافی مەدەنی هاووڵاتیانی عێراق هەروا بە توندی بەرتەسک کراوەتـەوە و خەڵکی عێراق مافی ئەوەیان نییە دەوڵەتەکەیان بگۆڕن. ئازادیی دەربڕینی بیروڕا و چاپەمەنی و گرتنی کۆمەڵە و ئەنجوومەنەکان بوونی نییە.

گرینگتریـن پێشـێلکارییەکانی دیکـەی مافی مـرۆڤ بریتین لە بێسەروشوێنکردن و گرتنی سەرەڕۆیانە، نەبوونی دادگای دادپەروەرانە، دەسـتێوەردانی هەمە لایەنە لە کاروباری تاکەکەسـی و بنەماڵەیی و بەکارهێنانی لـە رادەبەدەری هێز دژی هاووڵاتیانـی کورد و نەبوونی هیچ چەشـنە مافێکی کرێکاری. هەروەها کۆنترۆڵی سەرکوتکارانە لە کاروباری ناوخۆیی وەک کەندوکۆسـپەکانی سەفەر کردن- کە پێش لە شـەڕی ئێران و عێراقیشـدا هەر هەبوو و لە کاتی ئەم شەڕەدا توندتر ببوو- ئێستاش سەرەڕای ئاگربەستی ١٩٨٩ لەگەڵ ئێران هەر هەیە.

بزووتنەوەی چەکداری کورد لە ســاڵی ١٩٨٩ بەردەوام بوو، بەڵام ئاســتەکەی نزمتر بــوو. هەرچەند کە هیچ بانگەشــەی ئەوە نەکراوە کە دەوڵەتی عێراق لە ســاڵی ١٩٨٩ چەکی کیمیای دژی هاووڵاتیانی ســیڤیلی کورد بــەکار هێنابێ ( بە پێچەوانەی ســاڵی ١٩٨٨) بەڵام پێشێلکردنی مافی خەڵکی کورد هەروا بەردەوام بوو.

دەوڵــەت لە مانگــی گوڵاندا رایگەیانــد لەپێناو ســەرکوتکردنی بزووتنــەوەی کــورد، بەرنامەکەی ســاڵی ١٩٨٧ درێــژە پێبدات بۆ دروســتکردنی ناوچەیەکی ئەمن لە پاڵ ســنووری عێــراق و ئێران و تورکیا کە نابێ کەســی تێیدابێت. بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیە، دەوڵــەت گوندەکانــی ناوچەی نــاو ٣٠ کیلۆمەتــری قووڵایی خاکی عێراقی کاولکردووە و نزیکەی ٥هەزار کورد و ئاشــووری لەو شــار و شــارۆچکانەدا نیشــتەجێ کردووە کە لە لایەن دەوڵەتەوە چاوەدێری دەکرێن و دەپارێزرێن و هەروەها لەو شــوێنانەی کە بۆ ئەم مەبەستە لە ناوچەی کوردستان دروست کراون.

### ٦- رێزگرتن لە مافی مرۆڤ

ئەلــف: رێزگرتن لە مافە تاکەکەســییەکان، لەوانــە دووربوون لە کوشتنە سیاسی و غەیرە سیاسییەکانی دیکە

بە درێژایی ســاڵان، لەسێدارەدان یەکێ لە میتۆدە جێکەوتووەکانی عێراق بووە بۆ رەفتار لەگەڵ بەرهەڵســتکارانی سیاســی و سەربازی دەوڵەت، لەوانە ئەندامانی حیزبی نایاسایی «دەعوە« (کە گرووپێکی بناژۆخوازی شــیعەیە کە کاری تیرۆریســتی لە ئاستی نێونەتەوەییدا کردووە و لەلایەن ئێرانەوە پشتیوانی لێدەکرێت).

هەنــدێ جار، بنەماڵەیەک کاتێ ئاگاداری ئەوە دەبێتەوە کە یەکێ لە ئەندامانی بنەماڵەکە لەســێدارەدراوە کە هێزە ئەمنییەکان تەرمی لەســێدارەدراوەکە دەدەنــەوە و داوای قەرەبووکردنەوە (غەرامــە) لە بنەماڵەکەی دەکەن.

ڕێکخـــراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی (AI) لـــە راپۆرتی خۆیدا بۆ نیمچە کۆمیســـیۆنی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پێشگیری لە هەڵاواردن و پاراســـتنی کەمینەکان، رایگەیاندووە کە کۆمەڵێک بانگەشـــەی بە دەستگەیشتووە سەبارەت بەوەی کە نزیکەی ٨٠ کەس لەوانەی کە لە ســـوپای عێراق هەڵاتوون لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨ لەسێدارە دراون و دەوڵەت ١١ کەس لە کوردە بەرهەڵستکارەکانی لە مانگی ئادار و نیسانی ١٩٨٩ لەسێدارە داوە. AI هەروەها لە راپۆرتی مانگی شوباتی خۆیدا لە ژێر ناوی «عێراق: منداڵان، قوربانیانی بێ گوناهی سەرکوتی سیاســـی « رایگەیاندووە کە هەرساڵ کۆمەڵێک بانگەشەی سەبارەت بە لەســـێدارەدانی ســـەدان کەس بە دەست گەیشـــتووە. AI ئامارەی بـــە فایلی ٢٩ منـــداڵ و لاوی کورد کردووە کە لـــە کانوونی دووەمی ١٩٨٧ لەســـێدارە دراون. جگە لەوەش AI لە راپۆرتی ساڵی ١٩٨٩ی خۆیدا ئامارەی بەوە کردووە کە ســـەدان هاوولاتی سڤیل لەوانە ژن و منداڵ لە بنکەی سەربازی تانجەرۆ[١٣٩] لە پارێزگای سلێمانی لەسێدارە دراون. بانگەشـــەکانی نێوئاخنی راپۆرتی AI هێشتا لەلایەن سەرچاوە سەربەخۆکانەوە پشتڕاست نەکراوەتەوە.

**٢ـ بێسەروشوێنکردن**

لـــە راپۆرتی مانگی شـــوباتدا AI رایگەیاندووە هـــەزاران کەس لە ماوەی چەند ســـاڵی رابـــردوودا لە لایـــەن هێزەکانی ئاســـایش یان هێزە ئەمنییەکانەوە دەستبەســـەر کراون و پاش دەستبەســـەر بوون بێسەروشوێن کراون و ژمارەیەکی زۆریان لەسێدارە دراون. لە راپۆرتی خۆیـــدا لە مانگی ئاب بۆ نیمچە کۆمیســـیۆنی نەتەوە یەکگرتووەکان، AI رایگەیاندووە کە مەلا محەمەد دەرگەڵەیی[١٤٠]، پێشنوێژی مزگەوتی قەڵادزێ لە ناوەڕاستی مانگی نیسان بێسەروشوێن کراوە کە لە نێو ئەو لێژنەیەدا بووە کە سەردانی کاربەدەستانی دەوڵەتی کردووە بۆ ئەوەی داوایان لێبکەن کوردەکان بە زۆر لە قەڵادزێ دەرنەکەن. مەلا محەمەد

دەرگەڵەیی لە بەغداد دەستبەسـەرکراوەو پاشان بێسەروشوێنکراوە. ڕێکخراوێکـی ئاشـوری کە بنکەکەی لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە بانگەشەی ئەوەی کردووە کە لە مانگی ئادار، ٢٣ ئاشووری بێسەروشوێن کراون کە پاش دەرچوونی لێبوردنی دەوڵەتی عێراق، لە ئێران و تورکیاوە گەڕابوونەوە بۆ عێراق.

**٣- ئەشکەنجەو ڕەفتاری زاڵمانە، نامرۆڤانەو سووکایەتیپێکردنەکانی دیکە یان سزادان**

یاسای بنەڕەتی عێراق ئەشکەنجەی قەدەغە کردووە و سزای بۆ ئەو کەسـانە دیار کردووە کە کەسانی دیکە ئەشکەنجە بکەن، بەڵام روونە کە هەم ئەشکەنجەی جەستەیی و هەم ئەشکەنجەی دەروونی لە لایەن کاربەدەسـتانەوە، بەتایبەت هێزەکانی ئاسایشـەوە ئەنجام دەدرێت. بـە لەبەرچاوگرتنی پەیوەندی توندی نێوان کاربەدەسـتانی دەوڵەت و هێزە ئەمنییەکان، ئەشـکەنجە ناتوانێت بـە بێ ئاگاداری یا ئیزنی کاربەدەستانی پایەبەرز ئەنجام بدرێت.

ئەو گرووپانە کە بۆ دەرەوەی عێراق کۆچیان کردووە و ئەو کەسانە کە پێشتر لە بەندیخانەدا بوونە پشتڕاستیان کردوەتەوە کە ئەو کەسانە کە بە هۆی سیاسی یان ئەمنی دەستگیر دەکرێن، ئەشکەنجە دەکرێن و هەڵسـوکەوتی خراپیان لە گەڵدا دەکرێت. هەڵسوکەوتی زۆر خراپ کتوپڕ پاش دەستبەسـەربوون دەسـتپێدەکات و لە کاتی لێکۆڵینەوە بەردەوام دەبێت کە لەوانەیە چەند مانگ درێژەی هەبێت. ئەشکەنجەو ڕەفتـاری دڕندانە تەنها هی تاوانە سیاسـییەکان نییـە و تاوانەکانی دیکەش لە خۆ دەگرێت. تاوانە سیاسییەکان بەرفراوان پێناسە کراون و تاوانە زۆر ئاساییەکانیش دەکەونە ناو بازنەی تاوانی سیاسییەوە.

AI لە راپۆرتی سـاڵی ١٩٨٩ی خۆیدا رایگەیاندووە کە ئەشکەنجە و هەڵسـوکەوتی خراپ لەگەڵ بەندکراوەکان بە شـێوازێکی بەرفراوان بەردەوام بـووە و هەندێک لە گیراوەکان مێرمنداڵانی خوار ١٨سـاڵ

بوونە کە لێیاندراوە، قامچیان لێدراوە، شۆکی کارەباییان لێدراوە و لە نانخواردن بێبەش کراون.

دەوڵەت بەردەوام حاشا لە ئەشکەنجەکردنی منداڵان (وەک سیاسەتی فەرمـــی یان بە کـــردەوە) دەکات و دەڵێت ئامادەیە لەم پەیوەندییەدا لێپرســـینەوە لەگەڵ هەرچەشنە بانگەشـــەیەک بکات و تاوانباران سزا بدات. شاهیدانی بێلایەن تا ئێستا نەیانتوانیوە لێپرسینەوە لەگەڵ ئەم بانگەشانە بکەن.

**٤ـ دەستبەسەرکردنی سەرەڕۆیانە، گرتن و دوورخستنەوە**

لە کاتێکدا کە یاسای بنەڕەتی و یاسای مەدەنی، مافی هاووڵاتیانی لەم بوارەدا دابینکردووە و کۆمەڵێک کەندو کۆســـپی لە ســـەر ڕێگای پۆلیس داناوە بۆ دەستبەســـەرکردن، گرتـــن، زیندانیکردن و گەڕانی شـــوێنی ژیـــان یا کاری خەڵک، بەڵام ئەم ڕێوشـــوێنانە لە راســـتیدا بەنیســـبەت تاوانگەلی سیاسی یا ئەمنی جێبەجێ ناکرێت، هەرچەند کە بەنیسبەت تاوانە ئاساییەکان جێبەجێ دەکرێت.

هێزەکانـــی ئاســـایش نەتەنها خەڵک بە شـــێوازی ســـەرەڕۆیانە دەستبەسەر دەکەن، بەڵکوو بە شێوەی نهێنیش گومانبارەکان دەگرن و تەنها پاش لەســـێدارەدانیان چارە نووسیان روون دەبێتەوە. تاوانە ئەمنییەکان بریتین لە سیخوڕی، خیانەت و پیلانگێڕی دژی دەوڵەت و هاوکاریکردن لەگەڵ دوژمنانی بیانی.

گوازتنەوەی ٥٠٠ هەزار گوندنشـــینی کورد بۆ شـــوێنەکانی دیکەی کوردستان لە ســـاڵی ١٩٨٧وە دەکرێت وەک جۆرێک دوورخستنەوەی ناوخۆیی ســـەیر بکرێت. دەوڵەت لە حوزەیرانـــی ١٩٨٩ رایگەیاندووە ناوچەیەکی ئەمنی چۆڵی دروستکردووە بۆ ئەوەی ئاسایشی هاووڵاتیان لە ناوچە ســـنوورییەکان (کە لە کاتی شەڕی ئێران و عێراقدا تۆپباران کراون و هێرشـــی سەربازیان کراوەتە ســـەر) بپارێزێ و خزمەتگوزاری باشتر بۆ گوندنشینان دابین بکات.

هەرچەنـــد کە دەوڵەتی عێراق دەرکردنـــی عێراقییەکانی ڕاگرتووە - بــە بیانووی ئەوەی کە بە ڕەگەز ئێرانین- بەڵام ئەو چەند کەســە ئێرانییە کە هێشتا لە عێراقدا ماونەتەوە، زیندانی کراون یا هەڕەشەی دوورخســـتنەوە و زیندانیکردنیان لە سەرە. ئەو ژن و مێردە عێراقیانە کە هاوســـەرەکەیان بە ڕەگەز ئێرانییە دەبێ لە هاوسەرەکانیان جودا ببنەوە ئەگەرنا هەمان هەڵســوکەوتیان لەگەڵـــدا دەکرێت. هەروەها عێراقییەکانی دیکە کە باپیریان بە ڕەگەز عێراقی نییە بە شـــێوازێکی سەرەڕۆیانە دەستبەسەر دەکرێن و دوور دەخرێنەوە.

**٥ـ بێبەشکردن لە دادگایەکی دادپەروەرانە**

بە گوێرەی سیســـتمی یاسایی عێراق، لێکۆڵینەوە لەگەڵ سووچ لە لایەن پۆلیس و پاشـــان دادوەرێک دەکرێت کە لەوانەیە فایلەکە بنێرێ بـــۆ دادگا یا نەینێرێت. دادوەر حووکمی تاوانـــەکان دەدات و لیژنەی دادوەری بوونی نییە.

ئەوانـــەی کە بە تاوانبار دەناســـرێن دەتوانـــن داوای پێداچوونەوە لە دادگای پێداچوونەوە و دیوانی بەرزی وڵات بکەن. دادگای شـــەریعەت لـــە عێراق بوونی نییە، بەڵام بە هەرحاڵ دادگاکانی بنەماڵە، یاســـای شەریعەت جێبەجێ دەکەن کە بە گوێرەی دابونەریتی عێراق داڕێژراون. لێپرســـینەوە لەگەڵ سووچە ئاساییەکان لە دادگای مەدەنی، ئایینی و جەزاییدا دەکرێت و بە ئاشـــکرا دەبێـــت. تاوانبار دەتوانێت بە پارەی دەوڵەت پارێـــزەری هەبێت (ئەگەر هەژار بێـــت) و پارێزەر دەتوانێت فایلی تاوانبارەکە ببینێت. دادگای پێداچوونەوە لێپرســـینەوە لەگەڵ ئەو فایلانە دەکات کە لە دەستی دادگاکانی شۆڕشدا نین.

بە پێچەوانەی ســـوچە ئاساییەکان، ســـوچە ئەمنییەکان لەلایەن دادگای شۆڕشـــەوە (RCC) حووکـــم دەدرێن کە زۆربـــەی جاران بە شێوازی نهێنی بەڕێوە دەچن. سوچە ئەمنییەکان بریتین لە سیخوڕی، خیانەت، قاچاخ، ئاڵوگۆڕی دراو و کڕین و فرۆشتنی مادە سڕکەرەکان.

مافـــی داکۆکیکردن له خۆ لەم جۆره تاوانانه زۆر ســـنووردارە. دادگا تایبەتەکانیـــش کە لەلایەن RCC بۆ رووداوگەلێکی تایبەت دروســـت کـــراون (وەک پیلانـــی دژی حکوومـــەت له ســـالّی ١٩٧٩) به نهێنی بەڕێوەدەچـــن. تاوانبارانی ئەم دادگا تایبەتانه لەو مافانه کە یاســـای بنەڕەتـــی بۆ هاوولاتیان داینـاوه، بێبەش کـــراون. تاوانباران له ژوری تاکەکەسیدا رادەگیرێن و به ئەشکەنجە، دانپێدانانیان لێوەردەگیرێت. پێداچوونەوه بەم تاوانانه تەنها لەلایەن ســـەرۆکی RCCوه دەکرێت و بەهەرحـــالّ داوای پێداچوونەوه هیچ کەڵکێکی نییه چونکه تا ئێســـتا چەندین کەس ماوەیەکی کورت پێش پێداچوونەوه لەسێدارەدراون.

ســـوچی سیاسی له عێراق بازنەیەکی بەرفراوان له چالاکییەکان له خـــۆ دەگرێت و له هەلومەرجێکدا کە بیروڕای گشـــتی ئاگاداری گیران و زیندانیکردنـــی تاوانباران نییـــە، زۆر زەحمەته کە ژمارەی زیندانییه سیاســـییەکان مەزەنده بکرێت. AI له راپۆرتی ســـالّی ١٩٨٩ی خۆیدا رایگەیاندووه هەزاران بەندکراوی سیاسی هەروا به شێوازی سەرەڕۆیانه دەستبەســـەر دەکرێن و له زینداندا دەمێننـــەوه، بەتایبەت ئەندامانی حیزبه سیاســـییه نایاســـاییەکان، ئەوانەی کە له ســـوپا هەلاتوون و ئەوانـــەی کـــه پیلانی خەباتی چەکدارییان دارشـــتووه. کەســـوکاری تۆمەتبارەکان (لەوانه منداڵەکانیان) وەک بارمته دەگیردرێن بۆ ئەوەی تۆمەتبار دان به تاوانەکانیدا بنێت.

## دەستێوەردان لە کاروباری شەخسی و بنەماڵەیی و پیشەیی

بە گوێرەی یاسـای بنەڕەتی، بنەماڵە لە دەستدرێژی دەپارێزرێت و بایەخە کۆمەلایەتییە بەرزەکان ئەم پاراسـتنە بەهێزتر دەکات. پۆلیس پێش ئەوەی ماڵی گومانلێکراوەکان بپشـکنێت دەبێت ئیزنی پشکنین لە دادگا وەربگرێـت بەلام بە هەرحاڵ بۆ دەستبەسـەرکردنی گومانلێکراوە ئەمنییەکان، وەرگرتنی ئیزنی دادگا پێویسـت نییە. هەرچەندە زۆربەی گومانلێکراوەکان لە دەرەوەی ماڵ دەستبەسەر دەکرێن، هێزەکانی ئاسایش هەندێـک جار بە زۆر چوونەتە نێو ماڵی خەڵک بۆ دەستبەسـەرکردنی گومانلێکـراو، بـە تایبەت ئەندامانـی گومانلێکراوی حیزبی نایاسـایی «دەعوە».

هەرچەندە بە گوێرەی یاسـا نابێت پۆسـت و تلگـراف و تەلەفۆنی هاوولاتیـان کۆنترۆل بکرێـت بەلام گەلێ لە عێراقییەکان لە سـەر ئەو بڕوایەن کە بە گشتی تەلەفۆنی هاوولاتیان کۆنترۆڵ دەکرێت و هەموو ئەو کەلوپەلانەی کە لەرێگای پۆسـت دەگوازرێنەوە دەپشکێندرێن. دەزگای ئیسـتیخبارات و حیزبی بەعس تۆڕێکـی بەرفراوانی هەواڵگرییان هەیە. دەوڵەت هەروەها بە وردی چاودێری دەکات بە سـەر هەوڵەکانی ئێراندا بۆ کەڵکوەرگرتن لە شیعەکانی عێراق دژی دەوڵەتی عێراق (ئایینی شیعە ئایینی فەرمی ئێرانە).

## ٦ـ بەکارهێنانـی لە رادەبـەدەری زەبروزەنگ دژی کـوردەکان و پێشێلکردنی رێوشوێنەکانی مافی مرۆڤ لەکاتی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ خەباتی چەکداری کوردەکاندا

خەڵکـی کوردی عێراق لە سـاڵەکانی ١٩٢٠وە تا ئێسـتا شـەڕی چەکداریـان لەگەڵ دەوڵەتە یەک لـە دوای یەکەکانی عێراق کردووە. بە هەڵگیرسـانی شـەڕی ئێران و عێراق لە سـاڵی ١٩٨٠ خەباتێکی نوێ

لەلایەن کوردەکانەوە دەستیپێکرد و لە کاتی شەڕدا لە پاڵ ئێران یان بە یارمەتی ئێران شەڕیان دەکرد. لە ساڵی ١٩٨١ تا ١٩٨٩ هەوڵەکانی حکوومەت بۆ تێکشکاندنی بزووتنەوەی چەکداری کورد، بووە هۆی کوژرانی نزیکەی ٨هەزار کەس کە گەلێک لەوانە خەڵکی سڤیل بوون و بەبێ فەرق و جیاوازی بە چەکی کیمیایی هێرشیانکرایەسەر لە ساڵی ١٩٨٨ هەرچەندە شەڕی کورد و دەوڵەت لە ساڵی ١٩٨٩ کەم بووەتەوە بەڵام چالاکی چەکداری کورد بەردەوامەو دەوڵەت دەستیداوە بە هەندێ کار بۆ ئەوەی پێشیان پێبگرێت.

خەباتکارانی کورد بەردەوام نەیارییەتی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی راگەیاندووە. لە ٢٩ی ئابی ١٩٨٩ رێبەری گرووپێک لە خەباتکاران لە ژنێڤ بە چاپەمەنییەکانی راگەیاند کە لە عێراق هێرش دەکاتە سەر ئەو دامەزراوە بیانییانە کە پشتیوانی لە رژێمی عێراق دەکەن. هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٨٩ کێشەی بزووتنەوەی کورد و سەرکوتی دەوڵەت هەروا بێ چارەسەر ماوەتەوە.

رژێمی عێراق وەک بەشێک لە هەڵمەتەکەی بۆ لەناوبردنی راپەڕینی کورد و پاککردنەوەی ناوچەی ئەمن لە لە پاڵ سنوورەکانی لە باکوور، درێژە دەدات بە سیاسەتی راگوازتنی سەدان هەزار کورد. هاوکات لەگەڵ ئەوەی زۆربەی ئەم کوردانە گوازراونەتەوە بۆ ناو یا نزیکی شار و شارۆچکە کوردنشینەکان لە دەشتەکاندا، بە گوێرەی هەندێ راپۆرتی پشتڕاستنەکراو، ژمارەیەکی دیکە گوازراونەتەوە بۆ ناوچە غەیرە کوردنشینەکانی عێراق. رژێمی عێراق دەستیداوە بە کاولکردنی بەرفراوانی گوندە کوردنشینەکان و هەندێ لە گوندەکانی مەسیحییەکان و تورکمانەکان، رژێمی عێراق لە ١٩٨٧ بەرنامەی کاولکردنی گوند و شار و شارۆچکە کوردنشینەکانی باکووری عێراقی توندتر کرد و نزیکەی ٥٠٠ هەزار کەس ئاوارە و دەربەدەر بوون. بە هۆی ئەوەی کولتووری

نەریتیـــی کورد زیاتر لە گوندەکاندا رەنگ دەداتەوە، دەرکردنی زۆرەملێ و خاپوورکردنـــی گوندەکان، کاریگەری نەرێنی بووە لە ســـەر ژیانی نیو میلیۆن کورد.

بەرچاوتریـــن نموونەی پێشـــێلکاریی مافی مرۆڤ لـــە ١٩٨٨ روویدا کـــە دەوڵەتی عێراق لە هەڵمەتی تێکشـــکاندنی راپەڕینی دێرینی کورد، پاش ئاگربەســـتی ٢٠ی ئاب لەگەڵ ئێران کەڵکی لە چەکی کیمیایی دژی پێشمەرگە و خەڵکی سڤیل وەرگرت. هێزەکانی عێراق هێرشیان کردووەتە ســـەر گوندەکانی لای سنووری ئێران کە بە گوێرەی بانگەشەکان کوردە راپەڕیوەکان خۆیان تێدا داڵدەدابوو. بە ماوەی چەند رۆژ لە مانگی ئاب، هێزەکانی عێراق کەڵکیان لە چەکی کیمیایی وەرگرت و کتوپڕ پاش ئەم هێرشانە لانیکەم ٦٠ هەزار کورد ئاوارەی تورکیا بوون.

دەوڵەتـــی عێراق هەوڵەکانی خۆی توندتر کردووە بۆ تێکشـــکاندنی راپەڕینی کـــورد لە باکووری عێراق کە بووەتە هـــۆی کوژرانی ٨ هەزار کەس (بە وتەی ســـەرچاوە کـــوردەکان) کە زۆربەیـــان مەدەنین. هێزە چەکدارەکانی عێراق بە شـــێوەیەکی بەرفراوان چەکـــی کیمیاییان دژی خەڵکی ســـڤیل و هێـــزە چەکدارەکان لە کوردســـتانی ئێـــران و عێراق بەکارهێناوە. لە میانەی شـــەڕی ١٦ی ئادار لە نیوان هێزەکانی عێراق و ســـوپای پاسدارانی ئێران لە ناو و نزیکی شاری کوردنشینی هەڵەبجە لە باکووری عێراق ٦٠٠ کەس تا ٣ هەزار کەس بە هۆی چەکە کیمیاییەکانی عێراق کوژران.

لـــە ٨ی ئەیلـــوول وەزارەتی دەرەوەی ئەمریـــکا رایگەیاند کۆمەڵێک بەڵگـــەی لە دەســـتدایە کە هێزەکانـــی عێراق چەکـــی کیمیاییان دژی کـــوردەکان بەکارهێناوە و کەڵکوەرگرتن لەم چەکانەی شـــەرمەزار کرد. لەو کاتـــەوە گەلێ گروپ لەوانە لیژنەیەکی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا، پزیشکانی (رێکخراوی) مافی مرۆڤ و تاقیکارانی بریتانیایی کە نموونەی

خاكەكەيـــان تاقـــی كردووەتەوە ئەوەيـــان پشتڕاســـت كردووەتەوە كە عێـــراق كەڵكی لە چەكی كیمیایی وەرگرتووە. ڕژێمی عێراق حاشـــای لە بەكارهێنانی چەكی كیمیایی دژ بە كوردەكان كردووە.

ڕێكخراوی لیبۆردوونی نیونەتەوەیی (AI) لە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٨٨ی خۆیـــدا ئامـــاژەی بەوە كردووە كـــە لانیكەم ١٧ منداڵـــی كوردیٔ ١٤ تا ١٧ ســـاڵان لـــە مانگی تشـــرینی دووەم و كانوونـــی یەكەمی ١٩٨٧ لە ســـێدارەدراون. AI هەروەها ڕاپۆرتیداوە كە هێزەكانی ئاسایشی عێراق لە تشـــرینی دووەمـــی ١٩٨٧ كوردە نەیارەكانیـــان ژەهرخوارد كردووە. هەروەهـــا بە گوێرەی ڕاپۆرتی AI لە ســـاڵی ١٩٨٥، ٣٠٠ منداڵ و لاوی كورد دەســـتگیر كراون كە تەرمی ٢٩ كەسیان تەسلیم بە بنەماڵەكانیان كراوە كە پێش كوشـــتنیان لە كانوونی دووەمی ١٩٨٧ ئەشكەنجە كراون و ئاسەواری ئەشكەنجە بە تەرمەكانیانەوە دیار بووە.

لــه باڵوێزخانــەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریــکا لە ئەمان بۆ:
وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٨٤٠٥

بابـــەت: دەقـــی گفتوگۆکانـــی عەلی حەســـەن ئەلمەجیـــد لەگەڵ کاریەدەســـتانی باڵای بەعس لـــە ١٩٨٨ دەربـــارەی کیمیابارانکردن و سەرکوتکردنی خەڵکی باکوور

نیسانی ١٩٩٢

بۆ زانیاری:

USIA WASHDC

SECDEF WASHDC

DIA WASHDC

CIA WASHDC

JCS WASHDC

FBIS RESTON VA

USCINCCENT MACDILL AFB FL

لێژنەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە ژنێف

لێژنەی وڵاتانی ئەندامی کۆنفرانسی ئیسلامی

کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنە

١- کورتـــە: ئەمە راپۆرتێکی کورتە لە بارەی ناوەرۆکی ســـێ دانە کاســـێتی دەنگ کە لە ١٩٨٨ تۆمار کراوە. ئەم کاســـیتانە بەڵگەیەکی زۆر روونە کە نیشـــان دەدات رژێمی عێراق ئەو هێزانەی خۆی سزا داوە کە ســـەرپێچیان لە شـــەڕکردن لەگـــەڵ تێکدەرەکان (مخربین) کردووە، گوندنشـــینەکانی لە پێداوێستیە ســـەرەکییەکانی ژیان بێبەشکردوە بۆ ئەوەی ناچاریان بکات کۆچ بکەن بۆ شـــارەکان و ئەو دانیشـــتوە غەیرە عەرەبانەی راگوازتوەتەوە کە وەک هەڕەشـــەی ئەمنی ســـەیری کردوون و فەرمانـــی داوە کە کوردەکان گۆشـــەگیر بکرێن و بـــە ماوەی ١٥ رۆژ

کیمیاباران بکرێن بۆ ئەوەی ئاگربەست رابگەیەنن و لەگەڵ عێراق وتووێژ بکەن. ئەم کاسـیتانە بە شـێوەیەکی بەڵگەمەند زۆر بـە روونی ئەو سەرکوتکاریانە نیشان دەدات کە کەسایەتی سەرەکی عێراق واتا وەزیری بەرگری ئێستای عێراق تا ئەمڕۆ ئەنجامی داوە و لەوانەیە لە بواری هەوڵە گشتی و دیپلۆماتیکەکانماندا سودمەند بێت.

٤- ئەو کاربەدەستە کە ئەم کاسیتانەی خستوەتە دەستی ئێمە، سێ دانە کاسـیتی یەک کاتژمێری لە کاتی سـەردانەکەی بۆ باکووری عێراق لە ١٦-١٨ی ئادار لەگەڵ هێزەکانی «شـالاوی دابینکردنی ئاسـایش» وەدەست خستووە [١٤١]

٥- لە سەر کاسیتەکان ئەم رستەیە بە عەرەبی نوسراوە: «گفتوگۆکانی عەلی حەسەن ئەلمەجید لەگەڵ ئەندامانی حیزب-١٩٨٨». عەلی حەسەن ئەلمەجید پێشـتر وەزیری ناوخۆ بووە و ئێستا وەزیری بەرگری سەدام حوسـەینە و ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشە. عەلی حەسەن ئەلمەجید لە ١٩٨٨ بەرپرسـی فەرمی بەرنامەی راگوازتنەوەی زۆرەملێ و سـەرکووتی کوردەکان بە دەستی رژێمی عێراق بوو. ئێمە زۆر دەنگی تۆمارکراوی ئێسـتای «عەلی حەسـەن مەجید»مان لە بەردەستدا نییە بۆ ئەوەی لەگەڵ دەنگی کاسـیتەکەدا بەراوردی بکەین. عەلی حەسـەن ئەلمەجید لە ناو کاسـیتەکاندا بە ناوی خۆی بانـگ ناکرێت بەڵکوو لە سەرەتادا بە « ئەبور حەسەن» بانگ دەکرێت.

٦- ناوەرۆکی کاسـیتەکان نیشـان دەدات کە بەرواری تۆمارکردنی کاسـیتەکان دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری کۆتاییپێهاتنی شـەڕی ئێران و عێراق. ئێمە نازانین ئەم کاسـیتانە ئەسـڵن یا کۆپـی کراون. هەروەها نازانین کاسـیتەکان پێشـتر بـڵاو کراونەتەوە یان نا. عەلی حەسـەن ئەلمەجید پێشتر لە کاسێتێکدا وتبووی « بە بۆڵدۆزیر (شۆفڵ) دەیانکەم بە ژێر خاکەوە». ئەم وتە بەناوبانگەی عەلی حەسـەن ئەلمەجید لە ناو

ئەم سێ کاسێتەی بەردەستماندا نیە. دەنگی ناو دوو دانە لە کاسێتەکان روونە و بە باشـی دەبیسترێت بەڵام کاسێتی سـێیەم روون نیە، بەڵام ئەگەر لە رووی فەنییەوە دەسکاری بکرێت باش دەبێتەوە.

٧- کاسـێتی یەکـەم: دیوێکـی ٣٢ خولەکە و دیـوی دیکەی ١٨ خولەکە. بابەتە سەرەکیەکانی ئەم کاسێتە بریتین لە سزادانی تێکدەران و هێزەکانی بەرگری نیشـتمانی (کە فەرمانەکانیان جێبەجێ نەکردوە) و ناچارکردنی کوردەکان بە کۆچکردن بۆ شارەکان لە رێگای بێبەشکردنی ناوچە گوندنشـینەکان لە پێداویستیە سەرەکییەکانی ژیان. وادیارە ئەو کەسـانەی کە لە دانیشـتەکەدا ئامادە بوونە بریتین لە عەلی حەسـەن ئەلمەجیـد، پارێزگاری هەولێر و دهۆک و کاربەدەسـتانی دیکەی عێراق لە پارێزگاکانی باکووری عێراق. لە کاسـێتەکەدا دەربارەی ئەم تەوەرانە قسەوباس کراوە: لەسێدارەدانی کاربەدەستە محەلیەکان (کە فەرمانەکانیان جێبەجێ نەکردوە)، دژایەتیکردنی دانی وێسـتەگەکانی فرۆشتنی بەنزین بە کەرتی تایبەت تا ئەو کاتە کە بارودۆخی نائاسایی لە باکوور کۆتایی پێدێت و فەرمانی سـزادانی ٦ یەکینەی هێزی بەرگری نیشتمانی لە بەر ئەوەی کەوتونەتە ژێر کاریگەری دەروونی دەنگۆ و شایعەکانی تێکدەران. سـزاکەیان بریتیە لە بڕینی ٢٥٪ی موچەکەیـان ( یان کادرەکان- واتا میـلاک) و زیندانیکردنـی خێرای ئەو فەرماندانەی کـە لەگەڵ فەرمانی لەناوبردنی تێکدەران هاوڕا نین.

لە کاسێتەکەدا عەلی حەسـەن ئەلمەجید بە ئاماژەکردن بە لێدوانی پێشووی بۆ کۆمیتەی نەوت دەڵێت:

« دەرکردنی خەڵک لە ناوچە گوندنشینەکان بۆ ناوچە شارنشینەکان لە باکوور سودی دەبێت. من هیچ شتێک نادەم بە دانیشتوانی گوندەکان بۆ ئەوەی ناچار بن کۆچ بکەن بۆ شارەکان. بۆ دەبێ هەموو هەفتەیەک ٤ دەبە نەوت بدەم بە گوندنشینەکان، تەنها دەبەیەکیان دەدەمێ، ئاردیان

نادەمی، شەکریان نادەمێ، نەوتیان نادەمێ، کارەبایان نادەمێ یان ئاویان نادەمێ. با بێن بۆ لام بۆ ئەوەی دەنگم ببیسن و بیخەمە ناو مێشکیانەوە ئیدوئلۆژی، کولتوور و هۆشیاری چۆناوچۆنە.»

٨- کاسیتی دووەم: فەرماندەیەکی دیکە قسە دەکات، دیوی یەکەمی کاسیتەکە ٣٠ خولەکە.

عەلی حەسەن ئەلمەجید وادیارە بەرپرسیاریتی «ئیدارەی باکوور»ی حیزبی بەعسی داوە بە کەسێک بە ناوی ئەبوو عەلی[١٤٢] سەرەتا «هەڤاڵ حەسەن» دەڵێت ئەبوو عەلی یەکێ لە ئەندامە کۆنەکانی رێبەرایەتی حیزبی بەعس و ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشە، و ئێستا کە سەقامگیری گەڕاوەتەوە بۆ ناوچە ئەبوو عەلی باشترین کەسە بۆ ئەوەی کاروباری باکوور بەڕێوەببات. «هەڤاڵ حەسەن» ئامادەبوانی کۆبونەوەکە مۆچیاری دەکات پشتیوانی لە ئەبوو عەلی بکەن و ئاماژە بەوە دەکات کە لەوانەیە هێشتا زەبری شمشێر پێویست بێت. عەلی حەسەن ئەلمەجید دەڵێت خۆی وەک راوێژکار و بە شێوەی فەخری هاوکاری ئەبوو عەلی دەکات.

عەلی حەسەن ئەلمەجید باسی ئەو تەعلیمات و رێنوێیانە دەکات کە بۆ وەداوخستنی تێکدەران و سزادانیان داویەتی بە فەرماندەکانی سوپا و ئاماژە بەوە دەکات کە هەندێ لە فەرماندەکانی سوپا هەست دەکەن ناتوانن ئەو تەعلیماتانە جێبەجێ بکەن و خۆیان لە جێبەجێکردنی ئەو تەعلیماتانە دزیوەتەوە. عەلی حەسەن ئەلمەجید ئاماژە بەوە دەکات کە خۆی فەرمانی لە سێدارەدانی ٣٥ کەسی دەرکردوە کە ئەندامی بزووتنەوەی ئیسلامی بوونە و دەڵێت لە ئەنجامی تەعلیماتەکانی ئەودا خراپکاریەکە تا ٤ی ئەیلوول بە تەواوی کۆتایی پێهاتوە، بەڵام بەهەرحاڵ خراپکاریەکانی دیکە واتا خراپکاری بیروباوەڕە سیاسیەکانی نەیاران کۆتایی پێنەهاتوە.

عەلی حەســـەن ئەلمەجید دەڵێت ئێستا ئەرکی حیزبی بەعس ئەوەیە کە لە ڕێگای دامەزراندن و پڕکردنەوەی بۆشـــایی سیاســـی، کۆتایی بە خراپـــکاری ڕۆناکبیران بێنێت. قســـەیەکی ناڕوون لە ناو کاســـیتەکەدا هەیە کە وادیارە ئەوەیە کە عەلی حەســـەن ئەلمەجید ڕەخنە لە یاسای پێشووی ئۆتونومی کوردەکان دەگرێت، چونکە مافی زۆری داوە بە کورد. عەلی حەسەن ئەلمەجید دەڵێت زۆر سەری لەو عەفواتە سڕ ماوە کە بۆ تێکـــدەران دەرکراوە و ئاماژە بـــەوە دەکات کە متمانەی بە هیچ کام لە کاربەدەســـتە کوردەکانی دەوڵەتی عێراق نیە جگە لە پارێزگاری هەولێر و سلێمانی نەبێت.

٩- دیوی دووەمی کاسیتی دوەم ( ٢٧ خولەکە) لە بارەی ڕاگوازتنەوەی زۆرەملێی خەڵک بۆ بەرەنگاربونەوەی تاقمچێتییە:

عەلی حەســـەن ئەلمەجید دەڵێت من توندوتیـــژ یان مرۆڤکوژ نیم و بانگەشـــەی ئەوەدا دەکات کە عەرەب و ئێزیدییەکان ٥١٪ ی دانیشتوانی کەرکووک پێکدێنن. عەلی حەســـەن ئەلمەجیـــد هەروەها مافی ژیان و کارکـــردن لە کەرکوک بۆ کوردەکان قەدەخە دەکات و دەڵێت هەندێ لە کوردەکانم زیندانی کردوە. عەلی حەسەن ئەلمەجید دەڵێت تورکمانەکان وەفایـــان بۆ تورکیە هەیە نە عێراق و هەمـــوو دەرفەتێک بەکاردێنن بۆ ئـــەوەی وەفاداری خۆیان بە تورکیە نیشـــان بـــدەن. ئەلمەجید دەڵێت ئەوانەی کە کەڵک لە عەشیرەچێتی و تاقمچێتی وەردەگرن مەترسیدارن و جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە نابێ ئێمە سونە دژی شیعە بخەینە ناو جموجۆڵی سیاســـی، چونکە خۆمان پارچەپارچە دەکەین و دەیدۆڕینین. ئەلمەجید دەڵێت بریارمانداوە لەم ناوچەیە (مەندەلی و خانەقین- کە ئەو شـــارانەن کە کەوتوەتە نێوان ناوچە کوردنشینەکان و عەرەبنشینەکان) ڕێـــژەی عەرەبەکان نابێت کەمتر لە ٤٠٪ بێـــت. ئەلمەجید دەڵێت دەبێ پشتێنێکی ئاسایش بە دەوری ناوەندەکانی نێشتەجێبوونی خەڵک دروست

بکەین و ئەو کەســـانە کە لە شوێنەکانی دیکە دێن بۆ ئێرە، ئاسانکاری مادییان بۆ بکەین و هاوکارییان بکەین. ئەگەر من هەموو پێداویستیەکانی ژیانیـــان بۆ دابین بکەم و ئەوان لە ڕێگا لابدەن ئێمە دەتوانین ســـزایان بدەین، بەڵام هەروەها کە ئایینی (ئیسلام ) دەڵێت ناتوانین تەرمەکانیان پارچەپارچە بکەین.

١٠- کاســـێتی ســـێیەم: دەربارەی کەڵکوەرگرتنی سیاسی لە ئایین، کیمیابارانکردنی کوردەکان و دانانی پارازیت لە ســـەر رادیۆی نەیاران. ( دیوی یەکەمی کاسیتەکە ٣٢ خولەکە و دیوی دیکەی ٣٢ خولەکە).

دەنگێکی نەناســـراو دەڵێت: «هەڤاڵ ئەبوو حەســـەن هەندێ کەس هـــەوڵ دەدەن ئاییـــن بۆ مەرامی سیاســـی خۆیـــان دژی حیزبی بەعس بەکاربێنن، لقەکانی ســـەرکردایەتی شـــۆڕش دەبێ بەرنامەیەک دابڕێژن، توێژینەوەکان نیشانی داوە کە دەمارگرژی ئایینی لە نێو حیزبدا هەیە کە دەبێ چارەســـەر بکرێت. ئێمە دەبێ سەرچاوەی پشتیوانی خەڵک لەوانە وشک بکەین، بەڵام ئەگەر ئێستا دژی ئەوان دەست بەکار بین بەشێک لە خەڵک پشتیوانیان لێدەکەن و ئیمە دەیدۆڕێنین.»

ئەبوو حەسەن (عەلی حەسەن عەلمەجید) و ئەو کەسەی کە یەکەمجار قسەی کردوە، باسی ئەو کەسانە دەکەن کە ساڵی ١٩٧٧ وەک عەرەب ناویـــان تۆمار کراوە بەڵام ئێســـتا دەیانەوێت وەک کـــورد ناویان تۆمار بکرێت. ئەبوو حەســـەن دەڵێت «ئێزەدیەکان و مەســـیحیەکان عەرەبن، ئێمە یاسامان هەیە، لەوانەیە کەسێک بڵێت من کوردم، عەرەب نیم بەڵام ئێمە پێدەڵێن نا تۆ بیابانشینی».

ئەبوو حەســـەن (عەلی حەسەن عەلمەجید) باسی داواکاریەکی جەلال تاڵەبانی، ڕێبەری PUK (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) دەکات کە وتویەتی ئێمە (PUK) بەرپرسانی بەعس لە بەرامبەر هاوکاریکردنمان لەگەڵ ئێران بە بەرپرســـیار دەزانین و ئەگەر ئاگربەســـت ڕانەگەیەندرێت یان وتووێژ

نەکرێـــت درێژە بـــە هاوکاریکردن لەگەڵ ئێران دەدەین. ئەبووحەســـەن دەڵێت من بە تاڵەبانی (یان ئەو کەسەی کە پەیامەکەی بۆ بردوە) وتومە کە ئێوە دەزانن وەڵامی ئێمە چیە، هیچ ئاگربەســـتێک لە ئارادا نابێت، هیـــچ وتووێژێک لە ئارادا نابێت، بەرنامـــەی ڕاگوازتنەوەی کوردەکان لە گوندەکانیان ڕاناوەستێندرێت.

مـــن بە فەرماندەکانی هێزی بەرگری نیشـــتمانیم وت کە بە تاڵەبانیم وتـــوە کە کیمیابارانتـــان دەکەم، دەبێ چۆڵی بکـــەن، تەنانەت ئەگەر شـــەڕیش کۆتایی پێبێت و ئێـــران لە ناوچە داگیرکراوەکان پاشەکشـــە بکات، ڕاگوازتنەوەی خەڵک ڕاناوەســـتێندرێت. ئێمە ســـەرەتا بەرنامەی ڕاگوازتنەوە بە تەواوی جێبەجێ دەکەین، شاڵاوە سەربازیەکانمان درێژە پێدەدەین و پاشـــان گۆشـــەگیریان دەکەین و نە بـــۆ ڕۆژێک و دوو ڕۆژ بەڵکوو بە ماوەی ١٥ ڕۆژ بە چەکی کیمیایی هێرشیان دەکەینە سەر. پاشان من ئەو کەسانە قبول دەکەم کە چەک دابنێن و ڕادەست بن».

لە درێژەدا کەسێکی نەناسراو دەڵێت دەنگی ڕادیۆی سوریە و تورکیە لە ناوچە دەبیســـترێت. ئەبوو حەسەن فەرمان دەدات: «پەیامێک بنێرن بۆ وەزیری زانیاری. وادیـــارە دەزگایەکی تایبەت لە تەلەعفەر[١٤٣] هەیە. ئێـــوە دەتوانن بەو دەزگایـــە پارازیت بخەنە ســـەر ڕادیۆکانی دیکە. سروشتی خەڵک وایە گوێ لە ڕادیۆی وڵاتانی دیکە بگرن»

کاتێک کە باســـەکە گەیشتە سەر چۆنیەتی ڕاگوازتنەوەی کوردەکان، کاسیتەکە تەواو بوو.

**هاریسۆن**[١٤٤]

## ٢- هەڵەبجە و ئەنفال لە راگەیەندراوە فەرمییەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا

ناوەڕۆکی دیداری جەلال تاڵەبانی لەگەڵ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە، کونفرانسی چاپەمەنی وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە، بەڕێز ریدمان(١٤٥)

١٥ی حوزەیرانی ١٩٨٨

**پرسیار:** هەفتەی رابردوو چاوپێکەوتنێک هەبوو لە نێوان رێبەری کورد، جەلال تاڵەبانی و کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوە. ئایا ئێمە دەتوانین بڵێین وەزارەتی دەرەوە یا دەوڵەتی ئەمریکا ناوبژیوانی دەکات بۆ چارەسەربوونی ناکۆکیەکانی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق، یا چ هۆکارێکی دیکە لە پشتی ئەم دیدارەدایە؟

**ریدمان:** چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز تاڵەبانی لەسەر داوای خۆی بوو. تاڵەبانی لە کاتی سەردانەکەی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داوای کردبوو چاوی بکەوێت بە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە و لە ٩ی حوزەیران لەگەڵ بەرپرسی بەشی کاروباری کەنداوی باکوور لە ئیدارەی رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا دیداری کرد. تاڵەبانی هەروەها لەگەڵ هەندێ لە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە باسی مەسەلەی ئاوارەکان و مەسەلەی مافی مرۆڤی کرد. لەپەیوەندی لەگەڵ کێشەی کورددا کە جەنابت ئاماژەت پێکرد، سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەیە کە کوردەکان دەبێ هەوڵ بدەن لە چوارچێوەی وڵاتانی ناوچە بەشێوەی ئاشتیخوازانە ئامانجەکانیان وەدی بێنن. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەست وەرنادانە کاروباری نێوخۆیی ئەم وڵاتانە.

پرسیار: ئایا ئێوە چاوپێکەوتن لەگەڵ تاڵەبانی بە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی عێراق نازانن؟

**ریدمان: نەخەیر**

# شەرمەزارکردنی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی پێشمەرگە کوردەکان
## بەیاننامەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا
## ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨

لە ئەنجامی هەڵسەنگاندنی ئێمە لە بارودۆخەکە، بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەرکەوتووە کە عێراق لە شاڵاوە سەربازییەکانی دژی پێشمەرگە کوردەکان کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە. ئێمە نازانین عێراق تا چ رادەیەک چەکی کیمیایی بەکارهێناوە بەڵام هەر چەشنە کەڵکوەرگرتنێک لەم چەکانە، کارێکی پاساوهەڵنەگر و دزێوە. ئێمە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی (دژی کوردەکان) شەرمەزار دەکەین، هەروەها کە بەردەوام عێراقمان شەرمەزار کردووە.

بەهۆی کەڵکوەرگرتن لە چەکە کیمیاییەکان دژی ئێران لە شەڕی نێوان ئەو دوو وڵاتەدا ئێمە نیگەرانی قووڵی خۆمان بەنیسبەت رەفتاری دەوڵەتی عێراق دەردەبڕین. دەوڵەتی عێراق باش ئاگاداری هەڵوێستی ئێمەیە. هەڵوێستی ئێمە ئەوەیە کە کەڵکوەرگرتن لە چەکە کیمیاییەکان بەتەواوی پاساوهەڵنەگرە و قبوڵنەکراوە. وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەمیانەی دیدارەکەی پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆی لەگەڵ بەڕێز سەعدون حەمادی، وەزیری کاروباری دەوڵەتی عێراق باسی ئەم مەسەلەیەی کردووە.

## پشتیوانینەکردنی حکوومەتی ئەمریکا لە گەلاڵەیاسایەکی کۆنگرێس بۆ سزادانی عێراق
## ڕاگەیاندراوی جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا، بەڕێز بورلیگ
## ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٨٨

بەڕێز بورلیگ: (١٤٦) ئێمە پشـــتیوانی لـــە ئامانجەکانی ئەم گەلاڵە یاســـایە (١٤٧) دەکەین و لە ســـەر ئەوە شـــێلگیرین کە نەهێڵین عێراق دووبارە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان یا هەرکەسێکی دیکە بەکاربێنێت. ئێمە سپاســـی هەوڵەکانی ئەم کومیتەیە (١٤٨) دەکەین بۆ ئامادەکردنی ئەم گەلاڵە یاســـایە کە ئامانجە هاوبەشەکانی هەموومان دابین دەکات و ئەوە پشتڕاســـت دەکەینەوە کە ڕێژەی کاریگەری ئەم گەلاڵە یاسایە لە گەلاڵە یاساکەی ئەنجوومەنی پیران کەمترە.

ئەگەر ئێمە لەســـەر ئـــەو باوەڕەباین کە نەناردنـــی کالا بۆ عێراق، دەمانگەیەنێتـــە ئەم ئامانجە (بەکارنەهێنانـــی چەکی کیمیایی) بێ هیچ دوودڵییەک پشـــتیوانیمان لە ســـەپاندنی ئەم ئابڵۆقەیە بەسەر عێراقدا دەکـــرد. ڕێگەپێنەدان بە کەڵکوەرگرتـــن لە چەکی کیمیایی لەلایەن هەر کەســـێک و لە هەموو شـــوێنێک، گرینگییەکی یەکجار زۆری بۆ دەوڵەتی ئەمریـــکا هەیـــە. پەیوەندییەکانی ئێمـــە لەگەڵ عێـــراق گرنگە، بەڵام مەسەلەی کەڵکوەرگرتن لە چەکە کیمیاییەکان لە پەیوەندییە دولایەنەکان گرنگترە.

ئێمە ناتوانین پشـــتیوانی لەم گەلاڵە یاســـایە بکەین، چونکە لەسەر ئەو باوەڕەین کە ســـەپاندنی ئابڵۆقە بەســـەر عێراق لەم قۆناخەدا لە لە ئامانجە هاوبەشەکانی ئەم کۆمیتەیە نزیکمان ناکاتەوە کە ئەوەیە عێراق بۆ هەمیشە کۆتایی بە کەڵکوەرگرتن لە چەکە کیمیاییەکان بهێنێت.

هەروەها کە کومیتە ئاگادارە لـــە ١٧ی ئەیلوول، وەزیری دەرەوەی عێراق بەفەرمی جەختی لەســـەر ئەوە کردەوە کە عێراق ڕێز دەگرێت لە

هەموو ڕێوشــوێنەكانی یاسای نێونەتەوەیی، پروتوكولی ١٩٢٥ی ژنێڤ و ڕێككەوتنامەكانی دیكە لە چوارچێوەی یاسا مرۆڤییە نێونەتەوەییەكاندا.

بە بیروبۆچوونی ئێمە ئەمە لێدوانێكی گرنگە و هەنگاوێكی ئەرێنییە. ئێمە لەسەر گرنگی ئەم لێدوانە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق قسەوباس دەكەین. بەتایبەت هەوڵ دەدەین ئەوە پشتڕاســت بكەینەوە كە عێراق لە ناوخۆی وڵات كەڵكی لە چەكــی كیمیایی وەرگرتووە. كەڵكوەرگرتن لەم چەكانە ریسوایەكی ئەخلاقییە و لەلایەن یاسای نێونەتەوەییەوە قەدەخە كراوە، لەوانە كنڤانســیونی ١٩٤٩ی ژنێڤ دەربارەی پاراستنی خەڵكی سڤیل لە كاتی جەنگدا.

ئەگەر ئەنجامی قسەوباســەكانمان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق دڵخۆشكەر نەبێ یا نیشــانەیەك هەبێ بەنیسبەت ئەوەی عێراق دیسان لە داهاتوودا كەڵك لە چەكی كیمیایی وەردەگرێتەوە، ئێمە ئەم هەڵوێستەمان دووپات دەكەینەوە. بەڵام ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین كە پەسەندكردنی ئەم یاسایە لە ئێســتادا زیان لە پەیوەندییەكانمان لەگەڵ عێراق دەدات و هەروەها زیــان دەگەیەنێت بــەو كۆمپانیا ئەمریكاییانە كــە كەلوپەل دەنێرن بۆ عێــراق. ئێمە دەبێ زۆرتر بۆ ئەو ئامانجە هەوڵ بدەین كە عێراق كۆتایی بە كەڵكوەرگرتن لە چەكی كیمیایی بێنێت.

## راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە بارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٨٨
## لێدوانی جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری مافی مرۆڤ
## ٨ی شوباتی ١٩٨٩

ریچارد شیفتێر: لەپەیوەندی لەگەڵ بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق لە ساڵی ١٩٨٨، دەبێ سەرنج بدرێت بە چارەنووسی گەلێ لە کوردەکان لـــە عێراق. هیچ گومان لەوەدا نییە کـــە چەند گروپێکی گرنگی کوردی عێراق، ماوەی چەند ســـاڵە دژی دەوڵەتی عێراق خەبات دەکەن، بەڵام کاردانەوەکـــەی دەوڵەتی عێراق لە ســـەروبەندی کۆتاییپێهاتنی جەنگی ئێران و عێراق، بەڕاستی هەژێنەر بوو.

لە ئەنجامی دوو هێرشـــی عێراق بۆ ســـەر شـــارە کوردنشینەکان، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی سڤیل کوژراون. بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکان لە ماوەی دوو ســـاڵی ڕابردوودا پتر لە ٨ هەزار کەس کوژراون و پتر لە ٥٠ هەزار کوردی عێراق لە ترسی هێرشی کیمیایی عێراق ( ئەم ترسە لە جێـــی خویدا بووە) لە ڕۆژانی کۆتایـــی مانگی ئاب هەڵاتوون بۆ تورکیا. هەروەها لە دوو ســـاڵی رابردوودا پتر لە ٥٠ هەزار کەسی دیکە هەڵاتوون بۆ ئێران.

هەروەها لە ســـاڵی ١٩٨٨ عێراق درێژەیدا بە بەرنامەی گوازتنەوەی کوردەکان لە ناوچە گوندنشـــینەکان بۆ شارەکان و هەروەها بۆ ئوردوگا زۆرەملێیەکان.

بنەمای بژیوی کشتوکاڵی ئەم خەڵکە بەتەواوی لە ناو چووە و زیاتر لە ٥٠٠ گوند بەتەواوی کاول کراون. کەوابوو ژمارەی ئەو کەســـانەی کە لە زێدی خۆیان دەرکراون و گوازراونەتەوە بۆ شوێنەکانی دیکە، زیاتر لە نیو میلیون کەس دەخەملێندرێت.

# راپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە بارەی بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق و ناوچە کوردنشینەکان لە ساڵی ١٩٨٩

## لێدوانی «جۆشوا گیلدێر»، جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری مافی مرۆڤ ١٥ی حوزەیرانی ١٩٩٠

٦- پەیوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ عێراق

مافی مرۆڤ لە عێراق رێزی لێناگیرێت. هەروا کە وردەکارییەکانی راپۆرتەکەی ئێمە نیشان دەدات هاووڵاتیانی ئاسایی عێراق هیچ ئاسایشێکی تاکەکەسییان لەبەرامبەر دەستدرێژییەکانی حکومەت نییە. بێسەروشوێنکردن و لەسێدارەدانی نهێنی بە کۆمەڵ روودەدات. هەندێ جار بنەماڵەکان کاتێ ئاگادار دەبن کە یەکێ لە ئەندامانی خۆشەویستی بنەماڵەکە لەسێدارەدراوە کە هێزە ئەمنییەکان تەرمەکەی ڕادەست دەکەنەوە و داوا لە بنەماڵەکەی دەکەن پارەی لەسێدارەدانەکەشی بدا بە حکوومەت. ئەمەیە روانگەی رژێمی عێراق بەنیسبەت دادپەروەری.

سزای دەربڕینی بیروڕا توند و دڵڕەقانەیە. ئێمە دەزانین کە لە دە ساڵی رابردوودا بە دەیان هەزار کەس (ئامارێکی ورد و ڕاست لە دەستماندا نییە) لەلایەن هێزە ئەمنییەکانەوە گیراون بە تۆمەتی ئەوەی کە دژایەتی حکوومەت دەکەن. لە کاتێکدا کە سیستەمی دادی عێراق ریسا ناوچەییەکان بەنیسبەت ئەو کەسانە کە تاوانی غەیرە سیاسییان ئەنجامداوە رەچاو دەکات بەڵام بەنیسبەت ئەوانەی کە تۆمەتی سیاسییان خراوەتەپاڵ رێسا ناوچەییەکان رەچاو ناکات. دەبی ئەوەش زیاد بکەین کە بازنەی سووچە سیاسییەکان بەرفراوان پێناسە کراوە بۆ ئەوەی سووچە ئاساییەکانیش لەخۆ بگرێت.

ئەشکەنجەکردنی تۆمەتبارە ئەمنی و ئاساییەکان، شتێکی ئاساییە و ئەو دانپێدانانەی کە لەژێر ئەشکەنجەدا وەردەگیرێن لە دادگادا متمانەپێکراون. دەستبەجێ پاش دەسبەسەربوون و لە کاتی

لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوەدا (کە لەوانەیە چەند مانگ درێژەی هەبێت) بە خراپترین شێوە هەڵسوکەوت لەگەڵ تۆمەتبارەکان دەکرێت.

بە هۆی سرووشـــتی زۆر نهێنیپارێز و سەرکووتکاری رژێمی عێراق، کۆکردنەوەی زانیاری ورد و راست سەبارەت بە بارودۆخی مافی مرۆڤ لە عێراق لە رادەبەدەر دژوارە. هاتوچۆی دیپلۆماتەکان زۆر بەرتەسک کراوەتەوە و زۆربەی عێراقییەکان دەترســن بیروبۆچوونی خۆیان لای بیانییەکان و کەسانی دیکە دەرببڕن.

رژێمـــی عێراق لە رادەبەدەر ســـەرەڕۆیە. لەم نێـــوەدا تەنها یەک هەلاوێر (ئیستســـنا) هەیە، ئەویش بەجێهێنانـــی کاروباری ئایینییە. هەروەها هەندێ هەوڵدراوە بۆ باشـــترکردنی بارودۆخی ئابووری وڵات کە ئەم هەوڵانە ئێستا راوەستاوە

بەهەرحاڵ بەگشتی رژێمی عێراق لە هەوڵەکانیدا بۆ کۆنترۆڵکردنی هەمەلایەنەی خەڵک دڵڕەقە. بەشـــێک لـــەم کۆنترۆڵکردنە لە رێگای دەزگای حیزبی بەعســـەوە ئەنجـــام دەدرێت. حیزبی بەعس حیزبێکی نهێنییـــە کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی کـــردووە بە ئەندامی خۆی و بڕیاردان تەنها بە دەســـتی چەند کەســـێکەوەیە لە ئاستی سەرەوە. ئەوانەی ئاســـتی خوارەوە وەک ســـیخوڕ کاردەکەن بۆ کۆکردنەوەی زانیاری سیاسی لە بارەی دراوسێکانیانەوە. کۆمەڵێک تۆڕی سیخوڕی دیکەش هەیە کە لە رێگای ئەوانـــەوە حکوومەت کۆنترۆڵی کاروباری هاووڵاتیان دەکات و چاودێرییەکی باش بە ســـەر کاروباری ســـوپا و کاروباری خێرای حیزبی بەعســـدا دەکات. پێشـــتر باســـی سزای ئەو کەســـانەمان کـــرد کە لەم هێڵـــە لادەدەن یان حکوومـــەت متمانەی پێیـــان نامێنێ. لە ماوەی دوو ســـاڵی رابردوودا حکوومەت چەند جار رایگەیاندووە چەند پیلانێکی ســـەرەتایی بۆ کودتای سەربازی لە ناو ســـۆپادا پوچەڵ کردووەتەوە. ســـەدان کەس گیراون و ئێمە نازانین چەند کەس لەسێدارە دراون.

حیزبی بەعس حیزبێکی پان عەرەبییە، هەربۆیە هەموو عەرەبەکانی - سەربە هەر ئایینێک یان تاقمێک بن- لە دەوری خۆی کۆکردوەتەوە بـەڵام نەیتوانیـوە پێگەیەکی ئیدۆلۆژیک لە نێـو هاوولاتیانی غەیرە عەرەبـی عێراق پەیـدا بکات کە زۆربەیان کـوردن. ئەم نامۆبوونەی کورد پێش لە بە دەسەڵاتگەیشتنی حیزبی بەعسیش هەر بووە، بەڵام ئێسـتا سیاسەتی دەوڵەت بووەتە هۆی پێشێلکردنی بەرفراوانی مافی مرۆڤ.

بەنیسبەت کوردەوە، دەوڵەتی عێراق «سیاسەتی گۆپاڵ و گێزەر»ی پەیڕەو کردووە و بە شـوێن ئەوەدا بووە هەتا پێیدەکرێت پشتیوانی عەشیرەتە کوردەکان بە دەست بهێنێت و لە سیاسەتی ئازادی کولتووری ئەتنیکـی کەڵکوەردەگرێت. ناوچەی ئوتونومی کوردسـتان هەیە کە خاوەن دامەزراوەگەلی تایبەتی خۆیەتی و پشـتیوانی لە عەشـیرەتە کوردەکانی لایەنگری رژیم دەکات. زمان و کولتووری کوردی گەشـەی پێدەدرێت و پەروەردە بە زمانی کوردی هەتا قۆناخی ناوەندی هەیە.

بەڵام گۆپاڵی سیاسـەتی عێراق زۆر دڕندانەیە. لە کاتی شـەڕی کەنـداو- کـە ئێران کەڵکی لـە ناڕازیبوونی عەشـیرەتە کوردەکان وەرگرت- دەوڵەتی عێراق شاڵاوی کاولکردنی گوندە گومانلێکراوەکانی دەسـتپێکرد و گوندنشینەکانی لە شار و شـوێنە نوێکاندا نیشتەجێ کـرد تا لە نزیکەوە چاودێریان بە سـەردا بکات. پاش ئاگربەسـتی عێـراق و ئێـران، عێراق بۆ دەرکردنی راپەڕیوان لە شـوێنەکانی ژێر دەستیان، بە بێ فەرق و جیاوازی کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرت کـە لە ئەنجامـدا هەزاران پیاو، ژن و منداڵ کـوژران. پاش ئەوەی سـەربازانی عێراق ئەم ناوچانەیان گرتـەوە، کاولکردنی گوندەکان و شارۆچکەکان و گوازتنەوەی دانیشتووەکانیان خێراتر بوو و سەرەنجام نزیکەی ٥٠٠ هەزار کەس- ١ لە٧ی سـەرجەم دانیشـتوانی کوردی عێراق- دەربەدەر بوون. ئەگەرچی ئێسـتا کاربەدەستانی عێراق رێگا

بەوە دەدەن گوندنشـــینە دەربەدەرکراوەکان ســـەردانی زێدی خۆیان بکـــەن تا زەوییەکانیان بکێڵـــن و باخەکانیان ئاوەدان بکەنەوە، بەڵام ئێمە بەنیســـبەت ئاکام و لێکەوتە گشـــتییەکانی ئەم دەربەدەرکردنە بەرفراوانە نیگەرانین.

ســـەبارەت بە نیگەرانی ئێمە لە بـــارەی رەفتاری دەوڵەتی عێراق لەگەڵ کوردەکانی عێراق، هەڵوێستی ئێمە ئەوە نییە کە لەگەڵ ریشە و ئامانجەکانی راپەرینی کورددا بیـــن، بەڵکوو ئەوەیە کە لەبەرامبەر ئەو پێشـــێلکاریانەی مافی مرۆڤ هەڵوێســـت بگرین کە لە ئاســـتی نێونەتەوەییدا بە فەرمی ناســـراون. دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە یەکپارچەیی خاکی وڵاتانی ئەم ناوچەیە دەکات و جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە کوردەکان دەبێ لەم چوارچێوەیەدا هەوڵ بدەن بە شێوازی ئاشتیخوازانە بکەن بە ئامانجەکانیان.

لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا دەوڵەتی عێراق نیازی خۆی دەربڕیوە بۆ ئەنجامدانی چاکسازی. ئێســـتا کەندوکۆسپەکانی سەفەرکردن لە کاتی شـــەڕدا هەڵگیراون و بە ژمارەیەکـــی زۆر لە عێراقییەکان ئیزن دەدرێت بۆ یەکەم جار لە ماوەی ٨ســـاڵی رابردوودا سەفەری دەرەوە بکەن. هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی لە نیسان و ئەنجوومەنی ئۆتۆنۆمی کوردســـتان لە ئەیلوولی ١٩٨٩ بەڕیوەچووە. ژمارەیەک لە کاندیدا ســـەربەخۆکان لەم هەڵبژاردنانەدا ســـەرکەوتن و هەندێک لە ئەندامانی حیزبی بەعس سەرنەکەوتن. بەهەرحاڵ سەرجەم کاندیداکان دەبێ سەر بە حکوومەت بن و هیچ کەس خاوەنی دەسەڵاتێکی ئەوتۆ یان کاری یاسادانان نییە بەو شێوازە کە دەبێ هەبێ. یاسای بنەڕەتیی نـــوێ ئامادەکراوە و لە مانگی کانوونی دووەم تەســـلیمی ســـەرۆک کۆمار کراوە. بە گوێرەی راپۆرتەکانی ئەم دواییانەی چاپەمەنییەکانی عێراق، ئەم یاســـایە لە لێژنەیەکی ٦ کەسی لە ئەندامانی رێبەرایەتی عێراق تێپەڕیـــوە و دەخرێتە رێفراندۆمی گشـــتی خەڵک. بەهەرحاڵ

پەســـەندكردنی یاسای بنەڕەتی شتێكە و ڕێز گرتن لە یاساكە شتێكی دیكەیە. یاســـای بنەڕەتی ئێستای عێراق هەندیک خاڵ لەخۆ دەگرێت بۆ ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و قەدەغەكردنی ئەشكەنجە و سەربەخۆیی سیستمی داد كە هیچكام لەم خاڵانە ئێستا جێبەجێ ناكرێت.

ئەگـــەر عێراق دەیەوێت كۆتایی بەو ڕەخنانە بێنێت كە كۆمەڵگای نێونەتەوەیی سەبارەت بە پێشێلكردنی مافی مرۆڤ لێیدەگرێت، دەبێت هەندێـــك هەنگاوی جیدی و ڕاســـتەقینە هەڵگرێت، دەبێت كۆتایی بە كەشـــوهەوای ترساندن و تۆقاندن لە لایەن دەزگای ئەمنەوە بهێنێت و هەڵبژاردنگەلێكی بە واتا بەڕێوە ببات نە هەڵبژاردنێكی شـــانۆیی و لە هەموو شـــت گرینگتر ئەوەیە كە بـــە ڕێزەوە لەگەڵ هاووڵاتیانی خۆی ڕفتار بكات و ئەو هەل و دەرفەتەیانە پێبدات بە ئاسایشەوە لە ماڵی خۆیاندا بژین و دوور بن لە هەڕەشەی سەركوت و توندوتیژی دەوڵەت كە لە هەموو شوێنێكدا هەیە.

## «ڕێکخراوی شەهیدانی هەڵەبجە« تەقینەوەی لە بەغداد ئەنجامداوە
## راپۆرتی وەزارەتی دەرەوە ئەمریکا بە کۆنگرێس
## ٣٠ نیسانی ١٩٩٠

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٨٢ تا ئێستا عێراقی لە لیستی ئەو وڵاتانە کە پشـــتیوانی لە تروریزم دەکەن، دەرهێناوە. پاش دەرکرانی عێراق لەرێکخراوی نێونەتەوەیی ANO لە ساڵی ١٩٨٣، عێـــراق بەردەوام کاری کردووە بۆ ئـــەوەی وێنەی نێونەتەوەیی خۆی چاک بکاتەوە. عێراق لە ســـاڵی ١٩٨٩ پشتیوانی لە هیچ کردەوەیەکی تروریســـتی نەکردووە، بەڵام بەهەرحاڵ درێژە بە هەوڵەکانی داوە بۆ داڵدەدانی هەندێک لە گروپە فەلەســـتینەکان، لەوانە «بەرەی ئازادی عەرەب» کە عێراق دروســـتی کردووە و «بەرەی ئازادی فەلەستین» سەر بە ئەبوعەباس کە بەرپرسیاری بەبارمەتەگرتنی فڕۆکەی Achille Lauro لە ساڵی ١٩٨٥ و کوشتنی موسافرە ئەمریکاییەکانیەتی.

هەروەها راپۆرتی چاپەمەنیەکان نیشان دەدات کە ئەبو ئیبراهیم، رێبەری پێشووی «رێکخراوی تروریســـتیی لەناوچووی ١٥ی گوڵان» گەڕاوەتەوە بۆ عێراق. ئەبو ئیبراهیم بە شـــارەزابوون لە دروستکردنی بۆمبی کوشندەی جانتایی بەناوبانگە. عێراق درێژە بە پشتیوانیکردن لـــە گروپەکانی نەیـــاری دەوڵەتی ئێران دەدات لەوانـــە موجاهیدینی خەلق (MEK).

لە ســـەرەتای مانگی تەموزەوە، چەند هێرشـــێکی ترۆریستی لە بەغـــداد روویداوە، لەوانە تەقاندنەوەی بۆمـــب کە ئامانجی بیانیەکان بووە. بەرپرســـیارانی ئەم هێرشـــانە دیارنین هەرچەند کە رێکخراوێک بە ناوی «رێکخراوی یەکگرتووی شـــەهیدانی هەڵەبجە« کە گروپێکی توندڕەوی کوردە بەرپرسیارێتی یەکێ لەم هێرشانەی وەئەستۆ گرتووە کـــە تەقاندنەوەی بومب بووە لە کلوبی نوێی بریتانیا کە ٢٠ کەســـی

بریندار کردووه . هەروەها لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەم، پاشنیوەڕۆیەک بومبێک لە شەقامی سەرەکی بازرگانی بەغداد تەقیوەتەوە و ژمارەیەکی زۆر ڕێبواری کوشتوە و بریندار کردووە .

کاربەدەســتانی عێراق لەگــەڵ FAA (١٤٩) کار دەکەن بۆ ئەوەی بارودۆخی ئەمنی فڕۆکەخانەی بەغداد باشتر بکرێت.

## یەکەم لێدوانی وەزارەتی دەرەوە دەربارەی کیمیابارانی هەڵەبجە
## وەزارەتی دەرەوە
## ١٦ی ئاداری ١٩٩٨

جەیمز روبین(١٥٠)، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە:

لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ ســوپای عێراق بە چەکی کیمیایی هێرشــی کردەســەر هەڵەبجە کە شارۆچکەیەکی کوردنشینە لە باکووری عێراق و لە ئەنجامدا ٥ هەزار کەســی مەدەنی کوژران و زیاتر لە ١٠ هەزار کەس برینداربوون. ڕژێمی عێراق تەنها لە کاتی شــاڵاوەکەی دژی هاووڵاتیانی سڤیلی کوردی عێراق کە کۆمەڵکوژی هەڵەبجە یەکێک لەوانە بوو، چەکی کیمیایــی بەکارنەهێنا بەڵکــوو نزیکەی ٢٠ هەزار ســربازی ئێران لە ١٩٨٣ تا ١٩٨٨ لە کاتی شــەڕی ئێران و عێراقدا لە ئەنجامی هێرشــە کیمیاییەکانی عێراق کوژران.

ڕژێمی عێراق قەد نەیوتووە لە کیمیابارانکردنی هەڵەبجە پەشــیمانە. لەراستیدا ڕژێمی عێراق داکۆکی لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە کاتی شەڕەکەی لەگەڵ ئێران کردووە و بانگەشەی ئەوەی کردووە کە: «هەموو نەتەوەیەک مافی ئەوەی هەیە خۆی لە بەرامبەر داگیرکاریدا بپارێزێت». ئەمــە لە کاتێکدایە کە پرۆتۆکۆلی ســاڵی ١٩٢٥ی ژنێڤ کە عێراقیش واژۆی کردوە، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی قەدەغە کردووە.

ئێستا دوای تێپەڕبوونی ١٠ ساڵ بەسەر کیمیابارانی هەڵەبجە هێشتا

خەڵکی هەڵەبجە بەدەست ئاسەوارەکانی هێرشە کوشندەکەی ١٦ی ئادارەوە دەناڵێنن، لەوانە زۆربوونی ڕێژەی توشبوون بە نەخۆشیگەلی جدی وەک شێرپەنجە، ناتەواو بەدنیاهاتنی منداڵ و لەبارچوونی منداڵ.

ئەمڕۆ بەتایبەت لایەنگرانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەگەڵ خەڵکی هەڵەبجەدان و ئێمە بەیادی خۆمان و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەهێنینەوە کە نەتەوە یەکگرتوەکان نابێ بهێڵێت کە عێراق دەست بە بەرنامەی چەکە کۆمەڵکوژەکانی بکاتەوە. تەنیا ڕێگا بۆ ئەوەی لەوە دڵنیابین کە ڕژێمی سەدام حوسەین جارێکی دیکە ناتوانێت چەکی کۆمەڵکوژی هەبێت یان دژی خەڵی عێراق یان خەڵکانی دیکە بەکاری بێنێت، ئەوەیە کە پشکنەرانی چەکی سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان خێرا، بێ شەرتومەرج و بێسنوور سەردانی هەموو شوێنەکانی عێراق بکەن.

## وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا
## ساڵیادی کۆمەڵکوژی هەڵەبجە
## ١٦ای ئاداری ٢٠٠٠

جەیمز روبین[١٥١]، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە: بە بۆنەی جەژنی قوربان پیرۆزبایی لە سەرجەم مسڵمانانی جیهان دەکەین. هەروەها لەم ڕۆژەدا دوازدەیەمین ساڵوەگەڕی هێرشی کیمیایی سەدام حوسەین بۆ سەر هەڵەبجە کە شارێکی کوردنشینە لە باکووری عێراق بەرز ڕادەگرین.

بە هۆی ئەوەی ئەمساڵ جەژنی قوربان هاوکاتە لەگەڵ ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجەدا، گەلێ لە مسڵمانان لە هەرێمی کوردنشین جەژنی قوربان بەڕێوەنابەن.

بە هۆی ئەوەی لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ هێزی هەوایی عێراق هەڵەبجەی بە گازی موستارد و گازە کوشندەکانی دیکە بومباران کرد، نزیکەی ٥ هەزار خەڵکی مەدەنی کوژران و ١٠ هەزار کەسی دیکە بریندار بوون. ١٢ ساڵ دوای ئەو کۆمەڵکوژییە، خەڵکی هەڵەبجە هێشتا بە دەست

نەخۆشیگەلێکی جدی وەک شێرپەنجە و ناتەواو بەدنیاهاتنی منداڵ ئیش و ئازار دەکێشن. قوربانیانی هەڵەبجە شایانی دادپەروەری و پشتیوانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیین.

کیمیابارانی هەڵەبجە کە تاوان دژی مرۆڤایەتی بوو، نیشانەی مێژووی دووروودرێژی رەفتارە تاوانبارانەکانی رژێمی سەدام حوسەینە. ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەمێژە داوا دەکات دادگایەکی نێونەتەوەیی پێکبێت بۆ لێکۆڵینەوە، سکالاکردن و ئەگەر بکرێت سزادانی سەدام حوسەین و داروودەستەکەی بە بۆنەی ئەو تاوانانەی کە ئەنجامیانداوە و تا ئەمڕۆ لە باشوور و ناوەراستی ولات بەردەوامە. ئێمە پشتیوانی لە هەوڵە نێونەتەوەیەکان دەکەین بۆ کۆکردنەوەی بەڵگە لەسەر ئەو تاوانانەی کە عێراق دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجامیداوە و دەبێ بەو بۆنەیەوە سزا بدرێت. لێپرسینەوە و دادگاییکردنی سەدام حوسەین بە هۆی پێشێلکردنی جارنامەی جیهانی مافی مرۆڤ، زۆر دواکەوتووە.

ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە مێژووی خۆیدا پشتیوانی لە لێپرسینەوە و سزادانی ئەو کەسانە کردووە کە ژینۆساید و تاوانەکانی دیکەیان دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجام داوە. ئێمە بە هەمان شێوە پشتیوانی لە لێپرسینەوەی بەرەبەرە لە گەڵ ئەو کەسانە دەکەین کە لە بەرامبەر کیمیابارانی هەڵەبجە بەرپرسیارن. ئێمە چاومان لەو رۆژەیە کە ئەو کەسانە کە فەرمانی کیمیابارانکردنی هەڵەبجەیان داوە لە دادگایەکی نێونەتەوەییدا لە عێراقێکی ئازاد و دیموکرات یان هەر ولاتێکی دیکە سزا بدرێن. تاوانەکانی عێراق دژی مرۆڤایەتی وەک کیمیابارانکردنی هەڵەبجە هیچ سنوورێک ناناسێت و ئەم تاوانانە لەبیرناچێت. کیمیابارانی هەڵەبجە بەدەستی سەدام حوسەین تەنها یەک رووداو نەبوو بەڵکوو بەشێک بوو لە شالاوێکی چڕوپڕ دژی هاوولاتیانی کوردی مەدەنی عێراق کە سەدام حوسەین فەرمانی دەرکردبوو و عەلی حەسەن، ناسراو بە عەلی کیمیایی بەرێوەی دەبرد.

بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی چاودێرە نێونەتەوەیەکان، هێزەکانی عێراق

٥٠ هەزار تا ١٠٠ هەزار کەسیان لە شالاوی «ئەلئەنفال» لە سالّی ١٩٨٨ کوشتووە. رژێمی عێراق هەروەها لەکاتی شەڕی ئێران و عێراقدا، لانیکەم ٥ هەزار ئێرانی بە چەکی کیمیایی کوشتووە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن رێکەوتننامەیەکی نێونەتەوەیی لە سالّی ١٩٢٥ کە عێراقیش واژۆی کردووە، قەدەخەکراوە.

## وەزارەتی دەرەوە سالّیادی کۆمەڵکوژی هەڵەبجە
## ١٦ی ئاداری ٢٠٠١

ریچارد بوچێر[١٥٢]، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە:

ئەمڕۆ سیانزەیەمین سالّیادی هێرشی کیمیایی سەدام حوسەین بۆ سەر هەڵەبجەیە کە شارێکی زۆرتر کوردنشینە لە باکووری عێراق. لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ هێزی هەوایی عێراق هەڵەبجەی بە گازی موستارد و گازە کوشندەکانی دیکە بومباران کرد، نزیکەی ٥ هەزار خەڵکی مەدەنی کوژران و ١٠ هەزار کەسی دیکە بریندار بوون. ١٣ سالّ دوای ئەو کۆمەڵکوژییە، خەڵکی هەڵەبجە هێشتا بە دەست نەخۆشیگەلێکی جدی وەک شێرپەنجە، تەواونەبوونی دەماخ و دەمار، ناتەواو بەدنیاهاتنی منداڵ و لەبارچوونی منداڵ ئیش و ئازار دەکێشن.

کیمیابارانی هەڵەبجە بەدەستی سەدام حوسەین تەنها یەک رووداو نەبوو بەڵکوو بەشێک بوو لە شالاوێکی چڕوپڕ دژی هاوولاتیانی کوردی سڤیلی عێراق کە سەدام حوسەین فەرمانی دەرکردبوو و عەلی حەسەن، ناسراو بە عەلی کیمیایی بەڕێوەی دەبرد. بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی چاودێرە نێونەتەوەییەکان، هێزەکانی عێراق ٥٠ هەزار تا ١٠٠ هەزار کەسیان لە شالاوی «ئەلئەنفال» ( کە بە واتای دەستکەوتەکانی جەنگە) لە سالّی ١٩٨٨ کوشتوە. رژێمی عێراق هەروەها لەکاتی شەڕی ئێران و عێراق لە ١٩٨٣ تا ١٩٨٨، هەزاران ئێرانی بە چەکی کیمیایی کوشتووە.

ئێمە چاومان لەو رۆژەیە کە ئەو کەسانە کە فەرمانی کیمیابارانکردنی هەڵەبجەیان داوە لە دادگایەکی نێونەتەوەییدا لە عێراقێکی ئازاد و دیموکرات یان هەر وڵاتێکی دیکە، دادگایی بکرێن و سزا بدرێن. ئەم تاوانانە لەبیر ناچن. هاوکات لەگەڵ ئەوەی ساڵیادی هەڵەبجە وەبیر دێنینەوە، دەبێ خۆمان و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی دڵنیا بکەینەوە کە نابێ رێگا بە رژێمی سەدام حوسەین بدرێت بەرنامەی پەرەپێدانی چەکی کۆمەڵکوژ سەرلەنوێ دەستپێبکاتەوە.

## وەزارەتی دەرەوە جۆرج بوش: سەدام چەکی کۆمەڵکوژی دژی خەڵکی سڤیلی بێ گوناح بەکارهێناوە

## ١٤ی ئاداری ٢٠٠٣

ریچارد بوچێر، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە:

رۆژی یەکشەمە پانزەیەمین ساڵیادی هێرشی کیمیایی سەدام حوسەین بۆ سەر هەڵەبجەیە کە شارێکی زۆرتر کوردنشینە لە باکووری عێراق. لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ سوپای عێراق هەڵەبجەی بە گازی موستارد و گازە کوشندەکانی دیکە بۆمباران کرد، نزیکەی ٥ هەزار خەڵکی مەدەنی کوژران و ١٠ هەزار کەسی دیکە برینداربوون. ١٥ ساڵ دوای ئەو کۆمەڵکوژیە، خەڵکی هەڵەبجە هێشتا بە دەست تەواونەبوونی دەماخ و دەمار، ناتەواو بەدنیاهاتنی منداڵ، لەبارچوونی منداڵ و نەخۆشیگەلی جدی و شێرپەنجە ئێش و ئازار دەکێشن.

کیمیابارانی هەڵەبجە تەنها یەک رووداو نەبوو، بەڵکوو بەشێک بوو لە شاڵاوێکی چڕوپڕ دژی هاووڵاتیانی کوردی مەدەنی لە ناوچە کە سەدام حوسەین فەرمانی دەرکردبوو و عەلی حەسەن، ناسراو بە عەلی کیمیایی بەڕێوەی دەبرد. بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی چاودێرە نێونەتەوەیەکان، لەم شاڵاوەدا هێزەکانی عێراق ٥٠ هەزار تا ١٠٠ هەزار کەسیان لە

ساڵی ١٩٨٨ کوشـــتووه. عێراقیەکان بەم شاڵاوە دەڵێن «ئەلئەنفال» کە بە واتای دەســـتکەوتەکانی جەنگە. رژێمی عێـــراق هەروەها لەکاتی شـــەڕی ئێران و عێراق لە ١٩٨١ تا ١٩٨٣ چەکی کیمیایی بۆ کوشتن و بریندارکردنی هەزاران ئێرانی بە کار هێنا.

ســـەرۆک بوش لە دوایین لێدوانی خۆی بۆ کۆمەڵانی خەڵکی ویلایەتە یەکگرتوەکانـــی ئەمریـــکا ئاماژەی بـــەم کردەوانەی عێـــراق و کردەوە لەمێژینەکانـــی دیکەی وەک ئەشـــکەنجەدان و ئازار و ئەزیەتدانی خەڵک کردووە. هەروەها کە ســـەرۆک بوش وتی رژێمی عێراق ســـوکایەتی بە مافی مرۆڤ و رێکەوتننامە نێونەتەوەیەکان کردووە و چەکی کۆمەڵکوژی دژی خەڵکـــی مەدەنی بێ گوناح بەکارهێناوە، کەوابوو « ئەگەر رژێمی سەدام شەیتان نەبێت، کەواتا شەیتان مانای نییە».

ویلایەتـــە یەکگرتوەکانـــی ئەمریـــکا ئەم دەرفەتـــە بەکاردێنێت بۆ وەبیرهێنانـــەوەی یادی هەزاران هەزار خەڵکی ئاســـایی (کە زۆربەیان منداڵی بێ گوناە بوون) کە بەدەســـتی رژێمی دڕندەی ئێستای عێراق کوژران و ئازاردران و جەخت لە ســـەر ئەرک و بەرپرســـیارێتی ئەمریکا دەکاتەوە بۆ ئەوەی ســـەدام حوسەین و داروەستەکەی جارێکی دیکە نەتوانـــن چەککەلێکـــی وا دژی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی، دراســـێکانی و هاوڵاتیانی خۆی بەکاربێنن.

## کۆشکی سپی لێدوانی سەرۆک بوش لە بارەی ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجە و ئامادەکاری بۆ روخاندنی رژێمی عێراق
### ١٥ی ئاداری ٢٠٠٣

سـەرۆک کۆمار: بەیانیتان بـاش. ئەم هەفتەیـە وەبیرهێنەرەوەی سـاڵیادێکی تاڵە بۆ خەڵکی عێراق. ١٥ سـاڵ لەمەوپێش رژێمی سەدام حوسـەین فەرمانی کیمابارانکردنی گوندێک لە باکووری عێراق بە ناوی هەڵەبجەی دەرکـرد. تەنها بەو فەرمانە، رژێمی عێراق هەزاران هاووڵاتی کوردی عێراقی کوشت. سەرجەم ئەندامانی بنەماڵەکان گیانیان لەدەستدا لە کاتێکدا کە هەوڵیاندەدا لە گازی کیمیایی موسـتارد و دەمار کە لە ئاسـمانەوە دەباری، رابکەن. گەلێ لەو کەسانە کە لەو هێرشە رزگاریان بوو هێشـتا بەدەست شێرپەنجە، کوێری، نەخۆشـیەکانی هەناسەدان، لەبارچوونی منداڵ و نەخۆشـی توندی هەناسـەدان لە نێو منداڵەکانیان ئێش و ئازار دەکێشن.

کیمیابارانی هەڵەبجە (کە تەنها یەکێ لەو ٤٠ شـوێنە بوو کە سەدام هێرشی کردوەتە سەر خەڵکەکەی خۆی) تەنها گۆشەیەک لەو تاوانانەیە کە سەدام حوسەین دەیەوێت ئەنجامی بدات و تەنها جۆرێک لەو مەترسیە جۆراوجۆرانەیە کە ئێستا بۆ سەراسەری جیهان دروستی کردوە. سەدام یەکـێ لە دڵڕەقتریـن دیکتاتۆرەکانی مێژووە و خۆی بە کوشـندەترین چەکەکانی جیهان تەیار دەکات.

ئەنجومەنی ئاسایشـی نەتەوە یەکگرتوەکان دەرکی بەم مەترسییە کردووە و داوای لە سەدام حوسەین کردووە سەرجەم چەکە کۆمەڵکوژەکانی لە ناو ببات کە ئەوە یەکێ لە شـەرتومەرجەکانی کۆتاییپێهاتنی شەڕی دووەمی کەنداو لە ١٢ سـاڵ لەمەوپێش بوو. ئەنجومەنی ئاسایش چەند جـار ئـەم داواکاریەی دووپـات کردوەتەوە و هۆشـداریداوە کە عێراق لەگـەڵ کۆمەڵێک ئەنجامـی جدی رووبەڕوو دەبێتـەوە ئەگەر ئەرک و بەرپرسـیارەتیەکانی جێبەجێ نەکات. بەڵام عێـراق بە کەمتەرخەمی و فریودان و وەدواخستنی کات، وەڵامی ئەنجومەنی ئاسایشی داوەتەوە.

ویلایەتــە یەکگرتوەکانــی ئەمریــکا، بریتانیا و ئیســپانیا درێژە بە کارکــردن لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشــی نەتەوە یەکگرتوەکان دەدەن بۆ ئەوەی بەرەنگاری ئەم مەترســییە هاوبەشەی سەدام ببنەوە. ئێمە لە ســاڵانی رابردوودا نموونەگەلێکی زۆرمان بینیوە (لە بۆسنیاوە بگرە تا رواندا و کۆزۆڤۆ[١٥٣]) کە سەرنەکەوتنی ئەنجومەنی ئاسایش لە بڕیاردانی یەکلاییکەرەوە، کارەســاتی لێکەوتوەتەوە و دەبێ ئەوە بزانین کە هەندێ لە مەترسییەکان ئەوەندە گەورەن و ئاکام و ئەنجامەکانیان ئەوەندە کارەســاتبارە کە دەبێ ئەو مەترســیانە لەناوببردرێن، تەنانەت ئەگەر پێویست بە هێزی سەربازیش بکات.

هاوکات لەگەڵ بەردەوامبوونی هەوڵە دیپلۆماتیکەکان، نابێ راســتیە بنەڕەتیــەکان لە بارەی رژێمی بەغداد پشــتگوێ بخەین. مێژووی نوێ پێمانی نیشانداوە کە سەدام حوسەین دیکتاتۆرێکی دەستنەپارێزە کە بێ هیچ پاســاوێک دووجار وڵاتانی دراوسێی خۆی داگیر کردووە کە مەرگ و ئازاری کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی لێکەوتوەتەوە. زانیاریەکانی گروپگەلی مافی مرۆڤ نیشــان دەدات کە رژێمی عێراق نەیارەکانی ئەشــکەنجە دەکات، زیندانییان دەکات، هەندێک جار بێسەروشوێنیان دەکات، دەست و پێ و زمانیان دەبڕێت، چاویان دەردەهێنێت و لەبەرچاوی کەسوکاریان دەســتدرێژی دەکاتە ســەر ژنەکانیان. «ئیلی وەیسێل»[١٥٤] کە خەڵاتی نۆبێلی پێبەخشــراوە و یەکێ لەوانەیە کە لە هولۆکاست رزگاری بووە، ئەم حەفتەیە وتی: « ئێمە بەرپرســیارێتی ئەخلاقیمان هەیە بۆ ئەوەی لە هەموو ئەو شــوێنانە دەســتێوەردان بکەین کە لە ژێر دەســەڵاتی شەیتاندایە. ئەو شوێنە ئەمڕۆ عێراقە».

زانیارییەکانی پشکنەرانی چەکی کۆمەڵکوژ نیشان دەدات کە سەدام حوســەین نەیتوانیوە پاســاو بهێنێتەوە بۆ ئەو بڕە یەکجار زۆرە گازە کیمیایی و بیۆلۆژیکیانەی کە هەیەتی، لەوانە گازی موستارد، بۆتولینۆم، تاکســین و ســارین کە دەتوانێت ملیۆنەها کەســی پێبوکژێت. ئێمە دەزانین کە رژێمی عێراق یارمەتی مادی بە تروریستەکان دەدات. هەروەها

دەزانین کە پیلانی ئەوەی بەدەستەوەیە خەڵکی بێگوناحی دەوروبەری بنکە سەربازییەکان وەک میرتاڵێکی (سپەر) مرۆڤی بەکاربێنێت.

هیــچ هۆکارێکی ئەوتۆ لەئارادانیە بۆ ئەوەی هیواداربین کە ســەدام چەک بکرێت. ئەگەر بۆ چەککردنی ســەدام، هێزی ســەربازی پێویست بکات خەڵکی ئەمریکا دەبێ دڵنیا بن کە هەموو ئامراز و ســەرچاوەیەک دراوە بە هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەستبێنن. خەڵکی عێراق دەبێ دڵنیابن کە هەموو هەوڵێک دەدرێت بۆ ئەوەی ژیانی خەڵکی بێ گوناح بپارێزرێت و یارمەتی عێراق دەدرێت بۆ ئەوەی لە سی ساڵ دەسەڵاتی دیکتاتۆری رزگاری بێت. هەروەها پلانی ئەوەمان داناوە کە برێکی زۆر خۆراک و دەواودەرمان و پێداویستیە سەرەکییەکانی دیکە بخەینە بەردەستی خەڵکی عێراق، ئەگەر شەڕەکە بەرفراوان بێت.

رۆژانی زۆر ســەخت لە بــەردەم نەتــەوە ئازادەکانــی جیهاندایە. دەوڵەتەکان ئێســتا دەبێ نیشانی بدەن کە ئەو ئەرک و بەرپرسیارەتییە کە بۆ ئازادی و ئاســایش باســیان دەکرد تەنها قسە بووە یان ئامادەن بە کــردەوە هەنگاوی بۆ هەڵبگرن؟ هیچ گومان لــەوەدا نییە کە ئێمە وەک دەوڵەتی ویلایەتــە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و ئەو هاوپەیمانییە کە رێبەرایەتی دەکەین، بەرەنگاری مەترسیەکی رۆژ بەرۆژ گەورەتر دەبینەوە بۆ ئەوەی خۆمان بپارێزین و سەرکردەی ترۆر لەناوببەین و ئاشتی جیهان بپارێزین.

سەرۆک کۆمار جۆرج دبلیو بوش

## ٣- هەڵەبجە و ئەنفال لە ئەجیندای کۆنگرێسی ئەمریکادا (ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیران)

### کیمیابارانی هەڵەبجە: کۆمەڵکوژییەکی دڕندانە
### ئەنجومەنی نوێنەران
### ٢٤ی ئاداری ١٩٨٨

کۆنگرێسمەن لانتۆس[١٥٥]:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن، ماوەیەکی زۆر بە سەر مۆتەکەی «جانستۆن»[١٥٦] (کە تێیدا ٩١٣ پیاو، ژن و منداڵ بە هۆی گازەوە کوژران) تێنەپەڕیوە کە بیروڕای گشتی ئەمریکا کەوتوەتە ژێر کاریگەری ئەو وێنە ترسناکانەی کە لە عێراقەوە تێن و نیشان دەدات گازی سیانید، گازی موستاردو گازی دەمار لە لایەن دەوڵەتی عێراق دەژی خەڵکی خۆی بەکارهاتووە. لە بەر ئەوەی ناهێڵن میدیاکان دەستیان بە شوێنی ڕووداوەکە بگات، ئێمە نازانین ئایا ژمارەی ئەو منداڵ، ژن و پیرانە کە لە ئاکامی بەکارهێنانی دڕندانەی گازی ژەهراوی لە سەر دەستی کاربەدەستانی عێراق کوژراون، ٣ هەزار کەسە یان ٥ هەزار کەس.

هێزی دەریایی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئێستا عێراق و هاوپەیمانەکانی لە کەنداوی فارس دەپارێزیت. حکوومەتی ئەمریکا دەبێت گوشار بخاتە سەر ڕژێمی بەغداد و پێی نیشان بدات کیمیابارانکردنی خەڵکی مەدەنی لە چاوی نەتەوە شارستانییەکانەوە قابلی قبووڵ نییە. نەتەوە یەکگرتووەکان دەبێ بە زووترین کات لیژنەیەک بنێرێت بۆ ناوچە تا لەم کۆمەڵکوژییە دڕندانەیە بکۆڵێتەوە.

## کیمیابارانی هەڵەبجە نموونەی کارەساتی ئاپۆکالیسە
## ئەنجومەنی نوێنەران
## ٢٩ی ئاداری ١٩٨٨

کۆنگرێسمەن ئەتکینز[١٥٧]:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن، دەمەوێت نیگەرانی خۆم دەرببڕم بەنیسبەت بەکارهێنانـــی چەکی کیمیایی لـــە لایەن ئێران و عێراقەوە کە دژی یەکدی شەڕدەکەن. حەفتەی رابردوو، بە سەدان خەڵکی بێ گوناح لە کوردستانی عێـــراق بە چەکی کیمیایی کوژران. هەموومـــان راپۆرت و هەواڵەکانی ئەم رووداوەمان بینیوە. بنەماڵەکان لە سەر مێزی نان خواردندا مردوون، دایک و باوکـــەکان منداڵەکانیان بە توندی لە ئامێز گرتووە تا لە گازی ژەهراوی بیانپارێـــزن، وەکوو ئەوە وایە چوار ئەســـب ســـوارەکەی ئاپۆکالیس[١٥٨] لـــە هەموو شـــاردا غاریاندابێ و کۆمەڵێک مردوویان بە شـــوێنی خۆیاندا بەجێهێشتبێ.

چەکی کیمیای ترســـناکە و لەلایـــەن هەموو نەتەوەکانـــی جیهانەوە شـــەرمەزار کراوە. پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی ژنێڤ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی قەدەغـــە کرد و هیوادار بوو ئیـــدی قەد بەکارنەبردرێت بەڵام هەم ئێران و هەم عێراق لە شـــەڕی کەنداودا لەم چەکە ترسناکانە کەڵکیان وەرگرتووە. کەڵکوەرگرتـــن لە چەکی کیمیایی وەک ئامرازی شـــەڕ خـــۆی لە خۆیدا کارێکی درەندانەیە، بەڵام وادیارە دەوڵەتی عێراق ئەم چەکەی دژی خەڵکە سڤیلەکەی خۆیشی بەکارهێناوە. ئەمە یەکەم جار نییە کە چەکی کیمیایی لە ناوچەی کوردســـتان بە کاردبردرێت. کوشـــتنی خەڵکی بێ گوناە هیچ پاســـاوێکی نییە و ئـــەو کۆمەڵکوژییە کە هەفتەی رابـــردوو روویدا، جێی داکۆکی نییە.

لـــەم حەفتەیـــە دا من گەڵاڵەیەک تەســـلیمی ئەنجوومـــەن دەکەم بۆ شەرمەزار کردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن ئێران و عێراق.

داوا لە هاوکارانم دەکەم لەم هەوڵەدا دەنگی خۆیان بخەنە پاڵ دەنگی مـــن بۆ ئەوەی لانیکەم خەڵکی بـــێ گوناە لەمە زیاتر نەبن بە قوربانی لە شەڕی کەنداودا.

## ئێمە نابێت لەمە زیاتر بێ دەنگ بین.
## بێدەنگی لەبەرامبەر کیمیابارانی هەڵەبجە
## ئەنجومەنی نوێنەران
## ٣٠ی ئاداری ١٩٨٨

کۆنگرێسمەن پۆرتێر[١٥٩]:

بەڕێـــز ســـەرۆکی ئەنجومەن، هەفتـــەی رابردوو عێراق بە هێرشـــی کیمیایی بۆ ســـەر خەڵکەکەی خۆی لە شـــارۆچکەی سنووری هەڵەبجە نەوەســـتاوە و هەرێمـــی هەوایی تورکیای بەزاندووە بـــۆ ئەوەی بنکە و بارەگای پێشـــمەرگەکان بۆمباران بکات کـــە تەنها یەک کیلۆمەتر لە ناو خاکی تورکیادا بوون.

لـــە کاتێکدا کە ویلایەتـــە یەککگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ لە شـــەڕی کەنداوی فارســـدا بێلایەن بێت، بەڵام هیچ گومان لەوەدا نییە کە نابێت لە بەرامبەر هێرش بۆ سەر تورکیا بێدەنگ بێت.

بە گوێرەی مەنشـــووری ناتۆ، هێرش بۆ سەر هەر هاوپەیمانێکی ناتۆ لە حوکمی هێرشـــکردنە بۆ ســـەر ســـەرجەم ئەندامانی ناتۆ. دەبێت لە پێشـــەوە هۆشـــداری بدرێت بە دەوڵەتی عێراق کە هەرچەند کە هێرشی کیمیایی دەکاتە ســـەر خەڵکەکەی خۆی و بە رواڵەت کەس هیچ ناڵێت، بەڵام هێرشـــکردنە ســـەر هاوپەیمانێکی وەفادار وەک تورکیا خراپترین ئاکام و لێکەوتەی بەدواوە دەبێت. با قارەمانانی هێزی هەوایی عێراق کە هێرشیان کردوەتەسەر USS. STARK[١٦٠]و هەڵەبجە بزانن کە بەم کارەی خۆیان دوژمنێکیان بۆ خۆیان دروست کردووە کە لە ئێران گەورەترە.

## داواکاری لە وەزیری دەرەوە بۆ شەرمەزارکردنی سیاسەتی راگوازتنەوەی کوردەکان

**ئەنجوومەنی نوێنەران**

**٢٥ی گوڵانی ١٩٨٩**

ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا
٢٥ی گوڵانی ١٩٨٩
بەڕێز جەنابی جەیمز بەیکێر[١٦١]
وەزیری دەرەوە
وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی ٢٠٥٢٠

بەڕێز جەنابی وەزیر

دەمەوێت سیاسـەتی ئێستـای دەوڵەتی عێراق بـۆ راگوازتنەوەی زۆرەملێی کوردەکانی دانیشـتووی باکووری عێراق شەرمەزار بکەم و داوا لە ئێوە بکەم بە توندترین شـێوە دژایەتی دەوڵەتی ئەمریکا لەگەڵ ئەم کردەوانە دەرببڕن.

هێزەکانی سـوپای عێراق ئێسـتا سـەدان هەزار کـورد لە ماڵ و گوندەکانیان لە باکووری عێراق دەردەکەن. بە گوێرەی راپۆرتی کۆمەڵێک لە سـەرچاوەکان ئەم کردەوانەی دەوڵەتی عێراق لە هەمان ئەو ناوچەیە جێبەجێ دەکرێت کە پارساڵ بە چەکی کیمیایی هێرشی کراوەتە سەر.

ئەم کردەوانە پێشـێلکردنی ئاشکرای مافی مرۆڤە و من لە نامەیەکدا داوام لە سـەرۆک کۆماری عێراق، سـەدام حوسەین کردووە دەستبەجێ کۆتایی بەم کردەوانە بێنێـت. هەروەها داوامکردووە دەوڵەتی عێراق بە شێوەی فەرمی رێز لە مافەکانی گەلی کورد بگرێت و مافیان بپارێزێت.

مـن داواتان لێدەکـەم بە دەوڵەتی عێـراق رابگەیەنن کە دەوڵەتی ئەمریکا راگوازتنەوەی زۆرەملێی کوردەکان شەرمەزار دەکات و لە رێگای

هەموو کاناڵە دیپلۆماتیکەکانەوە بۆ کۆتاییپێهاتنی ئەم کردەوانەی عێراق و پێشـــێلکارییەکانی دیکـــەی مافی هاولاتیانی بـــێ گوناحی عێراق کار بکات.

سپاستان دەکەم سەرنج بەم بابەتە جدییە بدەن.

لەگەڵ رێزمدا

جیم باتز[١٦٢]

ئەندامی کۆنگرێس

## تاوتوێکردنی بڕیارنامەی ٤٠٨ بۆ ئیدانەکردنی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی

**ئەنجوومەنی پیران**

**٢٤ی حوزەیرانی ١٩٨٨**

**سناتۆر میشێل[١٦٣]:**

بەڕێز ســـەرۆکی ئەنجوومەن، خۆشـــحاڵم ئەمڕۆ هاوکارانم پشتیوانی خۆیان لە پەســـەندکردنی بڕیارنامەی ٤٠٨ دەردەبـــڕن. ئەم بڕیارنامەیە بەکارهێنانـــی چەکـــی کیمیایی لەلایەن عێراق شـــەرمەزار دەکات و داوا لە ســـەرۆک کۆمار دەکات درێژە بە هەوڵەکانی ئەمریکا بدات بۆ ئەوەی بەرهەمهێنـــان و بەکارهێنانـــی چەک لە ئاســـتی نێونەتەوەییدا قەدەغە بکرێت.

جێگای داخە پەســـەندکردنی بڕیارنامەیەک لەم جۆرە پێویست بێت، بەڵام ئێمە ناتوانین پەرەســـەندنی ترســـناکی کەڵکوەرگرتن لەم چەکانە لە شـــەڕی ئێران و عێراق پشـــتگوێ بخەین. ئێمە دەبێ لە ئەنجوومەنی پیرانـــی ئەمریکا بە فەرمـــی کەڵکوەرگرتن لەم چەکـــە ئیدانە بکەین و پشتیوانی خۆمان لە هەوڵە بەردەوامەکان دەرببڕین بۆ دووبارەکردنەوەی

قەدەغەی ئەخلاقی و یاسـایی کەڵکوەرگرتـن لە چەکی کیمیایی. چەند مانگ پێش کۆمەڵگای نێونەتەوەیی شۆکە بوو بە هۆی دیتنی ئەو بەڵگە روونانەی کە نیشـانی دەدا عێراق چەکی کۆمەڵکوژی دژی خەڵکی خۆی بەکارهێناوە.

لە ١٦ی ئادار، عێراق بە چەکی کیمیایی هێرشـی کردە سـەر شاری هەڵەبجە کە ئێران داگیری کردبوو و زیاتر لە دوو هەزار کوردی سڤیلی کوشت.

وێنەی سەیر و سەمەرەی خەڵکی سڤیل کە لە کاتی ئەنجامدانی کاری رۆژانەیاندا مردبوون و وشـک ببوون هەموومانی هەژاند. بەڵام پێش ئەم رووداوە، گەلێ بەڵگە لە دەستدا بوو کە نیشانیدەدا توانایی بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت رووی لە پەرەسـەندنە. ئێمە دەزانیـن کە لە سـەرەتای سـاڵی ١٩٨٢وە عێراق دەسـتیکردووە بە تاقیکردنـەوەی چەکی کیمیایی و بە هەڵە بە چەکی کیمیایی هێرشـی کردە سەر سوپای خۆی.

ئەم بڕیارنامەیە ستایشـی سەرۆک رەیگان دەکات بە هۆی ئەوەی کە خێرا ئەم کردەوەیەی عێراقی وەک پێشێلکردنی گەورە و تایبەتی یاسایی نێونەتەوەیی شـەرمەزار کرد. پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشتر رایانگەیاندووە کە عێراق لە سـاڵی ١٩٨٤، ١٩٨٦ و سـەرەتای ١٩٨٧ دژی ئێران چەکی کیمیایی بەکارهێناوە. هەر هێرشێک لەم پەیوەندییەدا پێشـێلکردنی زەقی پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی ژنێڤە کە عێراق واژۆی کردووە. وادیارە ئێرانیش چەند ساڵ پاش دەستپێکردنی تاقیکردنەوەکانی عێراق، لە ئاسـتێکی بەرتەسـکتردا دەسـتی کردووە بە بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی. بە گوێرەی راپۆرتەکان، ئێران لە تۆڵەی هێرشە کیمیاییەکانی عێراقدا، چەکی کیمیایی (لە وانە لە هەڵەبجە) بەکارهێناوە.

هەتـا کاتێک کە هـەر دوولا هـەروا چەکی کیمیایـی بەکاربهێنن،

مەترســـییەکانی چەکی کیمیایی لە شـــەڕی ٨ ســـاڵەی کەنداوی فارس زۆرتر دەبێت. ئێســـتا ئێران و عێراق لە کاتی هێرشکردنە سەر شارەکان لە مووشـــەکی ئاســـایی کەڵکوەردەگرن و ئەگەر بتوانن ئەم مووشەکانە بە کڵاوەی کیمیایی تەیار بکەن رەنگە خەڵکی ســـڤیل لە ناو شارەکاندا بکوژن و بریندار بکەن.

پەســـەندکردنی بڕیارنامـــەی ٤٠٨ لە ئەنجوومەنی پیـــران، هەڵگری پەیامێکی بەهێزە بۆ لایەنەکانی شەڕی کەنداو. بڕیارنامەکە وەک نموونە هێرشە کیمیایەکانی عێراقی شەرمەزار کردووە و نیگەرانی خۆی دەربڕیوە لـــە بەکارهێنانـــی بەردەوامی چەکی کیمیایی لە لایـــەن ئێرانەوە. دەبێ ئەنجوومەنـــی پیران بە توندی کەڵکوەرگرتن لە چەکی کیمیایی لەلایەن هـــەر وڵاتێکەوە بێ جیاوازی شـــەرمەزار بکات. هێرشـــە کیمیاییەکانی ئەم دواییانەی عێراق ســـەمبولی سەرنەکەوتنی کۆمەڵگای نێونەتەوەییە بـــۆ ئەوەی بە شـــێوازی کارا رێگە لە راگوازتنەوەی مـــاددەی کیمیایی و بەکارهێنانـــی چەکی کیمیایی بگرێت کـــە لەلایەن پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی ژنێڤەوە قەدەغە کراوە.

لە کاتێکدا کە نەتەوە یەکگرتـــووەکان بەردەوام بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراقەوە شـــەرمەزار کردووە، بەڵام قەد هیچ چەشـــنە گەمارۆیەکی نەخستووەتە سەر ئەو وڵاتانەی کە پرۆتۆکۆلی ژنێڤ پێشێل دەکەن.

## سناتۆر هاتفیلد(١٦٤):

جەنابـــی ســـەرۆکی ئەنجومەن، زۆر خۆشـــحاڵم کە پشـــتیوانی لەو بڕیارنامەیە دەکەم کە ســـناتۆر میشـــیل خســـتوویەتیەڕوو. وێنەی ئەو گوندە کوردنشـــینانە کە مانگی ئاداری رابـــردوو لە ناو کۆخەکانیاندا بە گازی کیمیایی دەمار وشـــکبوون هەموومانی هەژانـــد و ئەم بڕیارنامەیە

دەرفەتێکمان بۆدەرەخسـێنێت بۆ ئەوەی بە شـێوەیەکی بێلایەنانە[١٦٥] ناڕەزایەتـی خۆمـان سـەبارەت بەو کردەوەیـە دەرببڕیـن. هیوادارم بڕیارنامەکە بە تێکڕای دەنگ پەسـەند بکرێت. پێش ئەوەی بڕیارنامەکە بخرێتە دەنگدانەوە، دەمەوێت هەنـدێ لە بۆچونەکانم لەو پەیوەندییەدا بخەمەڕوو.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، هێرشی گازی دەمار لە کوردستان دەبێ لە چوارچێوەی شـەڕی هەشت سـاڵەی ئێران و عێراقدا سەیر بکرێت. کـێ دەتوانێت ئەو چیرۆکانە لەبیر بکات کە باسـی ئەوە دەکەن ئێران مێرمنداڵەکانـی بەکارهێناوە بۆ پاککردنـەوەی مەیدانی مین؟[١٦٦] هەر دوو لایەنی ئێران و عێراق کردەوەی دڵڕەقانەیان ئەنجامداوە و خەڵکیان کردووە بە قوربانی.

جەنابی سـەرۆکی ئەنجومـەن زیاتر لە ملیۆنێک کەس لەم شـەڕە شـێتانەیەدا گیانیان لەدەسـتداوە و ژمارەیەکی زیاتر بریندار بوونە. لە راسـتیدا زیاتر لـە ١٠٠ جەنگ لە جەنگی جیهانـی دووەمەوە روویداوە بەڵام ئەم شـەڕەی ئێران و عێراق خوێناویترینیان بووە. هاوکات لەگەڵ دەنگدان بەم بڕیارنامەیە دەبێ پشـتیوانی لە هەوڵە نێونەتەوەیەکانیش بکەین بۆ ئەوەی ئەم جەنگە کۆتاییپێبێت. خاڵی دووەوم ئەوەیە کە ئیدی نابێت هێرشگەلی وەها (هێرش بە گازی دەمار) روو بدات. خاڵی کۆتایی قسەکانم ئەوەیە کە گرنگترین بەشی ئەم بڕیارنامەیە ئەوەیە کە پێداگری لە سـەرۆک کۆمـاری ئەمریکا دەکات هەوڵ بدات بـۆ ئەوەی لایەنەکان بگەن بە رێکەوتنێک بۆ ئـەوەی بەکارهێنان، بەرهەمهێنان، پەرەپێدان، گوازتنەوە و بەدەستهێنانی چەکی کیمیایی قەدەخە بکرێت.

**سناتۆر پێڵ:**

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، لە ماوەی ١٦٠ ساڵی رابردودا کەم تا زۆر رێز لە یاســـای بەکارنەهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ گیراوە بەڵام شەڕی ئێران و عێراق ئەو رێزەی پێشـــێلکرد. پاش ئەوەی بارودۆخی سەربازی عێراق لە ١٩٨٢وە رووی لە خراپبوون کرد عێراق رۆژ بەرۆژ زیاتر چەکی کیمیایی بەکارهێنـــا بۆ لەناوبردنی هێزەکانی ئێـــران. بەداخەوە چەکی کیمیایی بەشێکە لە ئەمباری چەک و تەقەمەنی عێراق.

ئەمڕۆ عێراق نەتەنیا چەکی کیمیایی دژی ئێران بەکاردێنێت بەڵکوو دژی خەڵـــکی کوردی نەیاری خۆیشـــی بەکاریدێنێت. ئـــاداری رابردوو نزیکەی ٥ هەزار خەڵکی ســـڤیل، لەوانە ژن و منداڵ، پیاو، پیرەمێرد و پیرەژن بەشێوەیەکی دڕندانە کوژران کاتێک کە هێزەکانی عێراق گوندی کوردنشـــینی هەڵەبجەیان کیمیاباران کرد. تەنانەت سەرەڕای ئەوەش کە بارودۆخـــی ســـەربازی عێراق لە ماوەی ٤ مانگی رابردوودا باشـــتر بووە بەڵام عێراق درێژە بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دەدات. پێشـــێلکردنی یاسای بەکارنەهێنانی چەکی کیمیایی دەتوانێت کارەساتی لێبکەوێتەوە. دەوڵەتـــەکان بە ئاســـانی دەتوانن مـــاددەی کیمیایی وەدەســـتبخەن و بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کارێکی ئاسانە.

دیپلۆماتـــە عێراقییـــەکان داکۆکی لە بەکارهێنانـــی چەکی کیمیایی لە لایەن وڵاتەکەیانەوە دەکەن و پاســـاوی ئەوە دەهێننەوە کە شـــەڕی ئێران و عێراق ســـەرچاوەی کێشـــەکەیە و دەڵێن بە کۆتاییپێهاتنی شەڕ ئیـــدی چەکی کیمیایی بەکارناهێنن. هیچ گومـــان لەوەدا نییە کە ئێران بەرپرسیاری بەردەوامبوونی شەڕەکەیە.

## بڕیارنامەی ٤٠٨ی ئەنجومەنی پیران

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئـــەوەی کە کۆمەڵـــگای نێونەتەوەیی دانی بە مەترســـی چەکی کیمیایی لە شـــەڕی یەکەمی جیهانیدا ناوە کە تێیدا بە هـــۆی چەکی کیمیایی لانیکەم ٩٠ هەزار کـــەس کوژران و زیاتر لە ١٠٠ هەزار کەسی دیکە بریندار بوون.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە پرۆتۆکـــی ژنێڤی ١٩٢٥ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی قەدەخە کردووە.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئـــەوەی کـــە ئەنجومەنـــی ئاسایشـــی نەتەوە یەکگرتوەکان لە ١٩٨٤، ١٩٨٦ و ١٩٨٧ پشتڕاستی کردوەتەوە کە عێراق چەکی کیمیایی بەکارهێناوە و ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە کاتی شـــەڕی ئێران و عێراقدا شەرمەزار کردوە.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە لە ئەنجامی هێرشـــی کیمیایی عێراق لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ ســـەدان سڤیلی کورد لە ناو خاکی عێراق کوژران و ئەو هێرشـــە ترســـناکبوونی چەکی کیمیایی و کاریگەرییەکانی لەسەر خەڵکی سڤیل ئاشکرا کرد.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەو هێرشـــەی عێراقی وەک پێشێلکردنی تایبەت و یەکلاییکەرەوەی یاسای نێونەتەوەیی ناوزەد کرد.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە ئێرانیش لـــە تۆڵەی عێراقدا چەکی کیمیایی بەکارهێناوە و بە گوێـــرەی زانیارییەکان لەوانەیە ئێران چەکی کیمیایی بەرهەمهێنابێت.

کەوابوو ئەنجومەنی پیران:

١- بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراق شـــەرمەزار دەکات و رادەگەیەنێت کە ئەم کردەوانە یاسای نێونەتەوەیی پێشێل دەکات.

٢- داوا لـــە عێـــراق دەکات بە زووترین کات بۆ هەمیشـــە کۆتایی بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بهێنێت.

٣- ستایشـــی ســـەرۆک کۆماری ئەمریکا دەکات بـــۆ هەوڵەکانی بۆ شـــەرمەزارکردنی هێرشـــی کیمیایی عێراق بۆ ســـەر خەڵکی سڤیل کە ئەمدواییانە ئەنجامدراوە.

٤- داوا لە ســـەرۆک کۆماری ئەمریـــکا دەکات هەوڵ بدات بۆ ئەوەی هاوپەیمانەکانمـــان هاوکاریمان لەگەڵ بکەن بۆ ئەوەی رێوشـــوێنەکانی ناردنەدەرەوەی ماددەی کیمیایی بۆ ئەو وڵاتانە کە بۆ پەرەپێدانی چەکی کیمیایی هەوڵ دەدەن توندتر بکرێت.

٥- نیگەرانی خۆی ســـەبارەت بەو زانیاریانە دەردەبڕێت کە باســـی ئـــەوە دەکەن کە ئێران چەکی کیمیایی بەکارهێناوە و داوا لە ســـەرۆک کۆمار دەکات هەوڵی دیپلۆماتیکی پێویســـت بدات بۆ ئەوەی پێش لەوە بگرێت کە ئێران پەرە بە بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی بدات یان چەکی کیمیایی بەکاربهێنێت.

٦- داوا لە سەرۆک کۆمار دەکات هەوڵەکانی ئەمریکا لە کۆنفرانسی ژنێـــڤ بۆ چەککردن چڕتر بکاتەوە بۆ ئـــەوەی بگەن بە رێکەوتنێک بۆ ئەوەی بەکارهێنان، بەرهەمهێنان، پەرەپێدان، ئەمبارکردن، گوازتنەوە و وەدەستخستنی چەکی کیمیایی قەدەغە بکرێت.

***

دەنگـــدان: بڕیارنامەکە بە ٩١ی دەنگـــی ئەرێنی و ٩ دەنگی بێلایەن پەسەند کرا.

## تاوتوێکردنی گەلاڵەکان و بڕیارنامە هاوبەشەکان بۆ پێشگیری لە ژینۆسایدی کورد

**ئەنجوومەنی پیران**

**٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨**

سناتۆر پێل[١٦٧]:

بەڕێز ســـەرۆکی ئەنجوومەن، لە سەر ســـنووری ئێران و عێراق هێما و نیشـــانەکانی تاوانێکی زۆر گـــەورە دەردەکەوێت. بۆ جاری دووەم لەم سەدەیەدا دیکتاتۆرێکی دڕندە گازی کوشندە بەکاردێنێت بۆ قەلاچۆکردنی کەمینەیەکی ئەتنیکی جیـــاواز. ئەم جارە قوربانییەکە کەمینەی کوردی عێراقە و تاوانبار سوپای عێراقە.

کورد گرووپێکی ئەتنیکی جیاوازە کە ٢٠ میلیۆنە و خاوەن مێژوویەکی کـــۆن و کولتوورێکـــی دەوڵەمەندە. هەر چەند کە گەلـــێ لە کوردەکان ئامانجیان کوردستانێکی سەربەخۆیە، بەڵام کورد تووشی چارەڕەشییەکی گەورە بووە و لە نێوان عێراق، ئێران، تورکیا، سووریا و یەکێتی سۆڤیەتدا پارچە پارچە بووە.

هەرچەند کە هەڵسووکەوتی عێراق لەگەڵ کەمینەی کورد لە رابردوودا تۆزێک لە هەڵســـوکەوتی دراوســـێکانی باشـــتر بووە، بەڵام بارودۆخی کوردەکانی عێراق لەم چەند ساڵەی دواییدا بووە بە نەهامەتی و کارەسات. بە دەســـتپێکردنی شـــەڕی ئێران و عێراق، خەباتکارانـــی کورد لە هەر دوو وڵات هەلیان بۆرەخسا ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوانتر (نە سەربەخۆیی) بەدەســـت بهێنن. لە عێراق راپەڕینی کورد پێشکەوتنی زۆرتری بە خۆوە بینـــی و کۆنترۆڵی زۆربەی ناوچە شـــاخاوییەکانی باکـــووری رۆژهەڵاتی عێراق کەوتە دەســـتی کورد. بە هەرحاڵ بە گۆڕینی ئاراســـتەی شەڕ بە قازانجی عێراق لە ســـەرەتای ئەمساڵ، سوپای عێراق هێرشێکی گەورەی دژی کـــورد ئەنجامدا. لەگەڵ ئەم هێرشـــەدا، گوندە کوردنشـــینەکان لە

سەرانسەری ناوچەکە بە دینامیت تەقێندرانەوە و گازی ژەهراوی دژی خەڵک بەکاربرا.

لە مانگی ئادار لە شارۆچکەی کوردنشینی هەڵەبجە، ٥هەزار سڤیلی کورد کیمیاباران کران. لە دوای ئاگربەستی ٢٠ی ئاب لە نێوان ئێران و عێراق، سوپای عێراق چەک و تەقەمەنی و پاشکەوتی گازە کیمیاییەکانی بە تەواوەتی دژی کوردەکان بەکارهێنا. راپۆرتەکانی ئاوارەکان بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە سەبارەت بە بەکارهێنانی بەرفراوانی گازی کیمیایی. بە هۆی ئەوەی کە ناوچە بە رووی هەموو بیانییەکان داخراوە ئێمە تەنها دەتوانین پشت بە ژمارەی رێژەیی کوژراو و بریندارەکان ببەستین، بەڵام روونە کە ژمارەیان دەیان هەزار کەسە.

هێرش بۆ سەر کورد هەروا کە باسمان کرد درێژەی هەیە. هیچ گومان لەوە دا نییە کە رژێمی سەدام حوسێن بەنیازە ئەم هێرشە بکات بە دوایین رێگاچارەی کێشەی کورد. لە کاتێکدا کە خەڵک تووشی گازی کیمیایی دەبن، جیهان بێ دەنگە. ئەم بێ دەنگییە چەند هۆکاری هەیە: سەرچاوەی زۆری نەوتی عێراق، هێزی سەربازی و هیوای تێکنەچوونی وتووێژە هەستیارەکان کە بە ئامانجی کۆتایی پێهێنانی شەڕی ئێران و عێراق ئەنجام دەدرێت.

بە هەرحاڵ ئەم بێدەنگییە لە جێی خۆی دا نییە. نیو سەدە لەمەو پێش دنیا لە بەرامبەر هیتلێردا بێ دەنگ بوو، ئەوە بوو هیتلێر نزیک بوو هەموو جوولەکەکانی ئۆرووپا لە ناو بەرێت. ئێمە ناتوانین لە بەرامبەر ژینۆسایدێکی دیکەدا بێ دەنگ بین.

من ئەمرۆ گەڵاڵە یاسایەکەم تەسلیمی ئەنجوومەن کردووە کە هەموو یارمەتییە ئابوورییەکان بە عێراق دەپچڕێنێت و پێویستی بەوە هەیە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دژی ئەو قەرزانە دەنگ بدات کە دامەزراوە ئابوورییە نێونەتەوەییەکان دەیدەن بە عێراق و ناردنەدەرەوەی نەوتی عێراق قەدەغە دەکات. ئەم کردەوانە بەردەوام دەبێت هەتا کاتێک

کـــه عێراق بە کەڵکوەرگرتن لە گازی کیمیایی پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی ژنێف پێشێل بکات و هێرش بۆ ژینۆسایدی خەڵکی کورد درێژەی هەبێ.

دەگوترێت ئێمە کاریگەرییەکی ئەوتۆمان لە سەر عێراق نییە، لەوانەیە ئەمـــە راســـت بێت بەڵام بـــە بیروبۆچوونی من ئێمە دەبێـــت لە هەموو کەرەستەیەکی بەردەستمان کەڵک وەربگرین تا سەرنجی ئەوان رابکێشین. رێژیمی عێراق رژێمێکی دیکتاتۆری دڕندەیە کە بە تێپەڕبوونی ســـاڵەها شـــەڕ و ناکۆکی بەهێز بووە. دەستگواشـــتن بە تەنهایی سیاسەتی ئەم رژێمە ناگۆڕی و پێویستە بە زۆترین کات دەست بەکاربین.

## کەڵکوەرگرتنی زیادەڕۆیانەی عێراق لە گازی کیمیایی دژی کوردەکان ئەنجومەنی نوێنەران ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨

کۆنگرێسمەن پیێس[١٦٨]:

بەڕێز ســـەرۆکی ئەنجومـــەن، دەمەوێت نارەزایەتی خـــۆم دەرببڕم سەبارەت بە کەڵکوەرگرتنی عێراق لە گازی ژەهراوی دژی کەمینەی کوردی وڵاتـــی خۆی. راپۆرتەکان نیشـــان دەدەن کە عێراق گازی ژەهراوی دژی ئێرانیش بەکارهێناوە. گازی ژەهراوی ٦٠ ســـاڵ پێش لەلایەن کۆمەڵگای نێونەتەوەییەوە قەدەخە کرا لە بەر ئەوەی کە گازی ژەهراوی لە جیهانی شارســـتانیدا قابلی قبوڵ نییە، هەر بۆیە خەڵکی شارســـتانی دەبێ لە هەموو شوێنێک عێراق شـــەرمەزار بکەن: لە کۆنگرێس، لە ئەنجوومەنی پیران، لە کۆشـــکی سپی، لە نەتەوە یەکگرتووەکان و لە هەر شوێنێکی دیکە کە دەکرێ. پەیامی ئێمە دەبێ روون، راشکاوانە و شێلگیرانە بێ.

بە کارهێنانی چەکی کیمیایی لە شەڕدا قابلی قەبووڵ نییە.

## ئەو دەوڵەتانە کە چەکی کیمیایی بەکاردێنن دەبێ گۆشەگیر بکرێن
## ئەنجوومەنی نوێنەران
## ٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨

**کۆنگرێسمەن پۆرتێر:**

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن، عێراق بە کەڵکوەرگرتن لە گازی ژەراوی «موستارد» بۆ سەرکوتکردنی کەمینەی کوردی خۆی، هەروا کە دەچێ زۆرتر مافی مرۆڤ پێشێل دەکات. وەزیری دەرەوە، شۆڵتز، عێراقی باش تێگەیاندووە کە درێژەدان بە کەڵکوەرگرتن لەم چەکانە و پێشێلکردنەکانی دیکەی مافی مرۆڤ خەسار لە پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و عێراق دەدات.

دوایین هێرشـــی کیمیایی بێبەزەییانەی عێراق نیشـــانەی کێشەیەکی زۆر گەورەتـــرە. ئەمڕۆ لانیکەم ١٥ دەوڵەت لەوانە لیبیا، عێراق، ســـوریا و کۆریـــای باکوور چەکی کیمیایـــی بەرهەمدەهێنن. وادیـــارە گەلێ لە دەوڵەتەکان خەســـارەکانی گازی موستاردی فۆســـنگینز و کلۆرین[١٦٩] یان لە شـــەڕی یەکەمی جیهانیدا لە بیرچوەتەوە. پێویســـتە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی هەنگاو بنێت بۆ راوەستاندنی بڵاوبوونەوەی ئەم چەکانە.

من و «ئێک ســـکێلتۆن»[١٧٠] داوا لە کۆبوونەوەی ٢٨٨٠ی کۆنگرێس دەکەین سیستمێکی نوێ بۆ رێگرتن لە پەرەسەندنی چەکی بایۆلۆجیکی و کیمیایی دابنێت بۆ ئەوەی ســـەرنجی راســـتەوخۆی جیهان بەرەو لای گرنگبوونـــی بڵاونەبوونەوەی ئەم چەکانە رابکێشـــێت. داوا لە ئەندامانی ئەنجوومەن دەکەم لەم گەڵاڵە یاســـایە پشتیوانی بکەن. لە هەمان کاتدا ئێمە دەبێ دڵنیابین کە وڵاتانێک وەک عێراق کە ئەم چەکە قەدەخەکراوانە بەکاردێنن لەگەڵ شەرمەزارکردنی تووند لەلایەن کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و ئەگەر پێویست بکات گۆشەگیرکردن رووبەڕوو دەبنەوە.

## کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە بەرامبەر ژینۆسایدی کورد بێدەنگە
## ئەنجوومەنی پیران
## ٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨

سناتۆر بۆند[١٧١]:

بەڕێز ســـەرۆکی ئەنجوومەن ئەو هـــەواڵ و راپۆرتانە کە لەم رۆژانەی دواییدا سەبارەت بە باکووری عێراق بیستوومانە لە راستیدا زۆر ترسناکن. روونە کە دەوڵەتی عێراق بە شـــێوەیەکی سیســـتماتێک، شـــاڵاوێک بۆ قەڵاچۆکردنی کەمینەی کورد لەو وڵاتە بەڕیوە دەبات.

پاش واژۆبوونی ئاگربەســـت لە نێوان ئێـــران و عێراق لە ٢٠ی ئاب، ســـوپای عێراق دەســـتی ئاوەڵا بووە و دەوڵەتی عێـــراق ئەم هێزە دژی خەڵکی خۆی بەکار دێنێت. لە ماوەی ٢ حەفتەی رابردوودا، ئەو ئاوارانە کە هاتوونەتە نێـــو خاکی تورکیا وتوویانە پتر لە هەزار کورد گولەباران کراون و ناوچەیەکی بەرفراوان کەوتووەتە بەر هێرشـــی کیمیایی. رێگا بە هەواڵنێران نادرێت ســـەردانی ناوچەکە بکـــەن، هەربۆیە زانیارییەکانمان کرچوکاڵن. بە هەر حاڵ مەزەندە دەکرێت ژمارەی ئەو کەســـانەی کە بە دەستی دەوڵەتی عێراق کوژراون گەیشتوەتە دەهەزار کەس و ژمارەیەکی زۆرتر بریندار بوونە. پتر لە ١٠٠هەزار کەســـی دیکە ناچار کراون پەنا بۆ تورکیا ببەن. تورگوت ئۆزاڵ، سەرۆک وەزیرانی تورکیا شایانی ستایشە، چونکە ئەو کەســـانەی قبـــووڵ کردووە کە لە دەســـتی دەوڵەتی عێراق هەڵاتوون و لە ناوچە سنوورییە مەترسیدارەکان دووری خستوونەتەوە.

ئەمـــە یەکەم جار نییە کە رژێمی عێراق گازی ژەهراوی دژی خەڵکی خۆی بەکار دەهێنێت. لەم رۆژانەی دواییدا لە ١٦ی ئادار، عێراق سەدان پیاو و منداڵی بێ گوناهی لە شاری هەڵەبجە کیمیاباران کردووە. وێنەکانی ئەم رووداوە ترسناکە جیهانی هەژاندووە.

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن، خەڵکی شارستانی لەم وڵاتە و سەرانسەری

جیهان ناتوانن به ســـانایی بێدەنگ بــن لە کاتێکدا کە تاوانگەلی ئەوندە گـــەورە دژی خەڵکی بێ گونـــاه بەرێوەدەچێت. من لەم ڕۆژانەی دواییدا نیگـــەران بووم لەوەی کە ڕێبەرانی کۆمەڵـــگای نێونەتەوەیی ناپەزایەتی خۆیان لە بەرامبەر ئەم تاوانە دەرنەبڕی.

دوێنێ زۆر خۆشـــحاڵ بووم کە ســـەرۆکی تێگەیشـــتووی کۆمیتەی پەیوەندییەکانـــی ئەنجوومەنـــی پیـــران گەڵاڵە یاســـایەکی تەســـلیمی ئەنجوومەنی پیران کردووە کە ویلایەتـــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناچار دەکات دژی عێـــراق دەســـت بەکاربێت. ئەمە گەڵاڵەیەکی باشـــە و من هیوادارم کە هاوکارانم بێ فیرۆدانی کات پەسەندی بکەن.

بەهەرحاڵ بە بیروبۆچوونی من پێویســـتە لەم پەیوەندییەدا هەنگاوی زیاتـــر هەڵبگیردرێت و دوا لە ســـەرۆک کۆمار دەکـــەم کردەوەی عێراق بە توندترین شـــێوە ئیدانە بـــکات و داوا لـــە هاوپەیمانەکانمان بکات کـــە ئەوانیش ئیدانەی بکـــەن. هەروەها داوا لە ســـەرۆک کۆمار دەکەم ئەنجوومەنی ئاسایشـــی نەتەوە یەکگرتووەکان هان بدات ســـەبارەت بە کۆمەڵکوژی کـــورد لێکۆڵینەوە بکات و کردەوەکانـــی عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان ئیدانە بکرێت.

بۆ چەندەمین جار لەم سەدەیەدا ئێمە بینیومانە کە هەندێ مرۆڤکوژ گرووپێکـــی ئەتنیکی یان ئایینیان قەڵاچۆ کردووە وەک کۆمەڵکوژییەکانی گرووپـــی «ئیدی ئەمیـــن» لە ئوگاندا[١٧٢]، کۆمەڵکوژی ســـێ میلیۆن لە هاوڵاتیانـــی خۆی بە دەســـتی «پۆل پـــۆت»[١٧٣] و لە هەمـــوو خراپتر کۆمەڵکـــوژی ٦ میلیۆن جوولەکە بە دەســـتی هیتلەر. ئێمە نابێ بهێڵین ئەم ڕووداوانە دووپات بێتەوە.

داوا دەکەم دوای قســـەکانی من ئەم دوو وتارە بخرێتە بەر دەســـتی هاوکارانم: یەکەم وتاری جیم هۆگلەند[١٧٤] لە ژێر ناوی «بە هەڵەدا مەچن: ئەمە ژینۆســـایدە« کە لە ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨ لە ڕۆژنامەی «واشنگتۆن

پۆســـت» دا بڵاو بوەتەوە و ئەوی دیکە وتاری ویلیام ســـافاییر[١٧٥] لە ژێر ناوی «کۆمەڵکوژی کورد بەدەســـتی عێراق رابوەستێنن» کە لە ٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨ لە رۆژنامەی «نیۆیۆرک تایمز»دا بڵاو بووەتەوە.

هەروەها داوا دەکەم دوو نامەی مەســـعود بارزانـــی، رێبەری پارتی دیموکراتی کوردســـتانی عێراق کە ڕادەســـت بە ئەنجومەنی ئاسایشـــی نەتەوە یەکگرتوەکان کراوە، بخرێتە بەر دەستی هاوکارانم.

داوا لـــە هاوکارانم دەکەم ئەم وتار و نامانە بخوێننەوە و نەهێڵن ئەم بابەتە بکەوێتە پەراوێزەوە.

## مەسعود بارزانی و ڕێبەرایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی عێراق

داواکارییەک تەسلیم  بە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکەن

لــە دوای ڕووداوەکانی ئەم دوایانەی باکووری عێراق کە تێیدا چەکی کیمیایی لە لایەن سوپای عێراق دژی خەڵکی سڤیلی کورد بەکاربرا، بەڕێز مەسعوود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بە نوێنەرایەتی خەڵکی کورد داواکارییەکی ڕادەســت بە ئەنجوومەنی ئاسایشــی نەتەوە یەکگرتووەکان کردووە کە تێیدا هاتووە:

« ئێمە داوا لە ئەنجوومەنی ئاســایش دەکەیــن بڕیارنامەکانی ئەم دواییانەی خۆی جێبەجێ بکات ســەبارەت بە هەڵگرتنی هەنگاوی خێرا دژی ئــەو دەوڵەتانە کە چەکــی کیمیایی بەکاردەهێنن. ئێمە هەســت دەکەین پێویســتە جیهانی شارستانی دەستێوەردان لەم بابەتە بکات کە هەتا ئاستی ژینۆساید چووەتە پێش و مافی مرۆڤی پێشێلکردووە. ئێمە لەم کردەوەیــە زۆر بەداخین کە نموونەکەی بە دەگمەن لە ســەردەمی نوێدا بینراوە. ئێمە دەرک بەوە دەکەین کە ئەنجوومەنی ئاسایش دەست وەرنادات کاروباری ناوخۆیی وڵاتان و دواکاری ئێمە بە هیچ شــێوەیەک ئامانجی سیاسی لە پشتەوە نییە، بەڵکوو سکاڵانامەیەکە بە نوێنەرایەتی خەڵکێکی ســڤیل کە لە ناودەچێت ئەگەر پێش لە هێرشــی ئێســتای دەوڵەتی عێراق نەگیردرێت.

ئێمە هەست دەکەین ئاکام و لێکەوتەکانی ئەم سیاسەتەی عێراق تەنها کاری نەکردوەتە ســەر خەڵکی گەمارۆدراوی ئێمە و ئەگەر عێراق هەروا بێ هیچ نارەزایەتیدەربڕینێک درێژە بە سیاســەتی خۆی بدات لەوانەیە ببێتە نموونەیەک بۆ دەوڵەتەکانــی دیکە کە ناتوانن ناکۆکییەکانیان بە شێوازی شارستانی چارەسەر بکەن. لە کەشوهەوای هەستیاری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و شوێنەکانی دیکەی جیهاندا، لەوانەیە هەندێ لە دەوڵەتەکان بێدەنگــی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی وەک ڕێگەپێــدان بە ئەنجامدانی ئەم کردەوانە لێکبدەنەوە.

ئێمــه دڵنیاین ( له بــەر خەڵکەکەمان و ئاشــتی جیهانی) که ئەم سکاڵانامەیەی ئێمه پشتگوێ ناخرێت و ئەنجوومەنی ئاسایش هەڵدەسێت به جێبەجێکردنی ئەرکی خۆی لەو پەیوەندییەدا.

مەسعوود بارزانی

سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان

١ی ئەیلوولی ١٩٨٨، عێراق

******

**رێبەرایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی عێراق**

**کوردستان، عێراق، ١٥ی ئابی ١٩٨٨**

**بەڕێزان:**

جەنابــی «خاوێــر پرێــز دێکوئێــار»، ســکرتێری گشــتی نەتــەوە یەکگرتووەکان

جەنابی نوێنەری یەکێتی سۆڤیەت له ئەنجوومەنی ئاسایش

جەنابــی نوێنەری ویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لــە ئەنجوومەنی ئاسایش

جەنابی نوێنەری بەریتانیا له ئەنجوومەنی ئاسایش

جەنابی نوێنەری کۆماری گەلی چین له ئەنجوومەنی ئاسایش

جەنابی نوێنەری فەرانسا له ئەنجوومەنی ئاسایش

بابەت: پەرەسەندنی شەڕی رەگەزی عێراق بۆ ژینۆسایدی کورد

بەڕێزان:

وێڕای سڵاو و رێز، ئێمه دەمانەوێت سپاس و پێزانینی خۆمان دەربڕین له بەرامبەر هەوڵە چاکەکانی ئێوە بۆ کۆتاییپێهێنانی شەڕی ئێران و عێراق و رزگارکردنی خەڵکی ئەم دوو وڵاتە له کارەساتە مرۆڤی و مادییەکانی ٨ ساڵی رابردوو. هیواداریـن دادپەروەری و ئاشــتییەکی درێژخایەن له نێوان عێراق و ئێرانــدا بێتە ئاراوە و ئارەزووی خەڵکی عێراق بۆ ئازادی و دیموکراســی و مافی مرۆڤ بێتەدی.

ئێزنمان پێبدەن ئەم راستییەتان وەبیر بهێنینەوە (هەروا که پێشتر وەبیری

ئێوەمان هێناوەتەوە) کە شـــەڕێکی دیکـــە دژی کورد لە عێراق بەڕێوەیە کە دەوڵەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق لە ساڵی ١٩٨١وە بەڕێوەی دەبەن. لەم شەڕە شۆڤینییەدا کە لە نیسانی ١٩٨٧وە شێوازی شەڕی ژینۆسایدی تەواوی بەخۆوە گرتووە، ســوپای عێراق چەکی جۆراوجــۆری کۆمەڵکوژ (بەتایبەت چەکی کیمیایی) بەکاردێنێت هەروا کە جیهان لە ناوەڕاســتی مانگی ئاداری ئەمســاڵدا بینی. ئێمە دەمانەوێت ئەوەش زیاد بکەین کە لە کاتێکدا کە ئەم شــەڕە درێژەی هەیە، کاربەدەســتانی عێراق سیاسەتی تیرۆر و سەرکوتی خەڵکــی عێراق- چ کورد، چە عەرەب یــان کەمینە ئەتنیکییەکانی دیکە- پەیڕەو دەکەن. دەوڵەتی عێراق ئەم شـــەڕە خوێناوییە دژی خەڵکێک بەڕێوە دەبــات کە لە مافە بنەڕەتییەکانــی خۆی بێبەش کراوە و تەنها داوای مافی نەتەوەیی خۆی دەکات کە بە گوێرەی هەموو کۆنڤانسیۆنە نێونەتەوەییەکان و پەیماننامەکانی مافی مرۆڤ، مافێکی رەوایە.

شـــایانی ئاماژەپێکردنە کە لە کاتێکدا کە میدیــا نێونەتەوەییەکان لە زمانی پســـپۆڕان و شـــارەزایانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە رایانگەیاندووە کە هێزەکانی عێراق لە شـــەڕی کەنــداو و دژی خەڵکی ســـڤیل لە هەڵەبجە و شـــارو گوندەکانی دیکەی کوردستانی عێراق چەکی کیمیاییان بەکارهێناوە، لـــە هەمان کاتدا دەوڵەتی عێراق دژی خەڵکی ســـڤیل لە گوندەکانی دیکەی کوردســـتان چەکی کیمیایی بەکارهێناوە. بۆ نموونـــە لە ٣٠ و ٣١ی مانگی تەموزی ئەمســـاڵ هێزەکانی عێـــراق گوندەکانی چۆمی بالیســـان، هیران و سماقلۆی[١٧٦] هەڵکەوتوو لە باکووری هەولێریان بە چەکی کیمیایی بۆمباران کردووە. هێرشـــێکی هاوشـــێوە لە ٢ی ئاب لە گوندەکانی ئارای، ســـەرۆ و زاروا[١٧٧] لە نزیکی سنووری تورکیا ئەنجامدراوە.

لە راســـتیدا بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی خەڵکی ئێمە هەتا کاتی نووســـینی ئەم داواکارییە هەروا بەردەوامە. وادیارە هیچ شـــتێک لە ئێستا و داهاتـــوودا ناتوانـــێ پێش لـــە کەڵکوەرگرتنی عێراق لـــە چەکی کیمیایی دژی خەڵکـــی کورد بگرێ، مەگەر ئـــەوەی کە کۆمەڵگای جیهانی، بەتایبەت ئەنجوومەنی ئاسایش هەندێ هەنگاوی جیدیتر لەم پەیوەندییەدا هەڵبگرێت.

ئێمە لـــەو بڕوایەداین کـــە دەوڵەتی عێراق تاوانگەلێکـــی گەورەی دژی کورد ئەنجامـــداوە کە دەکرێت وەک تاوان دژی مرۆڤایەتی لە قەڵەم بدرێت. دەوڵەتی عێراق شـــەڕی ژینۆســـاید بە کەرەســـتەگەلێکی جۆراوجۆر بەڕێوە دەبات، لەوانە:

١- بەکارهێنانی بەرفراوانی چەکی کیمیایی لە ١٤ی نیســـانی ١٩٨٧وە، واتـــا کاتێک کە بۆ یەکەمجار عێراق گوندەکانی شـــێخ وەســـان[١٧٨] و دەیان گوندی دیکەی کیمیاباران کرد.

٢- ڕاگەیاندنی زۆربەی گوندە کوردنشـــینەکان و دەوروبەری شارەکان وەک ناوچـــەی قەدەخەکراو کە تێیاندا فەرمـــان بە هێزە چەکدارەکان دراوە تەقە لە هەموو مرۆڤ و تەنانەت ئاژەڵ و بوونەوەرێک بکەن.

٣- کاولکردنـــی زیاتـــر لە ســـێ هەزار گوند و شـــار و شـــارۆچکە و دوورخستنەوەی زۆرەملێی دانیشتوانەکانیان. گرووپێک لەم خەڵکە ئاوارە و دەربەدەرە بۆ بیابانەکانی باشووری ڕۆژئاوای عێراق گوازراونەتەوە و لەوێ لە ئـــۆردوگا بەکۆمەڵەکان لە هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی یەکجار دژوار و خراپدا ڕایانگرتوون.

٤ ـ سووتاندنی کێڵگە و باخ و دارستانەکانی ئەم ناوچانە.

٥- توندترکردنی گەمارۆی ئابووری ناوچە قەدەخەکراوەکان بە ئامانجی ئەوە کە ژیانی خەڵک لەو شوێنە لەناوبەرن.

٦- درێژەپێدانی سیاســـەتی ئەشکەنجە و لەسێدارەدانی بە کۆمەڵ کە تێیدا بە بیانووگەلێکی ســـادە وەک پەیوەندی سیاسی، ئایینی و نەتەوەیی دەیان و هەندێ جار سەدان کەس، لەوانە منداڵ کوژراون.

لە ســـەروبەندی شاڵاوی ســـەربازی بۆ ســـەر گوندە کوردنشینەکان لە پارێزگاکانی کەرکووک، سلێمانی و هەولێر لە بەهاری ساڵی پار، کاربەدەستانی حکوومەت دەیان هەزار بنەماڵەیان دەستبەسەر کرد. پاشان بەساڵاچووان و منداڵەکانیان لە یەک جیا کردەوە و لە کەمپەکاندا ڕایانگرتن بەڵام پیاوەکان بۆ شـــوێنێکی نادیار ڕاگوازرانەوە کە چارەنووسیان نادیارە. لە هەمان کاتدا ژنـــە گەنجەکان بۆ شـــوێنەکانی دیکە ڕاگوازراونەتـــەوە و کۆمەڵێک هەواڵی

باسنەکراو لە بارەی بارودۆخی ژیانیان بە دەستمانگەیشتووە.

بەڕێز سکرتێری گشتی

بەڕێزان ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایش

بەرەی کوردستانی عێراق کە لە ٦ حیزب پێکهاتووە، داواتان لێدەکات:

١- گوشار بخەنە سەر عێراق تا دەستبەجێ کۆتایی بهێنێت بە بەکارهێنانی چەکی کیمایی دژی خەڵکی کوردستان.

٢- دەست بەکار بن بۆ ئەوەی شەڕی رەگەزی ژینۆساید دژی خەڵکی ئێمە رابوەستێت و هەموو کردەوەیەک بۆ دوورخستنەوە، تەعریب و شێوازەکانی دیکەی گۆڕینی سیمای نەتەوەیی کوردستان وەلاوە بنرێت و ئیزن بە خەڵکی خۆجێیی کوردستان بدرێت بگەڕێنەوە بۆ گوندەکانی خۆیان و ڕێگاچارەیەکی دیمۆکراتیک، دادپەروەرانە و ئاشتیخوازانە بۆ کێشەی کورد بدۆزرێتەوە. ڕێگەمان پێبدەن بگەڕێینەوە بۆ ئەو بەڵێنانەی کە کۆمەڵەی گەلان دایبوو بۆ پاراستنی مافە نەتەوەییەکانی خەڵکی کورد لە کاتی لکیانی باشووری کوردستان بە عێراقەوە.

٣ ـ گوشار بخەنە سەر دەوڵەتی عێراق تا رێز لە مافی مرۆڤ و ئازادی تاکەکەسی سڤیلی هاووڵاتیانی عێراق بگرێت بێ لەبەرچاوگرتنی رەگەزیان و سەرجەم زیندانییە سیاسییەکان ئازاد بکرێن.

جارێکی دیکە رێز و سپاسی ئێمە قبووڵ بفەرموون

مەسعود بارزانی بەوەکالەت لە لایەن رێبەرایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی عێراق

هاوپێچ:

١ ـ لیستی شاڵاوە سەربازییەکانی هێزەکانی عێراق لە نێوان ١٩٨٧/٤/١٥ و سەرەتای ئابی ١٩٨٨ کە تێیدا کەڵک لە چەکی کیمایی وەرگیراوە.

٢ ـ دەقی بڕیارێکی دەوڵەتی عێراق کە فەرمان بە هێزەکانی دەدات هەموو مرۆڤ، ئاژەڵ و بوونەوەرێک لە ناوچەی قەدەخەکراوی کوردستان لەناوببەن.

## بارودۆخی کوردستانی عێراق پێویستی بە کردەوەی خێرا هەیە
## ئەنجوومەنی پیران
## ٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨

سناتۆر پێڵ:

جەنابی سەرۆک، ئەمڕۆ ئەنجوومەنی پیران گەڵاڵە یاسای «پێشگیری لە ژینۆسایدی ١٩٨٨» تاوتوێ دەکات کە من دوێنێ تەسلیم کردبوو و پشتیوانە سەرەکییەکەی، ئەندامی هێژای کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران، سناتۆر هێلمز بوو. لە ئەنجوومەنی پیراندا وێنەی کەم بووە کە گەڵاڵە یاسایەکی ئەوەندە گرنگ بەم خێراییە تاوتوێی بکرێت. بەهەرحاڵ بارودۆخی کوردستانی عێراق پێویستی بە کردەوەی خێرا هەیە. هەروا کە باسمان کرد سوپای عێراق شاڵاوێک بەڕێوە دەبات کە تەنها دەکرێت وەک ژینۆسایدی خەڵکی کورد شرۆڤە بکرێت. گوندە کوردنشینەکانی باکووری عێراق لەگەڵ دانیشتووەکانیان بە دینامیت دەتەقێنرێنەوە. تەنانەت سوپای عێراق لە هێرشە بەرفراوان و کاریگەرەکانی بۆ سەر هاووڵاتیانی بێ پاراستنی کورد گازی ژەهراوی بەکارهێناوە.

کردەوەی عێراق، تاوان دژی مرۆڤایەتییە و دەبێت بە توندترین شێوە وەڵام بدرێتەوە. ئەو ئابلۆقەیە کە ئەم گەڵاڵە یاسایە بە سەر عێراقدا دەیسەپێنێت، قورسە. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دژی بەخشینی قەرز بە عێراق دەنگ دەدات لە ڕێکخراوە ئابوریەکانی جیهان. بۆ وڵاتێک کە ٦٠ بلیۆن دۆلار قەرزارە و داوای قەرز لە ڕێکخراوە ئابورییە نێونەتەوەییەکان دەکات تا پارەی شەڕە گرانەکەی لەگەڵ ئێران دابین بکات، ئەم ئابلۆقەیە قورسە.

ئەم گەڵاڵە یاسایە هەموو کریدیتە ئابوورییەکان و گارانتی کریدیتەکانی

ئەمریکا بە عێراق دەپچڕێنێت کە نزیکەی ٨٠٠ ملیۆن دۆلارە لە ساڵدا. گەلاڵەکە هەروەها ناردنی هەموو شتێک بۆ عێراق قەدەخە دەکات واتا ناردنی هەرشتێک کە لە کۆنترۆڵی رێکخراوەکانی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بێت. ئەم کارە خۆی لە خۆیدا رێگرە لە چوونی ئەو پێداویستییانە کە عێراق پێویستی پێیە بۆ خستنەکاری پیشەسازی نەوت و بووژاندنەوەی ژێرخانی ئابووری کە لە ئاکامی شەڕدا لەکار کەوتووە. گەلاڵە یاساکە هەروەها هەناردنە دەرەوەی نەوتی عێراق قەدەخە دەکات.

لە ئاکامی پەسەندکرانی ئەم گەلاڵە یاسایە، هەندێ لە بەشە بازرگانییەکانی ئەمریکا تووشی زەرەر دەبن، بەلام بە هەرحاڵ ئەمە پەیوەندی بە مەرگ و ژیانی سەدان هەزار کەسەوە هەیە و مەسەلەیەکی ئەخلاقیی زۆر پیرۆزە. بۆ ئەنجامدانی کاری راست و دروست، خەڵکی ئەمریکا لە رابزدوودا ویستوویەتی بەردیل بدات.

پاش هۆلۆکاست کە پشتی جوولەکەکانی ئۆروپای شکاند، خەڵک پێیانوابوو قەد شتی وا ئیدی روونادات، بەلام بەداخەوە ئەوە دیسان لە کوردستانی عێراق روودەدات. ئێمە دەبێت هەرچی لە دەستمان دێت بیکەین بۆ ئەوەی دیکتاتۆری عێراق بزانێت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەرامبەر کۆمەڵکوژی کورد بێ دەنگ نابێت، ئەم گەلاڵەیاسایە ئەم پەیامە دەگەیەنێت.

سناتۆر پرۆکزمایێر(١٧٩):

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن، زۆر ستایشی سناتۆری ئەیالەتی رۆدئیزلەند(١٨٠)، بەڕێز «پێڵ» دەکەم بۆ ئەو هەنگاوە دەستپێشخەرانەیە کە سەبارەت بە بارودۆخی دژواری خەڵکی کورد هەڵیگرتووە. رێبەرایەتی و دووربینی بەڕێز «پێڵ» لەم بوارەدا جێگای رێز و ستایشە.

کـــورد خەڵکێکی لەبیرکراون کە لە ناو ســـنووری چەند دەوڵەتێکی دوژمنـــدا پارچە پارچە کراون و زلهێـــزەکان بۆ ئامانجی خۆیان بە کاری هێنـــاون و لە رۆژئـــاوادا لۆبیان نییە یان لۆبیەکەیـــان لاوازە. هەر بۆیە ماوەیەکی زۆری خایاند تا وەزارەتی دەرەوە وڵامی رووداوە دڵتەزێنەکانی باکووری عێراقی دایەوە. هەروەهـــا هۆکاریکی دیکە، ترس لەوە بوو کە باسکردنی ئەم کێشەیە بە تەواوی هەوڵی ئاشتی[181] لە بار ببات.

لە ناوەڕاستی ۱۹۷۰کاندا سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوە بوو کە پشـــتیوانی لە بزووتنـــەوەی خۆڕاگری کورد بکات لەرێگای دابینکردنی پێداویســـتی سەربازی و پێداویســـتییەکانی دیکە بۆ بەرەی بارزانی لە رێگای ئێرانەوە. پاشـــان هێنری کسینجێر لەگەڵ شای ئێران رێککەوت کە لە ئەنجامدا شا سنوورەکانی ئێرانی داخست و خەباتی کورد هەڵوەشایەوە و ئەو خەڵکە کە ئێمە پشتیوانیمان لێکردن، تێکشکان.

هیچ بەسەرهاتێک بەقەد ئەوەی کە لە ماوەی چەند سەدەی رابردوودا بە سەر کورددا هاتووە بۆ زلهێزێک وەک ئەمریکا ناخۆش نییە. سۆڤیەتیش بۆ کورد باش نەبووە، بگرە خراپتریش بووە.

ئێســـتا دەوڵەتی عێـــراق نەتەنها دژی هێزە چەکـــدارەکان، بەڵکوو دژی گرووپە ســـڤیلەکان، گوندەکان و ئاوارە کوردەکان چەکی کیمیایی بەکاردەهێنێت. ئەم هێرشـــە بە هەوڵدان بۆ دەرکردنی خەڵک و دووبارە نیشتەجێکردنیان لە شوێنەکانی دیکە گەیشتووەتە لووتکە بە ئامانجی لە ناوبردنی کولتووری کورد و کوشـــتنی سیستماتیکی ئەندامانی بنەماڵەی بارزانی.

بەڕێز ســـەرۆکی ئەنجومەنی پیران، ئەمە ژینۆسایدە، ئەمە قەسد و نیازە بۆ لەناوبردنی تەواو یان بەشێک لە گروپێکی نەتەوەیی- ئەتنیکی کـــە بە درندانەترین چەک بەڕێوەدەچێت واتا چەکی کیمیایی کە لەشـــی مرۆڤ وشـــک دەکات و دەیشێوێنێت و مرۆڤ بە مەرگێکی درێژخایەن و بەژان دەکوژێت و ئەگەر قوربانییەکە خۆشـــبەخت بێت کتووپڕ بە گازی دەمار دەمرێت.

من لەوە دەترسم ئەم کردەوەیە ببێتە سەرەتایەک بۆ ئەوەی ئەو وڵاتانەی کە لە بواری بەرهەمهێنانی چەک پێشکەوتوون ئەم جۆرە چەکە هەڵبژێرن. تکاتان لێدەکەم ئەم گەلاڵە یاسایە پەسەند بکەن و هیوادارم کە بە شێوەیەک لە شێوەکان بتوانێت ئێش و ژانی خەڵکی کورد کەم بکاتەوە.

نازانم کەی ئێمە فێری وانە دەبین لە ڕووداوەکانی ئیتیۆپی یا لیبی یا بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی فەلەستین یان زەئیر، بروندی، سریلانکا، پیرۆ یان هەر وڵاتێکی دیکە کە لەگەڵ گروپە خەباتکارە ناوخۆیەکان ڕووبەڕوویە؟

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، ئەگەر وڵاتێک وەک نیکاراگوئە چەکی کیمیایی دژی هاووڵاتیانی خۆی یان وڵاتێکی دراوسێی خۆی بەکارهێنابا شەپۆلی توڕەیی و نارەزایەتی خەڵک بە گشتی و سیاسەتمەدارەکان و دەوڵەتەکەی خۆمان هەموو دنیای دادەگرت. نابێ سەرۆک کۆمار، وەزارەتی دەرەوە و بەتایبەت وەزارەتی بەرگری لە بەرامبەر کردەوەیەکی دڕندانەی وا بێدەنگ بن، دەبێ داوا لە نەتەوە یەکگرتوەکان و کۆمەڵگای جیهانی بکەین لەو کردەوەیە بکۆڵنەوە. دەبێ ئەوکاتەش وەجواب بێین کە ژینوسساید دژی نەتەوەیەک ڕوو دەدات کە دوورە لە ئەمریکا یان بۆ ئەمریکا نامۆیە و کاریگەری لە سەر ژیانی ڕۆژانەی ئێمە نییە و خۆی نەبووە بە قوربانی ئەم چەکە کیمیاییە نامرۆڤانانە. تکا دەکەم ئەم گەلاڵەیاسایە پەسەند بکرێت و هیوادارم کە گەلاڵەیاساکە تۆزێک لە ئێش و ئازارەکانی گەلی کورد سارێژ بکاتەوە.

سناتۆر هێلمز (١٨٢):

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن، هەفتەی ڕابردوو میلیۆنەها ئەمریکایی ئاگاداری ئەو شاڵاوە ترسناکانە بوونەوە کە دەوڵەتی عێراق بۆ لە ناوبردنی سیستماتیکی هاووڵاتیانی کوردی خۆی ئەنجامیدا. ئەمە تاوان دژی مرۆڤایەتییە و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نابێت بێکار

دابنیشێت و بێ دەنگ بێت لە بەرامبەر ئەوەی کە ڕوودەدات. بیرکردنەوە لەوە زۆر ترسـناکە کە چۆن ڕژێمێکی زاڵم و ڕادیکاڵ وەک ڕژێمی سەدام حوسـەین بوونی هەیە. دەوڵەتی عێراق زۆربەی جاران کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە و هەزاران کوردی کوشتووە و هەزاران کەسی دیکەی ناچار کردووە ڕابکەن بۆ وڵاتانی دراوسێ.

ئەمە بە هیچ شێوەیەک یەکەمجار نییە کە ڕژێمی عێراق- کە زۆربەی چەکەکانی لە سۆڤیەت دەکڕێ- دژی خەڵکی سڤیلی خۆی چەکی کیمیایی بەکار دێنێت. لە مانگی ئاداری ئەمساڵ عێراق بە چەکی کیمیایی هێرشی کردە سەر شـارێکی کوردنشـین. بە گوێرەی هەواڵنێرەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڕاپۆرتە جیهانییەکان ئەم هێرشـە پێنج هەزار خەڵکی بێ گوناهی کوشـتووە. ڕاپۆرتە هەواڵەکان دەڵێن ئەم هێرشـە بۆ سـزادانی هاووڵاتیانی کوردی عێـراق بووە. ئەمە لە کاتێکدایە کە بە هەرحاڵ لە مانگی ڕابردوودا هێرشـی ڕژێمی عێراق بۆ سەر هاووڵاتیانی کوردی خۆی توندتر بـووە. بەگوێرەی ڕۆژنامەی «نیۆیۆرک تایمز» ڕژێمی عێراق لە ئاگربەسـتی ٢٠ی ئاب لەگەڵ ئێران وەک هەلێک کەڵک وەردەگرێت بۆ ئەوەی هێرشێکی سەربازی دژی کورد ئەنجام بدات.

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەنی پیران، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نابێت لە لایەک بێکار دابنیشـێت و سـەیری هێرشـی عێراق بۆ سەر سـێ تا چوار ملیۆن کـوردی هاووڵاتی خۆی بـکات. خەڵکی ئەمریکا نایانەوێـت ئێمـە بێدەنگ بین. لە ڕاسـتیدا من بە شـانازییەوە دەڵێم کە کنیسـەی «دۆت»[١٨٣] کە یەکەم کنیسـەی «بابتیسـت»[١٨٤] لە «ئالکسـاندریا»[١٨٥] لە ویلایەتی«ڤیرجینیا»یە، ئێستا پەنای بەو سێ کوردە داوە کە بۆ شـەرمەزارکردنی کردەوەکانی ڕژێمی عێراق دەستیان بە مانگرتن کردووە.

ئەم گەڵاڵە یاسایە- کە من شانازی بەوە دەکەم کە سەرۆکی هێژای کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە پشتیوانی لێکردووە- بە ڕژێمی عێراق نیشان دەدات وڵاتی ئێمە چەندە بە جیدی سەیری هێرشی عێراق بۆ سەر

کورد دەکات. هەروەها دڵنیامان دەکاتەوە کە دۆلارە باجەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک یارمەتی نادرێت بە رژێمی عێراق. بەتایبەت پێویستە نوێنەرانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەموو رێکخراوە ئابووریەکانی جیهان وەک بانکی جیهانی دەنگ بدەن دژی بەخشینی هەر چەشـــنە قەرزێک بە عێراق. لەمە زیاتر دەبێ هەموو یارمەتی، فرۆشتنی چەک و تەقەمەنی، کریدیتە ئابوورییەکان و گارانتی کریدیتەکان بە عێراق قەدەخـــە بکرێت و ناردنەدەرەوەی نەوتـــی عێراق قەدەخە بکرێت کە لە ۱/۰۲ لـــە ۱۰۰ی نەوتی هـــاوردەی ئەمریکا پێکدەهێنێت. ئەم ئابڵۆقەیە بەردەوام دەبێت هەتا کاتێک کە ســـەرۆک کۆمار پشتڕاستی بکاتەوە کە عێراق بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و شـــاڵاوەکانی بۆ ژینۆسایدی کورد راوەستاندووە.

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن، داوا دەکەم وتارەکەی «کارێل مۆرفی» (۱۸٦) کە ۷ی ئەیلوول لە رۆژنامەی «واشـــنگتۆن پۆست» بڵاوبووەتەوە (کە باسی شـــەرت و مەرجی بەخشینی مافی پەنابەری بە سێ کورد دەکات لەلایەن یەکەم کلیســـای باپتیســـت لە ئالکساندریا) و وتارە بەنرخەکەی «ویلیام ســـافاییر» کە لە ۹ی ئەیلوولی ۱۹۸۸ لە رۆژنامەی «نیۆیۆرک تایمز»دا بڵاو بووەتەوە، بخرێتە بەردەستی ئەندامانی ئەنجوومەن.

***

## گەڵاڵە یاسای پشتگیری لە ژینۆسایدی ١٩٨٨

بەشی ١: ناوی ئەم یاسایە، پشتگیری لە ژینۆسایدی ١٩٨٨-ە

بەشی ٢: کۆنگرێس دەڵێت:

١- نەتـــەوەی کورد گرووپێکی ئەتنیکی جیاوازە کە نزیکەی ٢٠ میلیۆنە و خاوەن مێژوویەکی کۆن و میراتێکی کولتووری دەوڵەمەندە.

٢- ســـێ تا چوار میلیۆن کورد هاووڵاتی عێراقن و لە باکووری ئەو وڵاتە نیشتەجێن.

٣- سوپای عێراق هێرشێکی ئەنجامداوە بۆ چۆڵکردنی ناوچە کوردنشینەکانی عێراق لە رێگای کاولکردنی هەموو گوندە کوردنشینەکان لە زۆربەی ناوچەکانی باکووری عێراق و هەروەها لە رێگای کوشتنی خەڵکی سڤیل.

٤- هێما و بەڵگەنامە تایبەتەکان نیشـــان دەدات کە سوپای عێراق چەکی کیمیایی دژی خەباتکارانی کورد و هاووڵاتیانی ســـڤیل بەکار هێناوە و ئێستاش بەکاری دەبات.

٥- دەیان هەزار کوردی رزگاربوو لە هێرشـــەکانی ســـوپای عێراق پەنایان بردووەتە تورکیا.

٦- بەکارهێنانـــی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراق پێشـــێلکردنی یاســـای نێونەتەوەییە.

٧- هێرشـــی عێراق دژی خەڵکی کورد ژینۆسایدە کە تاوانێکە کە خەڵکی شارســـتانی لە هەموو شـــوێنێک نەفرەتـــی لێدەکەن و یاســـای نێونەتەوەیی قەدەخەی کردووە.

بەشی ٣: ئابلۆقەکان دژی عێراق

١- کاربەدەســـتان و نوێنەرانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەموو رێکخـــراوە ئابوورییە نێونەتەوەییەکان کە ئەمریکا ئەندامیانە دژی بەخشـــینی هەرچەشنە قەرزێک بە عێراق دەنگ دەدەن.

٢- ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نابێت هیچ چەشنە کریدیتێکی ئابووری و گارانتی کریدیت بدات بە عێراق.

٣- نابێـــت هیچ کاڵایەکی قەدەخەکراو لەلایـــەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی

ئەمریکاوە بۆ عێراق بگوازرێتەوە.

٤- نابێــت نــەوت و بەرهەمــە نەوتییەکانی عێــراق هــاوردەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکرێت.

بەشی ٤: چاوپۆشییەکان: سەرۆک کۆمار دەتوانێت چاوپۆشی لە گەمارۆکانی بەشی سێ بکات ئەگەر دڵنیابێت و بۆ سەرۆکی کۆنگرێس و سەرۆکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران بنووسێت کە:

١ ـ عێراق خەڵکی کورد ژینۆساید ناکات.

٢- عێــراق چەکی کیمیایی بەکارناهێنێت کە لەلایەن پەیمانانامەی ١٩٢٥ی ژنێــڤ قەدەخەکــراوە و گارانتی جێگای متمانەی داوە کــە ئێدی لەم چەکانە کەڵک وەرناگرێت.

بەشی ٥: ستایشکردنی تورکیا:

کۆنگرێس ستایشــی دەوڵەتی تورکیا دەکات بۆ داڵدەدانی هەزاران ئاوارەی کورد کە لە قەلاچۆکردنەکانی عێراق هەڵهاتوون و داوا لە سەرۆک کۆمار دەکات سپاس و پێزانینی ئێمە بگەیەنێتە دەوڵەتی تورکیا.

بەشی ٦: یارمەتیدان بە ئاوارەکوردەکان:

کۆنگرێــس هەســت دەکات کە ویلایەتە یەکگرتووەکانــی ئەمریکا دەبێت یارمەتی بەو ئاوارە کوردانە بدات کە پێویستیان بە دەوا ودەرمان و یارمەتییە مرۆڤییەکانی دیکە هەیە.

بەشی ٧: بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:

داوا لە وەزیری دەرەوە دەکرێت بە زووترین کات مەسەلەی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی هاووڵاتیانی خۆی- کە زۆربەیان هاووڵاتی سڤیلی بێ پاراستنن- تەسلیمی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات تا بە گوێرەی بڕیارنامەی ٦٢٠ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاری گونجاو و کاریگــەر دژی عێراق دەربکرێــت بەهۆی کەڵکوەرگرتنی بەردەوام لە چەکی کیمیایی.

بەشی ٨: بەرواری کارپێکردن: لە ڕۆژی پەسەندکردنیدا کار بەم بڕیارنامەیە دەکرێت.

## دەبێت لە ئاکامەکانی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی کورد بترسین
## ئەنجوومەنی نوێنەران
## ٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨

کۆنگرێسمەن گیلمان[١٨٧]:

جەنابی سەرۆک، رۆژنامەکانی ئەمرۆ ئاشکرایان کرد کە وەزارەتی دەرەوە بەو ئەنجامە گەیشتووە کە عێراق چەکی کیمیایی دژی هاووڵاتیانی سڤیلی کورد و خەباتکارە چەکدارەکانی ناوخۆی عێراق بەکاردەهێنێت.

ئەگەر پێشتر عێراق هەستی بەوە دەکرد کە کورد مەترسییە لە بەر ئەوەی گەلێ لە کوردەکانی عێراق هاوپەیمانی ئێران بوون ئێستا کاتی نیگەرانییەکی وەها بەسەر چووە، چونکە عێراق و ئێران ئاگربەستیان راگەیاندووە. بەهەرحاڵ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن پەیماننامەی ١٩٢٥ی ژنێڤ قەدەخە کراوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هاووڵاتیانی عێراق بەشدارییان لە هیچ راپەڕینێکدا نەکردووە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی هاووڵاتیانی کورد کاریگەری جیدی دەبێت لە سەریان.

من ستایشی حکومەتی ئەمریکا دەکەم بە بۆنەی ئەو راگەیاندننامە راشکاوانەیە کە دەریکرد و بەردەوام عێراق و ئێرانی ئیدانە کرد بەهۆی کەڵکوەرگرتن لەم چەکانە لە شەڕی ئێران و عێراقدا. ئێمە نابێت رێگە بەوە بدەین چەکی کۆمەڵکوژ وەک چەکی کیمیایی و مووشەکە دوورهاوێژەکان ببن بە شتێکی ئاسایی. تەنانەت بیرکردنەوە لە کەڵکوەرگرتنی ئاسایی لەم چەکانە بۆ ئاشتی و سەقامگیری جیهان ترسناکە. گەلێ لە وڵاتانی جیهان- و بەتایبەت رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ناسەقامگیر- لە سەروبەندی ئەمبارکردنی ئەم چەکانەدان. ئێمە نابێت رێگە بەوە بدەین ئەم رەوتە هەروا درێژەی هەبێت. ئێمە بە دڵنیاییەوە دەبێت بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و هەر چەشنە چەکێکی دیکە دژی کورد هەڵبەسەنگێنین و هەموو چەشنە گوشارێک بخەینە سەر دەوڵەتی عێراق تا رەفتاری ئێستای خۆی بگۆڕێت.

خەڵکی ئەمریکا ستایشی دەوڵەتی ئەمریکا دەکات بۆ داڵدەدانی ئەو کوردانەی کە لە عێراق هەڵاتوون و هیواداره ئەم مرۆڤدۆستییە تا کاتی پێویست درێژەی هەبێت. لەپێناو مرۆڤدۆستی و ئاشتی و سەقامگیری جیهاندا دەوڵەتی عێراق دەبێ سیاسەتی ئێستای خۆی بگۆڕێت.

## عێراق لە شاڵاوی ژینۆسایدی کەمینەی کورددا، چەکی کیمیایی بەکاردێنێت

**ئەنجومەنی پیران**

**٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨**

سناتۆر جان مەککەین[١٨٨]: جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، منیش هاوڕا لەگەڵ سەرجەم هاوکارەکانم کەڵکوەرگرتنی عێراق لە گازی کیمیایی شەمەزار دەکەم. بە بۆچوونی من نابێت دژایەتیکردنی ئێمە لەگەڵ زێدەخوازییە دەمارگرژانەکانی ئێران لە کاتی شەڕی ئێران و عێراق و زاڵبوونی ئیسلامی (ئێرانی بە سەر ناوچەدا) پاڵمانپێوەبنێت تا بەو ئەنجامە بگەین کە ئەمریکا دەبێ کەڵکوەرگرتنی عێراق لە گازی کیمیایی پشتگوێ بخات یان لێیببورێت.

پێموانییە هیچ ئەندامێکی ئەنجومەنی پیران هەبێت کە پێیوابێت عێراق مافی خۆی بووە کە گازی کیمیایی بۆ ئامانجگەلی سەربازیی بەکارهێناوە. جەنگ خۆی لە خۆیدا شتێکی ترسناکە چی بگات بەوە کە چەکی کۆمەڵکوژیش تێیدا بەکارهێنرابێت. کاریگەرییەکانی چەکی کیمیایی دەیان ساڵ بەردەوام دەبێت و دەبێتەهۆی مەرگی بەرەبەرە و بە ئێش و ئازاری ئەو کەسە کە تووشی کیمیایی بووە.

بەهەرحاڵ مەسەلەی لەوەش ترسناکترە ئەوەیە کە عێراق گازی کیمیایی لەو ناوچانەی ئێران بەکارهێناوە کە دەیزانی خەڵکی سڤیلی تێدایە و

ئێستاش لە شالاوی ژینوسایدی کەمینەی کوردی خۆی چەکی کیمیایی بەکاردەهێنێت. پێشتر بینیمان کە هەم دەوڵەتەکان و هەم بزووتنەوە چەکدارەکان دەیانەوێت رۆژبەرۆژ زیاتر خەڵکی سفیل، لەوانە ژن و منداڵ بکەن بە ئامانجی هێرشە سەربازی و کردەوە تروریستیەکانیان. لەو پەیوەندییەدا ئەوەندە بەسە کە بیر لە کامبۆج، نەهامەتیە بەردەوامەکانی خەڵکی لوبنان یان کردەوە دڵرەقانەکانی ئێستای «بروندی» بکەینەوە بۆ ئەوەی بزانین کە میراتی کوشندەی جەنگی دووەمی جیهانی لە گەلێ لە شوێنەکانی ئەم دنیایە بەردەوامە[١٨٩]

بەلام بەهەرحاڵ دەستپێکردن بە بەکارهێنانی گازی کیمیایی رەهەندێکی نوێ و ترسناکتری بەم جەنگانە بەخشیوە. تەقینەوەی ناکۆکییە ئەتنیکی و عەشیرەتیەکان بۆ دژمنایەتی و توندوتیژی شتێکە و بەردەوامبوونی بەکارهێنانی سیستماتیکی چەکی کۆمەڵکوژ لە جەنگە ماڵوێرانکەرەکان شتێکی دیکەیە. عێراق بەتەواوی دەستیداوەتە ئەم رەوتە. سەرەرای فرتوفێڵ و ساتوسەوداکانی عێراق بۆ شاردنەوەی راستیەکان، وادیارە روون بووەتەوە کە هەزاران مرۆڤی بێگوناه بەدەستی عێراق دەکوژرێن تەنها بە هۆی ئەوەی سەر بە کەمینەیەکی ئەتنیکین.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، من بۆم بووەتە پرسیار کە ئایا ئەگەر ئەم قوربانیانە کورد نەبان ئێمە کاری زیاترمان نەدەکرد بۆ پاراستنیان؟ ئەوە راستە کە کوردەکان لە دنیا تەریکخراون، ئەوە راستە کە هەندێ لە کوردەکان دەستیانداوە بە شەری ناوخۆ و کردەوەی تروریستیانە ئەنجام دەدەن و خەڵکی سڤیلی دیکە دەکوژن[١٩٠]، ئەوە راستەکە کوردەکان بوونەتە داردەستی مێژوو و تەنها کاتێک بایەخی ئیستراتژیکیان بووە کە ئەو وڵاتانە کە کوردەکان تێیاندا دەژین کوردیان دژی دەوڵەتانی دوژمنی خۆیان بەکارهێنابێت. بەلام بەهەرحاڵ ئەوە نابێتە پاساو بۆ ئەو شتانە کە بەسەر کوردا هاتووە و نابێتە پاساویش بۆ ئەوەی ئێمە ئەو راستیە پشتگوێ بخەین کە کۆمەڵکوژیی (لە هەموو شوێنێک و لە هەموو حاڵەتێکدا) کۆمەڵکوژییە. جگە لەوەش پێویستە ئێمە تێروانینێکی

درێژخایەنترمان بۆ ئەو هەڕەشە ستراتژیکانە هەبێت کە بەکارهێنانی گازی کیمیایی و چەکی کۆمەڵکوژ بۆ بەرژەوەندییەکانمان دروستی دەکات.

ئەوە راستــە کە ئێمە دەبێ لەچوارچێوەی پەیوەندیەکانمان لەگەڵ عێــراق بەرژەوەندەییە درێژخایەنەکانمــان بپارێزین و پێگەی خۆمان لە کەنداو بپارێزین یان لە مەســەلەی ســەقامگیری و گەشەکردنی وڵاتانی جیهانی سێیەمدا بەرژەوەندیەکانمان بپارێزین. ئەگەر لە روانگەیەکی زۆر بەرتەسکەوە سەیری مەسەلەکە بکەین ئێمە دەبێ پەیوەندی دۆستانەمان لەگەڵ عێراق هەبێــت و بەرژەوەندیمان لەوەدایە کە دەوڵەتێک ببێت بە ســپەرێکی بەهێز، سەربەخۆ و ســکولار (عیلمانی) لە باکووری کەنداو. بەرژەوەندی ئێمە لەوەدایە کە عێراق تەشــویق بکەین نەرمونیانتر بێت، پەیوەندیــە بازرگانیەکانی لەگەڵ رۆژئاوا پەرەپێبدات و ببێت بە وڵاتێکی مودێرن و پێشکەوتوو.

بەڵام بەهەرحاڵ ئێمە ناتوانین بە چاوبەســتن لە حەنای ژینۆســاید، پەیوەندییەکــی بەردەوام و درێژخایەنمان لەگــەڵ عێراق هەبێت. دەبێ خۆمان ئامادە بکەین لەگەڵ عێراق رووبەڕوو بینەوە هەر کاتێک کە عێراق لە رێچکەی نەرمونیانبوون لایدا، نابێت تەحەمولی ئەوە بکەین کە عێراق بگەڕێتەوە بۆ پشتیوانیکردن لە تروریزم و دەبێ هەرچی لە دەستماندایە بەکاربێنین بۆ ئەوەی لە رەوتی ئێســتا بۆ بەکارهێنانی گازی کیمیایی لایبدەیــن. لەپێنــاو پێگەکەمان لە کەنداو دەبێ دان بــەوەدا بنێین کە عێراقێکی بەهێز و ســەربەخۆ بە هەمان ئەنــدازە کە بۆ خودی عێراق گرنگــە بە هەمان ئەندازەش بۆ بەرژەوەندیە ئیســتراتژیکەکانی ئێمەش گرنگە. پێویستە دان بەوەدا بنێن کە کۆتاییپێهاتنی شەڕی ئێران و عێراق هیچ لایەنگرێکی رۆژئاوای لە ناوچە نەهیشــتوەتەوە. بەحرەین، کوەیت، عەمان و عەرەبستانی سعودی دۆستی ئەمریکان بەڵام تا رادەیەک لاوازن و نــە دەتوانن بە فەرمی بنکە لە ناوخــۆی وڵاتەکەیان بدەن بە ئێمە و نە دەتوانن دەوری پاراســتنی ناوچە وەئەستۆ بگرن کە زیاتر لە نیوەی سەرچاوەکانی نەوتی جیهانی تێدایە.

ئەو فاکتۆرە کە دەتوانیت ناوچە سەقامگیر بکات جۆرێک هاوسەنگییە لە نێوان ئێران و عێراقدا بۆ ئەوەی پێش لە زیادەخوازیی ئەو دوو دەوڵەتە بە مەبەستی زاڵبوون بەسەر دراوسێکانی یان کەنداو بگرێت. ئەمە بە واتای ئەوەیە کە ئێمە دەبێ کەڵکوەگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی شەرمەزار بکەین بە هەمان شێوە کە دەمانەوێت لەسێدارەدانی بەکۆمەڵی سەدان هەزار لاوی ئێرانی بەدەستی خومەینی شەرمەزار بکەین[191].

کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی هەوڵەکانی وڵاتانی دیکەی خێراتر کردووە بۆ ئەوەی ئەنباری گەورەی ئەم جۆرە چەکانە دروست بکەن. ئێران چالاکانە خەریکی بەرهەمهێنانی چەکی کیمیاییە، سوریەش بە هەمان شێوە خەریکە. ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ ڕێگە بەوە بدەین کە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکارببرێت بەدڵنیاییەوە لە ساڵانی داهاتووش دژی ئیسرائیل یان عەرەبستانی سعودی و کەمکەم دژی هێزەکانی خۆمان لە شەڕە سووکترەکاندا بەکاردەبردرێت. ئێمە بەردەوام ئاماژە بەوە دەکەین کە دنیا کارێکی هەڵەی کردووە کە ڕێگای بەوەداوە ژاپۆن گازی کیمیایی دژی چینیەکان[192] بەکارببات یان ئیتالیا گازی کیمیایی دژی ئیتیوپیا بەکار ببات[193] یان ئاڵمانیا هێزی هەوایی بەکاربێنێت بۆ لەناوبردنی خەڵکی سڤیلی گورنیکا[194] و نیڤیل چەمبیرلین خەڵکی چکسلۆڤاکیا پشتگوێ بخات[195].

## نابێت لە بەرامبەر کیمیابارانی کوردەکان بێدەنگ بین

**ئەنجوومەنی پیران**

**١٢ی ئەیلوولی ١٩٨٨**

سناتۆر گۆر[١٩٦]:

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، بە گوێرەی راپۆرتە تێروتەسەل و بەڵگەمەندەکان، دەوڵەتی عێراق ئێستا هەوڵ دەدات رێگاچارەی کۆتایی بە سەر خەڵکی کورددا بسەپێنێت. پتر لە ١٠٠ هەزار کورد پێشتر لە دەستی سوپای عێراق هەڵهاتوون و سنووری تورکیایان بەزاندووە. نزیکەی ٥٠ هەزار کورد لەو ناوچە قەدەغەکراوانەدا کەوتوونەتە داو کە دەوڵەتی عێراق فەرمانیداوە کەس نابێت تێیدا بژیت. ئێستا ئەم خەڵکە بوونەتە ئامانجی ئۆپەراسیۆنێکی (شالاوی) سەربازی کە بەگوێرەی گەلێ لە راپۆرتەکان چەکی کیمیاییش تێیدا بەکاردەبرێت.

ئەگەر جیهان نەیەوێت وولامی ئەم کردەوانە بداتەوە، ناچار دەبین لەگەڵ کردەوەیەکی دڵڕەقانەی بەکۆمەڵ رووبەڕوو بینەوە بە دەستی دەوڵەتێک کە کردەوەکانی، شەرەفی مرۆڤایەتی و شارستانییەت لەکەدار دەکات. لەم کاتەنەدا نابێت بێدەنگ بین. ئەو دەوڵەتانەی کە ئاگاداری ئەم کردەوانەن و دەنگ ناکەن، دەبن بە شەریکی ئەم کردەوانە.

هەفتەی رابردوو ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا سەرەنجام بێدەنگی شکاند و بوو بە نموونەی وەڵامی جیهان بە تاوانە بەردەوامەکانی هێزەکانی عێراق دژی مرۆڤایەتی، لەوانە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی.

سپاس بۆ سناتۆر «پێڵ» و ئەنجوومەنی پیران بەبۆنەی پەسەندکردنی ئەم گەڵاڵەیاسایە کە ئامانجی پچڕانی یارمەتییەکانی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکایە بە عێراق و کۆتاییپێهێنانە بە کڕینی نەوتی عێراق لەلایەن ئەمریکاوە.

ئەمە تەنها سەرەتایەکە و بەس نییە. بۆ گەیشتن بە ئەنجام ئیمە دەبێت بیرورای جیهانی هان بدەین داوا لە عێراق بکات دەست لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی هەڵگرێت و ئیزن بە پشکێنەرە نێونەتەوەییەکان بدات

لێکۆڵینـــەوە بکەن ســـەبارەت بە بەکارهێنانی چەکـــی کیمیایی و لەگەڵ کوردەکانی دانیشـــتووی وڵاتی عێراق بە گوێرەی مەرجەکانی مەنشـــووری نەتەوە یەککگرتووەکان و یاسای نێونەتەوەیی هەڵسوکەت بکات. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە من ئەم کردەوە تایبەتانە پێشنیار دەکەم:

١- دەوڵەتی ئێمە دەســـتبەجێ راگەیاندننامەیەک دەربکات کە تێیدا هێماو بەڵگەکانی خۆی بە تێروتەسەلی بخاتەڕوو.

٢- ئێمـــە دەبێت داوا لە ئەنجوومەنی ئاســـایش بکەیـــن بە زووترین کات لێپرســـینەوە لەم مەســـەلەیە بکات کە ئایا عێراق لە ســـەروبەندی جێبەجێکردنی سیاسەتی ژینۆسایددایە یا نا.

٣- ئێمە دەبێ داوا لە هاوپەیمانەکانمان بکەین (کە هەندێکیان شەریکی بازرگانـــی عێراقن یان چەک و تەقەمەنـــی بۆ دابین دەکەن) کە خوازیاری ئەوە بن کە عێراق لە بەرامبەر ئەم تاوانە وەڵامدەر بێت.

٤- ئێمـــە دەبێـــت راســـتەوخۆ دژی بێدەنگی دەوڵەتانـــی ئەندامی «بزووتنەوەی بێلایەن»[١٩٧] رابوەستین و داوایان لێبکەین بێدەنگ نەبن.

٥- ئێمە دەبێت بە هەمان شێوە داوا لە یەکێتی سۆڤیەت بکەین کە بێ دەنگ نەبێـــت. هاوتەریببوونی بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریـــکا و یەکێتی ســـۆڤیەت ئەم پەیامە بە رێبەرانـــی عێراق دەدات کە دەبێت سیاسەتی خۆیان بگۆڕن.

٦- ئێمـــە دەبێت بەو وڵاتانەی کە پەیماننامەی ژنێڤیان واژۆ کردووە ( ســـەبارەت بە قەدەغەبوونـــی بەکارهێنانی چەکی کیمیایـــی) رابگەیەنین کـــە بێدەنگبوون لە بەرامبەر تاوانێکی وەهـــا ئەم پەیماننامەیە دەکات بە پەیماننامەیەکی مردوو و بێ کەڵک.

٧- ئێمـــە دەبێت خێراتربین لە دابینکردنی پێداویســـتییەکانی ئاوارە کـــوردەکان لە تورکیا و ئەو رێکخراوانەی کـــە یارمەتی ئەوان دەدەن، لە وانە نەتەوە یەککگرتـــووەکان و خودی دەوڵەتی تورکیا. ئێمە دەبێت لەوە دڵنیابین کە پێداویستییەکانی ئاوارەکان دابین دەکرێت. بۆ راپەڕاندنی ئەم کارانە، هەندێ هەنگاوی تایبەت هەیە کە ئێمە دەتوانێن لەو پەیوەندییەدا

هەڵیبگرین، وەک:

١- دەبێ ئەنجوومەنی پیران داوا لە وەزیری دەرەوە بکات لە زانیارییەکانی بەر دەستی بۆ ئەم مەبەستە کەڵکوەربگرێت.

٢- پێشنیار دەکەم هەر دوو حیزب[198] لە رێگای رێبەرەکانیانەوە کاربکەن بۆ پێکهێنانی دامەزراوەی ئاڵوگۆڕی زانیاریی بۆ کۆبوونەوە و شرۆڤەکردنی زانیارییەکان بە نوێنەرایەتی لەلایەن ئەنجوومەنی پیرانەوە.

٣- ئێمە دەتوانین لە رێگای باڵوێزی تورکیا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سپاس و پێزانینی خۆمان رابگەیەنین بە دەوڵەتی تورکیا بۆ ئەوەی تا ئێستا ئەوەی لە دەستی هاتووە کردوویەتی بۆ ئاوارە کوردەکان و ئاگاداریان بکەینەوە کە ئەنجوومەنی پیران ئامادەیە پێداویستییە مادییەکانی ئەم ئاوارانە دابین بکات.

٤- ئێمە دەبێت لە رێگای باڵوێزی سۆڤیەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داوا لە سۆڤیەت بکەین کە بۆ شەرمەزار کردنی رەفتاری عێراق بە گشتی، پەیوەست بێت بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

٥- ئێمە دەتوانین و دەبێت داوا لەو رێکخراوانە بکەین کە شەریکی بازرگانی عێراقن و پشتیوانی لێدەکەن و شتومەکی بۆ دابین دەکەن کە بێ هەڵوێست نەبن و دەسترۆیشتوویی خۆیان بەکاربهێنن.

٦- ئێمە دەبێت لەوە دڵنیابین کە خەڵکی ئەمریکا هۆشیار بێت سەبارەت بەو شتانە کە روودەدات.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ئێمە نەتەنها دەتوانین لە سەرچاوەکانی خۆمان کەڵکوەربگرین بەڵکو دەبێت داوا لە دوو پاڵێوراوەکانی سەرۆک کۆماری[199] بکەین لەم پەیوەندییەدا هەڵوێست بگرن.

بەرێز جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، ئەم بێ باکییەی عێراق شتێکی مەعقوول نییە. رێبەرانی عێراق ئاگاداری بارودۆخی جیهانن و دەزانن کە بەرژەوەندییە مەزنەکانی ئەوان بە توندتربوونی بیروڕای گشتی دەکەوێتە ناو مەترسی. هەر بۆیە ئێمە دەتوانین لە ئاکامی ئەم رووداوانە کەڵکوەربگرین ئەگەر بیروڕای گشتی بهەژێنین.

## جیهانی شارستانی ناتوانێت تەحەمولی کیمیابارانی کوردەکان بکات
## ئەنجوومەنی نوێنەران
## ١٣ی ئەیلوولی ١٩٨٨

کۆنگرێسمەن پیێس:

جەنابی ســەرۆکی ئەنجومەن، دەمەوێت ستایشی وەزیری دەرەوە، بەڕێز شوولتز، حکومەتی رەیگان و ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا بکەم بە بۆنەی ئەو هەنگاوانەی کە ئەم دواییانە هەڵیانگرتووە بۆ سەرنجپێدان بە کەڵکوەرگرتنی عێراق لە گازی کیمیایی. من لە چەند مانگ لەمەوبەر تا ئێســتا رۆژ بە رۆژ دڵتەنگتــر دەبم بە بیســتنی ئەو راپۆرتــە متمانەپێکراوانە کە دەڵێن عێراق لە ماوەی شــەڕی درێژخایەنی ئێران و عێراقــدا، چەکی کیمیایی دژی ئێران بەکارهێناوە. من پێموایە کە بەشی زۆری جیهانی شارستانی بەتایبەت ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بێ هەڵوێســت بــووە و کاری زۆر کەمی کردووە بۆ شــەرمەزارکردن و هەنگاوهەڵگرتن دژی زیادەڕۆیی عێراق و کەڵکوەرگرتن لە گازی ژەهراوی کە لە ماوەی ٦٠ ســاڵی رابردوودا قەدەخەکراوە و شــەرمەزار کراوە.

شەڕی ئێران و عێراق بە ئاگربەست کۆتاییپێهاتووە، لانیکەم جارێ کۆتایی پێهاتووە. کەوابوو راپۆرتەکان ســەبارەت بە کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی ســەربازانی ئێران لە چەند رۆژ و هەفتەی پێش ئاگربەســت، پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە ئێســتاوە نییە و ئێســتا هیچ دووژمنایەتییەک لە نێوان عێراق و ئێراندا نییە. بەڵام کتووپڕ پاش ئەوەی کە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی ئێران کۆتاییپێهاتووە، عێراق شــەڕێکی دەســتپێکردووە دژی هەندێ لە خەڵکی وڵاتی خۆی کە کوردن و لە باکووری عێراقدا نیشــتەجێن. زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین عێراق هەوڵ دەدات بۆ لەناوبردنی خەڵکی کورد لەو وڵاتە.

ئەمە سەرەتایەکی خراپە، زۆر جاران ژینۆساید شەرمەزار دەکرێت، بەڵام لە

هەموو شت خراپتر ئەوەیە کە عێراق بۆ ژینۆساید گازی ژەهراوی بەکاردەبات. لە دوو هەفتەی رابردوودا ژمارەیەکی زۆر راپۆرتی متمانەپێکراو بڵاو بوونەتەوە و ئێستاش بڵاودەبێتەوە کە باسی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە گازی ژەهراوی دەکەن. من کۆمەڵێک لە وتارەکانی رۆژنامەکان و گۆڤارەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکام هەیە کە لەو پەیوەندییەدا بڵاوکراونەتەوە

جیهانی شارستانی ناتوانێت تەحەمولی بەکارهێنانی گازی ژەهراوی بکات دژی ئێرانییەکان یا کوردەکان یا هەرکەسێکی دیکە. من خۆشحاڵ بووم کە هەفتەی رابردوو ئەنجوومەنی پیران یاسایەکی پەسەند کرد بۆ پچڕاندنی ٨٠٠ میلیۆن دۆلار کریدیتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە عێراق بە ئامانجی دەربڕینی ناڕەزایەتی لە بەرامبەر بەکارهێنانی گازی ژەهراوی. هەڵمەتێک لە ئەنجومەنی پیران لەلایەن بەڕێز «لانتۆس»، نوێنەری ئەیالەتی کالیفۆرنیا و بەڕێز «پۆرتێر»، نوێنەری ئەیالەتی ئیلینۆیز بۆ ئەم مەبەستە بەڕێوەچوو. دەمەوێت ستایشیان بکەم بۆ کارەکەیان و هیوادارم کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگرێس و تێکڕای کۆنگرێس بە زووترین کات ئەم یاسایە بەرز بکەنەوە و ئێمە پەسەندی بکەین و بینێرین بۆ سەرۆک کۆمار.

لە هەمان کاتدا ستایشی وەزیری دەرەوە، بەڕێز شوولتز دەکەم بۆ ئەو لێدوانە زۆر بەهێزەکەی کە پێنجشەمە یا هەینی رابردوو دای. داواکارم ئەو و سەرۆک کۆمار رەیگان بە دوای ئەو کارەدا بچن لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە رێگای ناردنی تیمێکی پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ عێراق بۆ ئەوەی بە تەواوی دڵنیابن لەوەی کە گازی ژەهراوی دژی چەکدارانی کورد بە کارهاتووە و ئەگەر شتێکی وا سەلمێندرا، داوا لە وەزیری دەرەوە و سەرۆک کۆمار دەکەم کە توندترین هەڵوێستی مومکین لە نەتەوە یەکگرتووەکان بگرنەبەر بۆ دانانی ئابڵۆقەیەکی چەند لایەنە و زۆر کاریگەر دژی عێراق. ئێمە ناچارین ئەوە روون بکەینەوە کە گازی ژەهراوی هیچ جێگایەکی لە جیهانی شارستانیدا نییە و دەوڵەتی عێراق یان هەر دەوڵەتێکی دیکە کە چەکی کیمیایی بەکاردەهێنێت دەبێ چاوەڕوانی دژکردەوەی توند و خێرای جیهانی شارستانی بێت.

## عێراق بە چەکی کیمیایی کورد ژینۆساید دەکات
### ئەنجوومەنی نوێنەران
### ١٣ی ئەیلوولی ١٩٨٨

کۆنگرێسمەن هۆیەر[٢٠٠]:

وتارێک لە ڕۆژنامەی «واشـــنگتۆن پۆست» لە ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٨ لە ژێر ناوی «بەهەڵەدا مەچن، ئەمە ژینۆسایدە« لە لایەن جیم هۆگلەند و وتارێکی دیکە لە ژێر ناوی «کۆمەڵکوژی کورد لە سەر دەستی عێراق ڕابوەســـتێنن» لە ٥ی ئەیلوولی ١٩٨٨ لە نووســـینی ڤیلیام ســـاڤێر لە ڕۆژنامەی «نیۆیـــۆرک تایمز»دا بڵاو بووەتەوە کـــە داوا دەکەم بخرێتە بەردەستی ئەندامانی ئەنجوومەن. هەردوو وتارەکە جێگای متمانەن.

ژینۆساید لەلایەن هێزە چەکدارەکانی سەرۆک کۆماری عێراق، سەدام حوسەین دژی خەڵکی کوردی دانیشتوی باکووری عێراق بەڕێوەدەچێت. ئێمە ناتوانین لە بەرامبەر ئەم کۆمەڵکوژییە کە ئامانجێکی لەپشـــتە بێ هەڵوێســـت بین. بێ هەڵوێستی ئێمە لە ڕابردوودا ڕێگای بۆ ئەوە خۆش کردووە کە دیکتاتۆرە دڵڕەقەکان میلیۆنەها کەس بکوژن و بێ هەڵوێستی لە ئەمڕۆشدا ڕێگا خۆش دەکات بۆ ئەوەی ژمارەیەکی یەکجار زۆری دیکە بکوژرێن. ئاگربەستی شەڕی کەنداو، کۆتایی بە جەنگێک هێنا کە سەدان هەزار کەســـی کردە قوربانی و ئێمە نابێت بهێڵین لەم ئاگربەســـتە وەک هەلێک کەڵکوەربگیردرێت بۆ دەستپێکردنەوەی خوێنڕێژی. بەکارهێنانی سیســـتماتیکی چەکـــی کیمیایی دژی خەڵکی ســـڤیل کەمتر لە مێژوودا ڕوویـــداوە و ئەگـــەر دەمانەوێت لە داهاتوودا بێڕێزییەکی هاوشـــێوە بە مرۆڤایەتی نەکرێت دەبێت بە توندترین شێوە وڵامی بدرێتەوە.

## عێراق کوردەکان کیمیاباران دەکات چونکە نەتەوەیەکی جیاوازن
## ئەنجوومەنی نوێنەران
## ١٣ی ئەیلوولی ١٩٨٨

کۆنگرێسمەن باتز:

سـەرەڕای ئاگربەسـتی ٢٠ی ئابی ١٩٨٨ لە نێـوان ئێران و عێراق، سەرچاوە سیخوڕییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتڕاستیان کردوەتـەوە کە عێراق چەکی کیمیایی دژی کەمینەی کورد بەکارهێناوە. ئەمـە کردەوەیەکـی دڕندانەیە کە ئـاکام و لێکەوتەی جیـدی بەدواوە دەبێت.

بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی ژنێڤ قەدەخە کراوە، چونکە لە شـەڕی یەکەمی جیهانیدا سـەربازەکان بەم چەکانە کوژران و بریندار بوون. پاش ئەوەش هیچ دەوڵەتێک بەم رێژەیە کەڵکی لـەم چەکانە وەرنەگرتووە، بەڵام سـەلمێندراوە کە دەوڵەتی عێراق ئەم چەکانەی وەک ئامرازێک بەکارهیناوە بۆ سـەرکووتی راپەڕینی کەمینەی کورد. تاوانەکان دژ بەم سـێ میلیۆن و نیو کەسـە کـە بۆ ئۆتۆنۆمی خەبات دەکەن وەبیرهێنەری ئەو کردەوە ترسناکانەیە کە جیهان لە کاتی هۆلۆکاسـتی جوولەکەکاندا بینی. ئێمە نابێت رێگە بدەین جارێکی دیکە دەوڵەتێک هەوڵ بدات بۆ لەناوبردنی فیزیکیی گرووپێک مرۆڤ. هەربۆیە من بڕیارنامەیەکەم لە کۆنگرێس بە ناوی بڕیاری ٥٣٢٠ ئامادەکردووە کە نیگەرانی دەردەبڕێت بەنیسـبەت بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن دەوڵەتـی عێراق دژی کورد و داوا لە عێراق دەکات بەزووترین کات و بۆ هەمیشە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی رابگرێت.

نەتـەوەی کورد گرووپێکی جیاوازی ئەتنیکی ٢٠ میلیۆن کەسـیيە. دامەزرانـی کۆمـاری تورکیا لە سـاڵی ١٩٢٢ کۆتایی بـە هیوای کورد بـۆ دامەزرانی وڵاتێکی سـەربەخۆ بە ناوی کوردسـتان هێنا و ئێسـتا کـوردەکان لە تورکیا و ئێران، عێراق، سـووریا، یەکێتی سـۆڤیەت و

لوبنان نیشتەجێن. لە ئاکامی هێرشی کیمیاییدا ١٠٠هەزار کوردی عێراق ئەم دواییانــە هەڵاتوون بۆ تورکیا. بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن عێــراق دژی خەڵکی کورد، تاوانی ژینۆســایدە و پێشــێلکردنی تەواوی یاسای نێونەتەوەییە. داوا لە هاوکارانم دەکەم پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە بکەن.

## ئەنجومەنی نوێنەران نەیهێشت گوشار بخرێتە سەر عێراق بۆ ئەوەی کوردەکان کیمیاباران نەکات

**ئەنجومەنی پیران**

**١٤ی ئەیلوولی ١٩٨٨**

سناتۆر میشێل: جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، من دەمەوێت جارێکی دیکە کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی شەرمەزار بکەم. عێراق لە ئەنجامــی بەکارهێنانی چەکــی کیمیایی درێژە بە پێشــێلکردنی هەمەلایەنەی یاســای نێونەتەوەیی و پرەنســیپە بنەڕەتیەکانی مافی مرۆڤ دەدات.

لە ٢٤ی حوزەیــران، ئەنجومەنی پیران بە تێکڕا ڕوانگەکانی خۆی ســەبارەت بە پێشــێلکرانی مافی مرۆڤ لەلایــەن عێراقەوە دەربڕی. ئەنجومەنی پیران بە پەسەندکردنی بڕیارنامەی ٤٠٨ کە من پێشنیارم کردبــوو، بە تێکڕای دەنــگ کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی شــەرمەزار کرد و پێداگری لە ســەر ئیدارەی ئەمریکا کرد لە ڕێگای دیپلۆماتیکەوە گوشار بخاتە سەر عێراق بۆ ئەوەی پێش لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە داهاتــودا بگرێت. ئەو بڕیارنامەیە دوابەدوای ئەوە پەسەند کرا کە جیهان بەڵگە و شەواهیدەکانی ئەوەی بە چاوی خۆی بینی کە عێراق گازی موســتارد و گازی دەماری دژی خەڵکی سڤیلی کورد لە شاری هەڵەبجە کە ئێران داگیری کردبوو، بەکارهێناوە.

هێرشـــەکەی ئادار کە لە ئەنجامیدا هەزاران کەس کوژران، بەشـــێک بوو لە نمونـــە بەرفراوانترەکانی بەکارهێنانی چەکـــی کیمیایی (لەلایەن عێراقەوە) کە لەمێژبوو (لەلایەن کۆمەڵگای نێونەتەوەییەوە) پشـــتگوێ خرابوو. نەتەوە یەکگرتوەکان لە ١٩٨٤، ١٩٨٦ و دیسان لە ١٩٨٧ بەو ئەنجامە گەیشت کە عێراق چەکی کیمیایی دژی ئێران بەکارهێناوە، بەڵام کۆمەڵگای نێونەتەوەیی هیچی نەکرد.

ئاکام و ئەنجامەکانی کیمیابارانی هەڵەبجە کە بە کامیرا تۆمارکرابوو پێشـــی لەوە گرت کە کردەوە دڵڕەقانەکانی عێراق پشتگوێ بخرێت. ئەو بەڵگانـــە کە نکوڵیان لێنەدەکرا کۆمەڵـــەی گەلانی ناچار کرد بکەونە جموجـــۆڵ. جێـــگای داخ و پەژارەیە کە تورەیـــی ئەنجومەنی پیران لەو کردەوەیـــەی عێراق بەرفـــراوان نەبووەوە، چونکـــە ئەنجومەنی نوێنەران ئـــەو دەرفەتەی لەباربرد بـــۆ ئەوەی گوشـــارێکی نێونەتەوەیی کاریگەر بخرێتەســـەر عێراق. لە کاتێکدا کە بەرپرســـیارێتی کۆمەڵکوژی خەڵکی ســـڤیلی بێ گوناە تەنها و تەنها لە ئەســـتۆی عێراقە، بەڵام کۆمەڵگای نێونەتەوەییش نەیتوانی بە شێوەیەکی بەهێز کار بکات بۆ ئەوەی عێراق ناچار بکات ئیدی چەکی کیمیایـــی بەکارنەهێنێت. جیهان کردەوەکانی عێراق پشـــتگوێ دەخســـت و تەنها هیوای دەدەبڕی کە شەڕی ئێران و عێراق کۆتاییپێبێت.

ئاگربەســـتی کەنداو دەرفەتی رەخســـاند بۆ عێراق بۆ ئەوەی چەکە کۆمەڵکوژەکانـــی دژی هاووڵاتیانی خـــۆی بەکاربێنێت. هێزەکانی رژێمی عێراق لە هەڵمەتی جینۆسایدی کوردەکانی عێراق کە ٣ ملیۆن کەسن، بە هەزاران کوردیان کوشت و ٥٠ هەزار تا ١٠٠ هەزار کوردیان ناچار کرد لـــە وڵاتی خۆیان رابکەن. کوا تورەیـــی و ناڕەزایەتیدەربڕینی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی؟ کوا ئیرادە و خواست بۆ کارکردن دژی ئەم کۆمەڵکوژییە؟ بڕیارنامەکەی ئەنجومەنی پیران کۆتایی بە ســـەرجەم کریدیت و گارانتی کریدیتەکانـــی ئەمریکا بە عێراق دەهێنا و داوای لە ئەمریکا دەکرد دژ بە بەخشـــینی قەرز لەلایەن رێکخراوە بازرگانییەکانی جیهان بە عێراق دەنگ

بدات و هەناردەکردنی نەوتی عێراقی قەدەخە دەکرد. ئەو ئابلۆقانە تەنها کاتێـــک لادەبردرا کە عێراق کۆتایی بـــە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و شاڵاوەکەی بۆ ژینۆسایدی کوردەکان هێنابایا.

بە خۆشـــییەوە ســـەرۆک کۆمار رەیگان هێرشەکەی هەڵەبجەی وەک پێشـــێلکردنی تایبەت و یەکلاییکەرەوەی یاسای نێونەتەوەیی شەرمەزار کرد و شولتز، وەزیری دەرەوە هێرشە کیمیاییەکانی ئەم دوایەی عێراقی وەک کردەوەیەکی پاســـاوهەڵنەگر و بێزلێکراو ناوزەد کرد و بە دەوڵەتی عێراقی وت کە بەردەوامبوونی ئەو هێرشـــانە خەسار لە پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراق دەدات. ئێستا کاتی ئەوەیە ئەو قسانە بکرێت بە بەڵگە، کاتی ئەوەیە کە هەڵمەتێکی نێونەتەوەیی بەرێبخرێت بۆ سەرزەنشتکردنی عێـــراق، کاتی ئەوەیە کە دەوڵەتەکان رێوشـــوێنی یاســـایی و ئەخلاقی بگرنەبەر دژی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی.

من پشتیوانی لە هەوڵەکانی دەوڵەتی ئەمریکا دەکەم بۆ راوەستاندنی بەکارهێنانـــی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراقـــەوە، بەڵام تەنها دەرکردنی راگەیاندنامە بەس نییە. پێش هەموو شتێک کەس گوێ لەو راگەیاندنامەیە ناگرێت. لەمێژبوو دەوڵەتی عێراق نکوڵی لە کیمیابارانکردنی هێزەکانی ئێران دەکرد و ئێســـتاش نکوڵی لە بەکارهێنانـــی چەکی کیمیایی دژی کـــوردەکان دەکات ســـەرەرای ئەوەی کە شـــەپۆلی ئـــاوارە کوردەکان شایەتییانداوە و ئاسەوارەکانی چەکی کیمیاییان بە سەر لاشەی خۆیانەوە نیشـــانداوە و ســـەرەرای بوونی ئەو بەڵگانە کە قەناعەتی بە وەزارەتی دەرەوەی خۆمان هێناوە کە عێراق ئەو کارەی کردووە.

جگە لەوەش تەنها سیاســـەتی دەرکردنـــی راگەیاندننامە نابێت بە سزادانی عێراق بەهۆی ئەوەی هەزاران خەڵکی سڤیلی بەو چەکانە کوشتتوە کە لەمێژە رێکەوتننامە نێونەتەوەیەکان قەدەخەیان کردووە. ئەنجومەنی پیـــران داوای لـــە دەوڵەتی ئەمریکا کرد ئەو مەســـەلەیە لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان بخاتەروو و داوا بکات رێوشوینی کاریگەر دژی عێراق بگیردرێتەبەر. مەســـەلەیەکی ئەوەنـــدە گرنگ کە بووەتە

مایەی نیگەرانی کۆمەڵگای نێونەتەویـــی دەبێ لە نەتەوە یەکگرتوەکان بخرێتـــەڕوو. لانیکەم دەبێ ئەو تاوانە (وەک ژینۆســـاید) ناوزەد بکرێت و عێراق بەرپرسیارەتییەکەی وەئەستۆ بگرێت.

هیوادارم ســـەرۆک کۆماری ئێســـتا و داهاتووی ئەمریکا و سەرجەم رێبەرانـــی وڵاتان بە زووتریـــن کات لەپێنـــاو کەڵکوەرنەگرتن لە چەکی کیمیایی پێکەوە وتووێژ بکەن. ئەنجامدانی کردەوەی خێرا لەو پەیوەندییەدا هیچکاتێک بە قەد ئێســـتا پێویســـت و روون نەبووە، چونکە وێنەی ئەو خەڵکە ســـڤیلە بێ گوناهە کە بەدەستی دەوڵەتی خۆیانەوە کیمیاباران کراون، هاوار دەکات چی کارەساتێک روویداوە.

**دیواری بێدەنگی چارەنووسی کوردە کیمیابارانکراوەکانی تەنیوە**

**ئەنجومەنی پیران**

**٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٨**

سناتۆر گۆر: جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، دیواری بێدەنگی چارەنووسی ئەو چەند هـــەزار کوردەی تەنیوە کە بەدەســـتی هێـــزە چەکدارەکانی عێراق گیریـــان خواردوە و ئەوانەی کە ئـــاوارەی تورکیە بوونە. هەموو ئانوســـاتێک ئەگەری ئەوە لە ئارادایە کـــە کولتووری کورد لەو ناوچەیە بەهـــۆی بڵاوەپێکردنی خەڵک قەلاچۆ بکرێت، چونکـــە دەوڵەتی عێراق چەکی کیمیایی بۆ ســـەپاندنی ڕێگاچارەی کۆتایی بەســـەر کوردەکاندا بەکاردێنێت.

لە ڕاستیدا هیچ شک و گومانێک لەوەدا نییە کە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکارهێنراوە کەوابوو پرسیارەکە ئەوە نیە کە چەکی کیمیایی بەکارهاتووە یان نا بەڵکوو ئەوەیە کە ئاماری کوژراوەکان سەدان کەسە یان هەزاران کەس یان دەیان هەزار کەس؟ شارســـتانییەت کە هەمیشە لـــە عێراقدا لاواز بووە ئێســـتا بـــە تەواوی بـــەرەو لەناوچوون دەچێت. خەمخۆریەکانی ئەو دەوڵەتە درۆیە و فرمێسکی تیمساح ڕشتنە.

چاوەڕوان دەکرێـــت عێراق لەو ڕەفتارانە دووربکەوێتەوە، چونکە ئەو وڵاتە بەســـەر ئێراندا ســـەرکەوتووە، چونکە پارەی نەوتی هەیە، چونکە دەبێ کاری زۆر بکرێت بۆ بووژاندنەوەی ئابووری عێراق و ئاوادانکردنەوەی ئاسەوارەکانی شـــەڕ لە عێراق و تەیارکردنی هیزە چەکدارەکانی. عێراق پێشتر بێ هیچ ســـزادانێک چەکی کیمیایی بەکارهێناوە بۆ تێکشکاندنی ورەی سوپای ئێران و خەڵکی سڤیل. دەوڵەتی ئەمریکا عێراقی شەرمەزار کردووە، بەڵام هەنگاوەکانی دواتری ئەمریکا لەو پەیوەندیەدا دیار نین.

هەمومـــان دژی بەکارهێنانـــی چەکی کیمیایین لەلایـــەن عێراقەوە.

خۆشـــبەختانە کۆنگرێس لەمێژە هەوڵ بۆ ئەوە دەدات ئابلۆقە بەســـەر عێراقدا بسەپێنێت. لەوانەیە پاشان ئیدارەی ئەمریکا بە دژایەتیکردنەکەی لەگەڵ گەلالە یاســـاکانی کۆنگرێسدا بچێتەوە. من رێزم بۆ ئەو خواستەی ئیدارەی ئەمریکا هەیە کە دەیەوێت لەرێگای دیپلۆماسی و تەشویقکردنی عێراق لەپێناو ئـــەو ئامانجەدا کار بکات بـــەڵام پێموایە کە نەرمونیانی نواندن لەم بارودۆخەدا ئەنجامێکی ئەوتۆی نابێت و ئێمە تا ئێســـتا زۆر بە سەبرەوە ئەو رەفتارەی عێراقمان تەحەمول کردووە.

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، بە بروای من ئەگەر رێگە بەوە بدەین ئەم بابەتە پشـــتگوێ بخرێت دەوڵەتەکان هـــان دەدرێن چەکی کیمیایی وەدەســـتبخەن یان بەکاریبێنن چونکە پێیانوایە کە بە هەمان شێوە هیچ شـــتێک دژی دەوڵەتی عێراق نەکـــراوە هیچیش دژی ئەوان ناکرێت. ئەم بارودۆخە تاقیکردنەوەیەکی گرنگی خواســـت و ئیرادە و توانایی وڵاتانە بـــۆ ئەوەی ئەرکی خۆیان جێبەجێ بکەن و ئەوەش تەنها پەیوەندی بە مەسەلەی ئەخلاقەوە نییە، بەڵکوو پەیوەندیشی بە مەسەلەی ئاسایشی هاوبەشی هەموو ئەو وڵاتانەوە هەیە.

## بەرژەوەندی بازرگانی ناهێڵێت ئابلۆقە بسەپێندرێت بەسەر عێراقدا

ئەنجومەنی پیران

١٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٨

سناتۆر پێڵ: جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، کاتێک رژێمێک بە شێوەیەکی زۆر قێـزەون تاوان ئەنجـام دەدات کۆمەڵگای جیهانی بە شـێوەیەکی بەرفراوان باسی دەکات و شەرمەزاری دەکات. بەکارهێنانی گازی کیمیایی دژی کوردەکانی هاوولاتی خۆی لەلایەن عێراقەوە تاوانێکی وەهایە. بەلام گۆرینی ئاراسـتەی هەستی تۆرەیی و نارەزایەتی خۆمان بەرەولای کاری بەکردەوە دژوارتر بووە. لە ٩ی ئەیلوول ئەنجومەنی پیران گەلالەیاسایەکی پەسـەند کرد بۆ ئەوەی ئابلۆقەیەکی چروپر بەسەر عێراقدا بسەپێنێت و ئەوە یەکەم جار بوو لە ماوەی دەیان سـالی رابردوودا کە ئەنجومەنی پیران داوای ئابلۆقەدانی ولاتێکی دەکرد.

دوێنی ئەنجومەنی پیران بۆ جاری سـێیەم دەنگیدا بە سـەپاندنی ئابلۆقە بەسەر عێراقدا. بەهەرحاڵ ئەمجارە ئابلۆقەکان بە هۆی گوشاری تونـدی ئەنجومەنی نوێنـەران و بەرژەوەندیەکانـی کۆمەڵێکی زۆر لە بازرگانانی ئەمریکا لەباربرا. زۆر بەداخەوە گەلالەیاسـاکەی ئابلۆقەکان لاواز کرا بەلام بەبۆ چوونی من گەلالەیاسـاکەی دوێنێ کاریگەری خۆی هەیە و دەبێتەهۆی ئـەوەی عێراق و ولاتانی دیکە جارێکی دیکە بیر لە چەکی کیمیایی نەکەنەوە.

ئەمرۆ بیسـتمان کە وەزارەتـی دەرەوە تەنانـەت دژی ئەم گەلالە یاسـایەیە بۆ سەپاندنی کۆمەڵێک ئابلۆقەی سەرەتایی بەسەر عێراقدا. لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوەبێت کە باوەریان بە قسەکەی وەزیری دەرەوەی عێـراق، تاریق عەزیز کردووە کە بەڵێنی بە شـولتز، وەزیری دەرەوەی ئەمریـکا داوە کە عێراق چەکی کیمیایـی بەکارناهێنێت. بەداخەوە ئەم بەڵێنەی عێراق لەگەڵ ئەو بانگەشەیەشـدا هاوکات بوو کە عێراق چەکی

کیمیایی دژی کوردەکان بەکارنەهێناوە، لەکاتێکدا کە ئەوە راســـت نییە.
ئایا ئێمە بەڕاستی چاوەروانی ئەوە دەکەین کە کیمیابارانکردنی هەزاران کەس پشـــتگوێ بخرێت لەســـەر بنەمـــای دڵنیاییدانەوەیەکی عێراق کە راستیش نیە و درۆیە.

من وەک کارمەندێکی پێشـــووی وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ ئەو حەز و خولیایەی وەزارەتی دەرەوەدام بۆ ئەوەی پەیوەندی باشمان لەگەڵ عێراقدا هەبێـــت. عێراق وڵاتیکی دەوڵەمەندە و لە رووی ئیســـتراتژیەوە وڵاتیکی گرنگە و کاری زۆر کراوە بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانی ئەمریکا و عێراق نوێ بکرێتەوە. بەڵام بەهەرحاڵ هەندێ کردەوە هەیە کە لە دەرەوەی بازنەی وڵاتە شارســـتانیەکاندایە. ئەگەر ئێمە ئامادەنەبین (بە رێگای سیاســـی) وەڵامی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی بدەینەوە، ئایا ئامادەین بە کردەوە وەڵامی بدەینەوە ؟

جیـــم هۆگلاند ســـتونێکی زۆر جوانی دەربارەی ئەو مەســـەلەیە لە ژمارەی ئەمڕۆی رۆژنامەی «واشـــینگتۆن پۆســـت» دا نووسیوە لە ژێر ناوی «پشـــوویەک بۆ عێراق». هۆگلاند لە کۆتایی قســـەکانیدا دەڵێت ســـەرۆک کۆمار رەیگان نابێت ئابلۆقەکان لە ســـەر عێراق ڤیتۆ بکات و ببێت بە لایەنێک کە دژی بەرپەرچدانەوەی شەیتانە.

مـــن لە ناخی دڵەوە لەگەڵ ئەم هەســـتەدام و ســـەرنجی هاوکارانم بەرەولای ئەم وتارەی جیم هۆگلاند رادەکێشم.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، داوا دەکەم ئەم وتارە بخرێتەبەر دەستی هاوکارانم.

# گەلاڵە یاسای ٥٥٥٠ بۆ سەپاندنی ئابلۆقە بەسەر عێراقدا
# ئەنجومەنی نوێنەران
# ٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٨

کۆنگرێسمەن فاسێل[٢٠١]: جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، داوا دەکەم کارە ئاسـاییەکانی ئەنجومەن رابگیردرێت و دەنگ بدرێت بە گەلاڵەیاسـای ٥٥٥٠ بـۆ ئابلۆقەدانی عێراق بەهـۆی کەڵکوەرگرتن لە چەکی کیمیایی کە بەشـێکە لە یاسـای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزمـی نێونەتەوەیی و رەچاوکردنی ئاسایشی نەتەوەیی و بەرژەوەندیەکانی سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا. ئەمە دەقی گەلاڵەیاساکەیە:

## گەلاڵەیاسای ٥٥٥٠

ناوی ئەم گەلاڵەیاسایە بریتییە لە «چاکسازی لە یاسای دژە تیرۆریزم و ئاسایشی نەتەوەیی ١٩٩٨ بۆ ئابلۆقەدانی عێراق بە هۆی ئەوەی چەکی کیمیایی بەکارهێناوە».

بڕگەی ٢٠٢: ئەنجامەکان و ئامانجەکانی ئەم گەلاڵە یاسایە:

الف- ئەنجامەکان

ئەنجومەنـی پیـران و ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریـکا بەو ئەنجامە گەیشتوون کە:

١- خەڵکـی کورد گروپێکی جیـاوازی ئەتنیکی ٢٠ ملیۆن کەسـی پێکدەهێنن و مێژوویەکی کـۆن و کەونارایان هەیە و میراتێکی کولتوری دەوڵەمەندیان هەیە.

٢- سێ تا چوار ملیۆن کورد هاووڵاتی عێراقن و لە باکوری ئەو وڵاتە

دەژین.

٣- سوپای عێراق شاڵاوێکی سەربازی دژی ناوچە کوردنشینەکانی عێراق ئەنجامداوە و گوندە کوردنشینەکانی باکوری عێراقی کاولکردووە.

٤- کۆمەڵێک بەڵگەی بەرچاو لەبەردەستدایە کە نیشان دەدات سوپای عێراق چەکی کیمیایی دژی پێشمەرگە کوردەکان و خەڵکی سڤیلی بێ چەکی کورد بەکارهێناوە.

٥- بەم کردەوانە و کردەوەکانی دیکە دژی کوردەکان، عێراق ئەرکە نێونەتەوەیەکانی خۆی سەبارەت بە مافی مرۆڤ پێشێلکردووە.

٦- دەیان هەزار لەو کوردانە کە لە شاڵاوەکانی عێراق رزگاریان بووە پەنایان بردوەتە تورکیا.

٧- چەند تیمێکی نەتەوە یەکگرتوەکان ئەوەیان پشتڕاست کردوەتەوە کە عێراق لە کاتی شەڕ لەگەڵ ئێراندا چەکی کیمیایی بەکارهێناوە.

٨- بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراقەوە پێشێلکردنی یەکلاییکەرەوەی یاسای نێونەتەوەییە.

ب- ئامانجەکان:

ئامانجی ئەم بڕیارنامەیە ئەوەیە کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کۆمەڵێک ئابلۆقە بخاتەسەر عێراق، چونکە یاسای نێونەتەوەیی پێشێل کردووە و چەکی کیمیایی بەکارهێناوە.

ج- سەپاندنی ئابلۆقە سەرەتاییەکان بەسەر عێراقدا:

١- دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نابێت هیچ جۆرە چەک و تەقەمەنیەک بفرۆشێت بە عێراق.

٢- نابێت مۆڵەت بۆ ئەوە دەربکرێت کە هیچ جۆرە تەقەمەنییەکی ئەمریکایی هەناردەی عێراق بکرێت.

٣- دەسەڵاتەکانی برگەی ٦ی یاسای هەناردەکردنی ١٩٧٩ بەکارببردرێت بۆ ئەوەی هەناردەکردنی هەرچەشنە کاڵا یا تەکنولۆژییەک بۆ عێراق

قەدەخە بکرێت کە برگەی ١ی بەشی ٥ی ئەو یاسایە دەگرێتەوە.

٤- نابێـــت مۆڵـــەت بۆ ئەوە دەربکرێت کە هیچ چەشـــنە ماددەێکی کیمیایی هەناردەی عێراق بکرێت کە ســـەرۆک کۆماری ئەمریکا پێیوابێت عێراق دەتوانێت بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی بەکاریبێنێت.

٥- ویلایەتـــە یەککگرتوەکانـــی ئەمریکا دەبێ دژی ئەوە رابوەســـتێت کـــە قەرز یان یارمەتی مادی یان یارمەتـــی تەکنیکی لەلایەن رێکخراوە ئابورییەکانی جیهانەوە بدرێت بە عێراق بەگوێرەی بەشـــی ٧٠١ی یاسای چالاکی رێکخراوە ئابورییەکانی جیهانەوە

٦- ئـــەم شـــەرتومەرجانە لـــە رۆژی یەکەمـــی پەســـەندکرانی ئەم گەڵاڵەیاسەیە کاری پێدەکرێت.

## برگەی ٢٠٥: مەرجەکانی سڕینەوەی ئابلۆقەکان:

ئەلف- رێزگرتنی عێراق لە یاسا نێونەتەوەییەکان

تا ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨ سەرۆک کۆماری ئەمریکا پاش راوێژ لەگەڵ کۆنگرێس دەبێ ئابلۆقەی گونجاوی زیاتر بەسەر عێراقدا بسەپێنێت. مەرجی نەســـەپاندنی ئابلۆقەی زیاتر بە سەر عێراقدا ئەوەیە کە سەرۆک کۆمار پشتڕاستی بکاتەوە و بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران و سەرۆکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران بنووسێت کە:

١- دەوڵەتـــی عێـــراق چەکـــی کیمیایـــی بەکارناهێنێـــت و یاســـا نێونەتەوەییەکان پێشـــێل ناکات، لەوانـــە پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی ژنێڤ (لە بـــارەی قەدەخەبوونی کەڵکوەرگرتن لە چەکی کیمیایی لە شـــەڕدا) و مـــادەی ٣ی کۆنڤانســـیۆنەکانی ١٩٤٩ی ژنێڤ (لـــە بارەی پاراســـتنی قوربانیانی شەڕ).

٢- دەوڵەتـــی عێراق گارانتی جێـــگای متمانەی داوە کە ئیدی چەکی کیمیایی بەکارناهێنێت و یاسای نێونەتەوەیی پێشێل ناکات.

٣- دەوڵەتی عێراق دەیەوێت رێگا بەوە بدات کە پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان یان پشـــکنەرە بێلایەنە نێونەتەوەیەکانی دیکە سەردانی ئەو وڵاتە بکەن.

ب- رێزگرتنـــی دەوڵەتی عێـــراق لە مافی مـــرۆڤ، بەتایبەت مافی کەمینەی کورد

تا ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨ سەرۆک کۆماری ئەمریکا بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران و ســـەرۆکی کۆمیتـــەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران بنووســـێت کـــە دەوڵەتی عێراق رێـــز لە جارنامەی نێونەتەوەیـــی مافی مرۆڤ، بەتایبەت مافی کەمینەی کورد دەگرێت. ئەم نووســـراوەیەی ســـەرۆک کۆمار دەبێ راپۆرتێکی لەگەڵدا بێت کە تێیدا ئاماژە بەم وردەکاریانە کرابێت:

١- ســـەرجەم زانیارییەکان لە بارەی ئەوە کە عێراق رێز لە جارنامەی نێونەتەوەیی مافی مرۆڤ دەگرێت.

٢- راپۆرتێکی ورد لە بارەی شـــێوەی هەڵســـوکەوتی عێراق لەگەڵ کەمینـــەی کـــورد، لەوانە وردەکارییەکانی کوشـــتنی خەڵکی ســـڤیل و چۆڵکردنی ناوچە کوردنشینەکان.

٣- هەڵســـەنگاندێک لە بارەی ئـــەوەی کە ئایا عێـــراق لە بەرامبەر پێشێلکرانی جارنامەی نێونەتەوەیی مافی مرۆڤ بەرپرسیارە یان نا؟

٤- راپۆرتێک لە بارەی ئـــەو هەنگاوانە کە ویلایەیەتە یەکگرتوەکانی ئەمریـــکا هەڵیگرتـــوە بۆ ئەوەی دەوڵەتی عێراق تەشـــویق بکات رێز لە جارنامەی نێونەتەوەیی مافی مرۆڤ بگرێت.

٥ راپۆرتێـــک لە بارەی ئەو هەنگاوانە کـــە ویلایەیەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەڵیگرتوە بۆ ئەوەی پێش لەوە بگرێت کە دەوڵەتی عێراق مافی مرۆڤ، بەتایبەت مافی کەمینەی کورد پێشێل بکات.

## بڕگەی ٢٠٦: کردەوەکانی دەوڵەتی تورکیە

١- کۆنگرێس داوا لە دەوڵەتی تورکیە دەکات لەگەڵ پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان یان پشکنەرانی دیکە هاوکاری بکات کە لە بارەی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی لێکۆڵینەوە دەکەن.

٢- ستایشی دەوڵەتی تورکیا دەکات بە هۆی بڕیارە مرۆڤدۆسانەکەی بۆ وەرگرتنی هەزاران ئاوارەی کورد کە لە عێراق هەڵاتوون.

## بڕگەی ٢٠٧: کردەوە چەندلایەنەکان

ئەلف- کردەوەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان:

کۆنگرێس داوا لە سەرۆک کۆماری ئەمریکا دەکات ئەو مەسەلەیە بخاتەبەردەستی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ ئەوەی مەسەلەی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی هاوولاتیانی خۆی کە زۆربەیان خەڵکی سڤیلی بێ گوناهن، لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان تاوتوێ بکرێت.

٢- داوا بکات بە گوێرەی بڕیارنامەی ٦٢٠ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان، ڕێوشوێنی گونجاو و کاریگەر دژی عێراق بگیردرێتەبەر بەهۆی ئەوەی بەردەوام چەکی کیمیایی بەکارهێناوە.

ب- کردەوە چەند لایەنەکانی دیکە:

١- کۆنگرێس داوا لە سەرۆک کۆماری ئەمریکا دەکات بۆ وەدەستهێنانی هاوکاری هەموو لایەنەکان هەوڵ بدات بۆ ئەوەی ئابڵۆقە بسەپێندرێت بەسەر عێراقدا و گوشار بخرێتە سەر عێراق بۆ ئەوەی کۆتایی بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بهێنێت.

٢- کۆنگرێس هەروەها داوا لە سەرۆک کۆماری ئەمریکا دەکات بۆ وەدەستهێنانی هاوکاری هەموو لایەنەکان هەوڵ بدات بۆ ئەوی عێراق مافی کەمینەی کورد لەعێراق بەفەرمی بناسێت.

٣- کۆنگرێس هەست دەکات کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەبێ

بەشـــداری لە هەوڵە چەند لایەنەکان بکات و هاوکاری لەگەڵ ئەو هەولانە بـــکات بۆ ئەوەی یارمەتی ئەو ئاوارە کوردانە بدرێت کە پێویســـتیان بە دەواودەرمان و یارمەتیە مرۆڤدۆستەکانی دیکە هەیە.

## برگەی ٢٠٨: هەناردەکردنی کالا تایبەتەکانی ئەمریکا بۆ عێراق

سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەوەیە کە هەناردەکردنی ئـــەو کالا و تەکنۆلۆژییـــە بۆ عێـــراق قەدەخە بکات کـــە یارمەتی بە بەهێزبوونی توانایی ســـەربازی عێراق دەدات. ســـەرۆک کۆمار دەبێ بە گوێرەی برگەی ٦ی یاســـای هەناردەکردنی ١٩٧٩ هەناردنی هەرچەشنە کالا یـــان تەکنۆلۆژیەک بۆ عێراق قەدەخە بکات کە نرخەکەی زیاتر لە ٥٠ ملیۆن دولارە.

برگەی ٢٠٩: بەرواری کارپێکردن بەم گەلالەیاسایە: مەرجەکانی ئەم گەلالەیاسایە تا ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٩١ جێبەجێ دەکرێت.

## کوردە ئەنفالکراوەکان لە بارودۆخێکی نالەباردا دەژین

**ئەنجوومەنی نوێنەران**

**٢٨ی حوزەیرانی ١٩٩٠**

کۆنگرێسمەن جان ئێدوارد پۆرتێر:

ئێـــش و ژانی ئاوارە کوردەکان لە تورکیا هەروا بەردەوامە. ئەوە دوو ســالّە ٧٠هەزار کورد لە ترســی چەکە کیمیاییەکانی ســەدام حوسەین هەڵاتــوون و بەداخەوە رەفتاری تورکیــاش لەگەڵیان لە رەفتاری عێراق زۆر باشــتر نییــە. راپۆرتە هەواڵیەکان نیشــان دەدەن کــە بارودۆخی ئوردوگای ئاوارە کوردەکان خراپە، پێداویســتییە سەرەکییەکانیان دابین ناکرێت، هەلی کارکردن بۆ کوردەکان نییە، گۆشــەگیر کراون و بە هۆی ئەوەی کاربەدەســتانی تورکیا مافی پەنابەریان نەداوە بە کوردەکان، لە بارودۆخێکی زۆر نالەباردا دەژین.

هەوڵـــە نێونەتەوەییەکان بۆ دروســتکردنی خانوو بــۆ ئاوارەکان لە لایەن تورکیاوە رەت کراوەتەوە. وادیارە ئۆزال، سەرۆک کۆماری تورکیە دەیەوێــت کوردەکان بگەڕێنەوە بۆ عێراق. ئەگەر شــتێکی وا روو بدات بێگومان لەگەڵ ئازار و ئەزیەتی زۆرتر رووبەڕوو دەبنەوە.

ئاوارەکان لە تورکیا دەبێ دەستیان بگات بە رێکخراوە نێونەتەوەییەکانی ئاوارەکان و بە شێوازی گونجاو بپارێزرێن. هەروەها ئێمە دەبێت پێداگری بکەین لە ســەر ئەوەی عێراق، ئێران و تورکیــا بە تەواوی رێز لە مافی هاووڵاتییە کوردەکانیان بگرن.

## هەڵسوكەوتی توركیە لەگەڵ كوردە ئەنفالكراوەكان شەرمەزار دەكەین
## ئەنجوومەنی پیران
## ١٢ی تەموزی ١٩٩٠

سناتۆر دیكۆنیسنی[٢٠٢]:

من دەمەوێت نیگەرانی خۆم دەرببڕم سەبارەت بە ڕەفتاری توركیا لەگەڵ ٣٠هەزار كوردی ئاوارەی عێراق كە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی توركیا دەژین. ئەم خەڵكە چارەڕشە پێشتر لە سەر دەستی سەدام حوسەین ئێش و ئازاری زۆریان بینیوە. سەدام كیمیابارانی كردوون، كوشتوونی و ئەوانەی كە لە كاولكردنی گوندەكان و خانووەكان ڕزگاریان بووە، دوورخستووەتەوە. بە هۆی ئەوەی لەلایەن میدیاكانەوە سەرنجی كەمی پێدراوە، كەمتر كەسێك لە دەرەوەی كۆمەڵگای كوردستان دەزانێت لەم ناوچە دەستپێڕانەگەیشتووەدا چی ڕوو دەدات. بە داخەوە ئەم ڕەفتارە درێژە بەردەوامە (كە سووكایەتییە بە هەموو مرۆڤایەتی) چونكە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و دەوڵەتانی دیكەی ڕۆژئاوا ناتوانن گوشار بخەنە سەر ڕژێمی سەرەڕۆی عێراق.

پاش ئەوەی هەزاران كورد بە دەستی سەربازەكانی عێراق بە كۆمەڵ كوژران، هەزاران كەس هەڵاتن و پەنایان بۆ توركیا برد، بەڵام بەهەرحاڵ لە توركیاش لەگەڵ كۆمەڵێك كێشەی نوێ بەرەوڕوو بوونە، دەوڵەتی توركیا ئەوانی وەك پەنابەر بە فەرمی نەناسی و وەك ڕێبوار ناوزەدی كردن. ئەم ڕەفتارە بووە هۆی ئەوە كە ئاوارەكان لە كۆمەڵێك یارمەتی مرۆڤانە بێبەش بن. ئێستاش پاش سێ ساڵ ئەم ڕێبوارانە لە ئۆردوگاكانی باشووری توركیا نیشتەجێن و دەوڵەتی توركیا درێژە بە هەوڵەكانی دەدات تا وەك نیشتەجێبووی كاتی لە بارودۆخێكی دژواردا بیانهێڵێتەوە.

مانگی ئابی رابردوو من و سناتۆر لوتینبێرگ[٢٠٣] سەردانی یەكێ لەم

ســێ ئۆردوگانەمان کرد کە بەنیســبەت کەمپەکانی دیکە بارودۆخەکەی باشــتر بوو، ٣٠ تا ٤٠ کەس لە شۆقەیەکی ســێ ژووریدا بوون، دۆخی پــاک و خاوێنــی خراپ بوو و ئــاوارەکان نەیاندەتوانی کار بکەن. جگە لەوەش دەوڵەت نەیدەهێشت منداڵە کوردە ئاوارەکان بە شێوازی فەرمی پەروەردە ببینن و ماندوویی و بێ هیوایی بەنیسبەت داهاتوو، کەشوهەوای سەرکووت و بێ دەنگی و بێزاری بە سەریاندا زاڵ کردبوو.

ئەم دواییانە دەوڵەتی تورکیا پەیماننامەکەی خۆی لەگەڵ کۆمیسۆنی باڵای نەتــەوە یەککگرتووەکان بۆ پەنابەران (UNHCR) هەڵوەشــاندەوە کــە بە گوێرەی ئــەوە دەوڵەتی تورکیا دەبوو بە پەناگەی هەمیشــەیی هەزاران ئاوارە. دەوڵەتانی سەرانســەری جیهــان پارەیان تەرخان کرد بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی نیشــتەجێبوونی ئاوارەکان لە لایەن UNHCR و دەوڵەتــی تورکیاوە. کۆنگرێس ٥٠ میلیۆن دولاری بۆ ئەم مەبەســتە تەرخــان کرد و وەزارەتی دەرەوە دەورێکی گرینگ و جێگای ستایشــی بینی لە دابینکردنی هاوکاری دەوڵەتانی دیکە لەم بوارەدا.

زێدەبــاری هەڵوەشــاندنەوەی پرۆژەکە کە هیچ پاســاوێکی فەرمی لە پشــتەوە نەبوو، دەوڵەتــی تورکیا هەروەها نەیهێشــتووە یارمەتییە نێونەتەوییەکان بەکارببردرێت بۆ باشــترکردنی بارودۆخی ئۆردوگاکان. مەســەلەی لەوە خراپتر ئەوەیە کە لە ســەرەتای ئەمساڵەوە دەوڵەتی تورکیــا هاتووچۆی دیپلۆماتەکانی ویلایەتــە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و کارمەندانی UNHCRی بۆ ئۆردوگاکان سنووردار کردووە.

کاربەدەســتانی تورکیــا دەڵێن کوردەکانی عێراق لــە لێبوردنەکەی ســەدام حوسەین کەڵکوەربگرن و بگەڕێنەوە بۆ عێراق. ئاوارەکان دەڵێن دەوڵەتــی تورکیا یارمەتییە نێونەتەوەییەکان نــادات بە ئۆردوگاکان بۆ ئەوەی ئاوارەکان ناچار بن بگەڕێنەوە بۆ عێراق. گرووپەکانی داکۆکیکاری مافــی مرۆڤ کە ئــاگاداری بارودۆخی ئۆردوگاکانــن، نیگەرانی خۆیان

دەربڕیوە بەنیسبەت گەڕاندنەوەی زۆرەملێی ئاوارەکان بۆ عێراق. ئەگەر ئەم ئاوارانە بگەڕێنەوە بۆ عێراق، مەترسی ئەوە زۆر جیدییە کە تووشی چارەنووسی برا و خوشکەکانیان بن کە کوژراون یان لە ماڵ و زێدی خۆیان دەرکراون.

من مانگی ئابی پێشوو سەردانی تورکیام کرد. تورکیا پشتیوانی بەهێزی ئێمەیە و پەیوەندی و بەرژەوەندی دوولایەنەمان پێکەوە هەیە و دۆستایەتییە لەمێژینەکەمان لە گەڵ ئەوان بەرز دەنرخێنم. بە درێژایی سەدەکان تورکیا (هەروەک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) پەناگایەکی ئەمین بووە بۆ میلیۆنەها ئاوارە. لە راستیدا ساڵی ١٩٩٢ دەبێت بە پانسەدەمین ساڵیادی پێکهاتنی کۆمەڵگای جوولەکەکان لە تورکیا کە لە دەستی ئازار و ئەزیەتی ئایینی لە ئیسپانیا هەڵاتبوون. بەڵام دەوڵەتی تورکیا لە بەرامبەر هەر شتێکدا کە پەیوەندی بە کوردەکانی دانیشتووی باشووری رۆژهەڵاتی ئەو وڵاتەوە هەبێت، کۆمەڵێک حیسباباتی گرینگی سیاسی و ئاسایشی هەیە.

بەهەرحاڵ کردەوەکانی دەوڵەتی تورکیا بەنیسبەت ئاوارە کوردە عێراقیەکان پیشاندەری جۆرێک هەستیاربوونە کە تەنها ناکۆکیەکانی ناوچە توندتر دەکات. داوا لە دەوڵەتی تورکیا دەکەم بە رەفتاری خۆی لەگەڵ ئاوارەکاندا بچێتەوە و هەرچی لە دەست دێت بیکات بۆ ئەوەی پێشوازی لەم ئاوارانە بکات و بهێڵێت لە ئازادی و هەلەکانی وڵاتی تورکیا چێژ وەربگرن[٢٠٤]

## کوردەکان بە هۆی ئەوە کیمیاباران دەکرێن
## کە داوای مافی خۆیان دەکەن

**ئەنجوومەنی نوێنەران**

**١١ی ئەیلوولی ١٩٩٠**

کۆنگرێسمەن پۆرتێر:

هەمووسمان ئاگاداری ئەو مەترسـیـەیـن کە لە ئەنجامی داگیرکردنی نایاسایی کوێت بەدەستی عێراق بە سەر سەقامگیری ئابووری جیهاندا سەپاوە. بەڵام رژێمی سەرکوتکەری سەدام بە هەمان رێژە هەڕەشەیە بۆ سەر میلیۆنەها کەس کە لە کەنداوی فارس دەژین.

لە کاتی بە دەسەڵاتگەیشتنی سەدام حوسەین لەساڵی ١٩٧٩ەوە، کـوردەکان- کە گەورەترین کەمینەی عێراقن- بە تاوانی ئەوەی کە داوای بە فەرمیناسـینی شوناسی ئەتنیکیی جیاوازی خۆیان دەکەن بە دڕندانەترین شێوە سـەرکوت کراون. لە ماوەی ٥ساڵی رابردوودا سەدان منداڵ- کە دایک و باوکیان چالاکی سیاسی بوونە-دەستگیر و ئەشکەنجە کراون، سەدان هەزار کورد لە شوێنەکانی دیکە نیشتەجێ کـراون و بۆ ئەوەی بڵاوە بە کۆمەڵگای کورد بکرێت سـەدان گوند کاول کراون، هەزاران کەس لە ئەنجامی هێرشـی کیمیایی بۆ سـەر خەڵکی سـڤیلی کورد کوژران و هەرچەشـنە دەنگی ناڕەزایەتییەک بەتووندترین شێوە سەرکووت کراوە.

ئێمـە نابێت چاو لە قسـەکانی سـەدام بکەیـن( چونکە هیچ متمانەیەک بە قسەکانی ناکرێت) بەڵکوو دەبێت چاو لە کردەوەکانی بکەین. بە لەبەرچاو گرتنی کارنامەی رەشـی مافی مرۆڤی سـەدام دژی هاووڵاتیانی خۆی، ئەوە ئەرکی ئێمەیە کە ئاسایشی هاووڵاتیانی بیانـی کە لە کوێت بە بارمتە گیراون و هاووڵاتیانی کوێت و وڵاتانی دراوسێ بپارێزین.

# سەدام حوسەین، کورد و ژینۆساید
## ئەنجوومەنی پیران
## ١٧ی ئاداری ١٩٩٢

سناتۆر دۆل[٢٠٥]:

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، ئەم هەفتەیە چوارەمین ساڵیادی یەکێ لە دزێوترین ڕووداوەکانی سـەدەی بیستەمە. لە ١٧-١٨ی ئاداری ١٩٨٨ هێزە چەکدارەکانی سـەدام حوسەین هەزاران ژن، منداڵ و پیرەمێردیان لە شـارۆچکەی هەڵەبجە کوشـت. ئەم کۆمەڵکوژییە بە چەکی کیمیایی ئەنجامـدرا، هەمان چەکی کیمیایی کـە ئەمڕۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بە شوێنیدا دەگرێت لە عێراقدا.

لـەو کاتە قێزەونەی ١٩٨٨ تا ئێسـتا سـەدام و هێزەکانی گاردی کۆماری بەردەوام بە چەکی کیمیایی هێرشیان کردووەتەسەر کوردەکان لـە باکووری عێـراق و خەڵکیان بە کۆمەڵ لەسـێدارەداوە و بە هەموو شێوازێکی وێنانەکراو ئەشکەنجەیانی کردووە.

ئـەم کـردەوە دڕندەیە زۆر جار لـە تەلەفزیۆنەکانـی جیهاندا بڵاو بووەتـەوە، بەڵام ئێمـە بە خێرایی لە بیری دەکەیـن. هەر ئەم مانگە بەرنامەی تەلەفزیۆنی «٦٠ خولەک»[٢٠٦] کە نزیکەی ٦٠ ملیۆن ئەمریکایی سەیری دەکات، دوایین کردەوە دڕندانەکانی هێزەکانی سەدام حوسەینی دژ بـە خەڵکی کورد نیشـاندا. وادیارە سـەربازە عێراقییەکان کردەوە کۆمەڵکوژییەکانـی خۆیان بە کامێرا تۆمار دەکەن تا خەڵات بکرێن. ئەم وێنانە لەگەڵ هەزاران لاپەڕە بەڵگەنامەی دیکە دەستی بەسەردا گیراوە، ئەم وێنانە ترسناک و دڵتەزێنن.

هێشتا لە واشنگتۆن هیچ باسێک نییە بۆ ئەوەی ئەم کردەوە بەردەوامانە بە ژینۆساید بناسرێن، تەنانەت ئێستاش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هێزە ڕۆژئاواییەکان سەرنجی خۆیان لە سەر تەکنۆلۆژیا و کارخانەکانی

بەرھەمهێنانی چەکە کۆمەڵکوژەکانی سەدام چڕ کردووەتەوە نە ئەو خەڵکە کە بوونەتە قوربانی (و لەوانەیە دیسان لە داهاتوویەکی نزیکدا ببنەوە قوربانی) چەکە کۆمەڵکوژەکانی سەدام.

هەفتەی رابردوو راپۆرتە هەواڵییەکان هەڵوێستی لەخۆبایانە و بێباکانەی جێگری سەرۆک وەزیرانی عێراقیان بڵاو کردەوە کە بە نەتەوە یەکگرتووەکانی وتووە سەدام حوسەین دیار دەکات پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ دۆزینەوەی چەکی کۆمەڵکوژ دەتوانن سەردانی کوێ بکەن و سەردانی کوێ نەکەن.

ئێستا کۆمەڵێک گوشار لەلایەن بریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەئارادایە بۆ ئەنجامدانی هەندێ کردەوەی سەربازی دژی عێراق.

## ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجە:
## کوردەکان هاوپەیمانی ئێمەن دژی سەدام حوسەین

**ئەنجوومەنی پیران**

**١٧ی ئاداری ١٩٩٢**

سناتۆر دیکۆنسینی:

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، زۆر پێشتر لەوەی کە کردەوە دڕندانەکانی سەدام بە شێوازێکی بەرفراوان ریسوا بکرێ، رژێمە دەڕندەکەی سەدام شاڵاوێکی بۆ قەڵاچۆکردنی کوردەکانی دانیشتوی باکووری عێراق ئەنجامدا. گوندەکان خاپوور کران، هەزاران کەس کوژران و دەیان هەزار کەس ناچار بوون لە زێدی خۆیان ئاوارە ببن.

ئەمرۆ چوارەمین ساڵیادی کردەوەیەکی دڕندانەیە کە جیهانی هەژاند و تاکتیکی تیرۆری دڕندانەی سەدامی ئاشکرا کرد کە هەموومان باش ئاگادارینی چوار ساڵ پێش دیکتاتۆری عێراق دژی گوندنشینە کوردەکان چەکی کیمیایی بەکارهێنا و هەزاران ژن، پیاو و منداڵی کوشت.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، وێنە زیندووەکانی ئەم کۆمەڵکوژییە هەموو کەسێک دەهەژێنێت، بەتایبەت ئەوانەی کە وێنەی قوربانییەکانیانی سەر شەقامەکان و نێو ماڵەکانیان بینیوە. تەرمی بنەماڵەکان وشک بووە و کەوتووەتە سەریەک و سەرەڕای ئەم بەڵگەنامە حاشا لێنەکراوانە رژێمی عێراق تا ئێستا دانی بەکردەوە درێوەکانی خۆیدا نەناوە. تەنانەت ئێستاش رژێمی سەدام لە رێگای توندترکردنی گەمارۆ ئابوورییەکان و گوشاری سەربازیی درێژە بە هەوڵەکانی دەدات بۆ لە ناوبردنی کوردەکان.

خواستی سەدام بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بۆ قەڵاچۆکردنی هاووڵاتیانی خۆی نیشاندەدات سەدام بۆ راگرتنی دەسەڵاتی درێوی خۆی لە ئەنجامدانی هیچ کردەوەیەکی زاڵمانە دەست ناپارێزێت. کوردەکانی باکووری عێراق دەیانەوێت مانگی داهاتوو هەڵبژاردنێک بەڕێوە ببەن و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ پشتیوانی لەم هەوڵە بکات بۆ چەسپاندنی دیمۆکراسی لە وڵاتێک کە لەمێژە ئازادییەکانی لێزەوت کراوە. چوار ساڵ پێش جیهان بێ دەنگ بوو و لە راستیدا لە کاتی هێرشە کیمیایەکاندا بەردەوام پشتیوانی لە سەدام دەکرد.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، ئێمە ئێستا دەزانین کوردەکان هاوپەیمانی سرووشتی ئێمەن دژی سەدام و شایانی ئەوەن لە رووی سیاسی و ئەخلاقییەوە پشتیوانیان لێبکەین و یارمەتی مرۆڤدۆستانەیان بدەین. ئەم ساڵیادە درێوە دەبێ ببێ بە خاڵی پشتیوانی ئەمریکا بۆ زیندووڕاگرتنی هیوای کوردەکان لە عێراق و خەبات بۆ ئازادی و دیموکراسی. ئیدی قەت نابێت کوردەکان یا هەرکەسێکی دیکە ببن بە قوربانی کردەوە درندانەکانی سەدام.

## چوارەمین ساڵیادی کیمیابارانی کوردەکان

**ئەنجوومەنی پیران**

**١٨ی ئاداری ١٩٩٢**

سناتۆر گۆر:

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، رۆژی دووشەممە، ١٦ی ئادار چوارەمین ساڵیادی کیمیابارانکردنی شاری هەڵەبجە بوو بە فەرمانی سەدام کە پتر لە ٥ هەزار ژن، پیاو و منداڵ لەم هێرشەدا کوژران. ئەمڕۆ سەدام تەنانەت لە هەرەسهێنانە سەربازییەکەی بە دەستی ئێمە رزگاری بووە و ئێستاش هەر لە سەر دەسەڵاتە. سەدام درێژە بە شەڕی ژینۆساید دەدات دژی هەر گروپێک کە لە بەرامبەری رابوەستێت وەک شیعەکان کە لە باشووری عێراق گیریان خواردووە و بەتایبەت سەرجەم کوردەکان لە باکووری عێراق.

بەڕاستی هیچ وشەیەک نییە کە مرۆڤ بتوانێت مۆتەکەی ترۆری بەردەوامی سەدام و ئێش و ئازاری ژن و پیاو و منداڵە بێ گوناهەکانی پێ وەسف بکات کە بە دەستی دەوڵەتێک ئەنجام دەدرێت کە ئەم خەڵکەی ترساندووە و تۆقاندووە و تووشی بێ هیوایی کردووە.

بۆ وەسفکردنی ئەم رووداوانە بەتایبەت سپاسی ئێوە و هەموو ئەندامانی ئەم لێژنەیە دەکەم بە بۆنەی ناردنی راپۆرتێک لە ژێر ناوی « کوردستان لەسەردەمی سەدامدا « لە تشرینی دووەمی ١٩٩١ بۆ کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران[٢٠٧] کاتێ کە ئەم راپۆرتە دەرچوو، ٦٠٠ هەزار کورد ئاوارەی سنووری تورکیا و عێراق ببوون و لەگەڵ مەرگی بەکۆمەڵ بەهۆی سەرماو سۆڵە، نەخۆشییە پەتاکان و برسێتی رووبەڕوو بوون. پاش دەستپێکردنێکی درەنگ، ئیدارەی بوش سەرەنجام دەست بەکار بوو و لە «شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش»دا[٢٠٨] پێشی لەوە گرت ئەم نەهامەتییە ببێ بەکارەسات.

بــه یارمەتی ئەم هەولانە خەڵکی کورد لە کارەســـات رزگاریان بوو، بەلام هێشتا لەگەڵ مەترسیەکی کوشندە بەرەوڕوون. سەدام چەند مانگە ئابلۆقەی خســـتووەتە سەر ناوچە کوردنشینەکان بۆ ئەوەی خەڵکەکەی خۆی بە برســـێتی بکوژێت، چونکە سەدام لەوە دەترسێت کە ئەگەر ئەم دەنگانە کپ نەکات کوردەکان بەسەریدا زاڵ دەبن.

ئێســـتا خۆراک، سووتەمەنی و دەواو دەرمان لە ناوچەکە زۆر کەمە. نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئەرکی یارمەتیدانی مرۆڤدۆستانەی لە سەر شانە هەتا ئەو شوێنەی کە من ئاگادارم وەکوو پێویست وەلامی پێداویستییەکانی نەداوەتەوە. لە هەمان کاتدا هێزەکانی سوپای عێراق دەستیانکردووە بە گوشارخســـتنە سەر ناوچە کوردنشینەکان. روونە کە سەدام دەیەوێت لە هەموو ئامرازێک بۆ لەناوبردنی کوردەکان کەڵکوەربگرێت. پرسیار ئەوەیە کە ئایا سەدام دەتوانێت خۆی لە دەست کوردەکان رزگار بکات؟

ویلایەتـــە یەکگرتووەکان ناتوانێت پشـــت لەم ســـەرکووتە زاڵمانە، نامرۆیـــی و وێنانەکراوە بکات. ئێمـــە دەتوانین کارێکی جیاواز بکەین بۆ ملیۆنەهـــا مرۆڤ کە لـــە پیاو، ژن، منـــداڵ، دایک و بـــاوک و باپیر و داپیر و نەوەی نـــوێ پێکهاتووە و بیانپارێزین. ئێمە دەتوانین خۆراک، سووتەمەنی و دەواو دەرمان بگەیەنینە دەستی کوردەکان، تەنانەت ئێمە و ولاتانی دیکە دەبێ یارمەتی تورکیا بدەین بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەم بوومەلەرزەیە. ئێمە دەبێ و توانای ئەوەمان هەیە کە وەلامی سەدام بدەینەوە ئەگەر مەرجەکانی ئاگربەست رەچاو نەکات.

# کیمیابارانی هەڵەبجە یەکێ لە تاریکترین کاتەکانی مێژووی مرۆڤایەتی بوو

## ئەنجوومەنی پیران
## ١٤ی ئاداری ١٩٩٦

سناتۆر پێڵ:

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن، کۆتایی ئەم هەفتەیە ساڵیادی یەکێ لـــە تاریکترین کاتەکانی مێژووی مرۆڤایەتییە. ٨ ســـاڵ پێش لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ هێزەکانی ســـەدام حوســـەین ( کە لە لایـــەن هێزەکانی ئێرانـــەوە لـــە دوورگەی فاو گەمـــارۆ درابوون و هێـــزە کوردەکانیش لە باکووری عێراق پێشـــڕەویان کردبوو) بە چەکی کیمیایی هێرشیان کردە ســـەر شارۆچکەی کوردنشینی هەڵەبجە و لەئەنجامدا ٥ تا ٦ هەزار کورد کوژران کە زۆربەیان خەڵکی سڤیلی بێ گوناه بوون.

لەم ٨ ســـاڵەی پاش هێرشـــی کیمیایی عێراقدا، هەڵەبجە گرنگترین ســـەمبوولی بارودۆخی نالەباری خەڵکی کـــورد بووە کە وێنای ڕەفتاری دڕندانەی دەوڵەتی عێراق لە بەرامبەر کوردەکانە. وێنە لەبیرنەکراوەکانی قوربانیانی ئەم هێرشە (پیاوێک کە لەگەڵ کوڕە ساواکەی وشک ببوو[٢٠٩] و کچە منداڵێک کە سەرپۆشـــی بەســـەرەوە بوو و دەمووچاوی بە تەواوی شـــێوابوو) هەتا هەتایە لە بیری خەڵکـــی کورددا دەمێنێتەوە. هەروا کە زۆربەی خەڵکی بۆسنیا قەت پاکتاوی ڕەگەزی شاری «سربرینیکا»[٢١٠] لە بیرناکەن، کوردەکانیش هێرشی کیمیایی هەڵەبجە قەت لە بیر ناکەن.

بە دڵنیاییەوە هەروەها کە هەموومان دەزانین هەڵەبجە تەنها نموونەی کیمیابارانکردنی کوردەکان نەبوو و کۆتایی بە ســـەرکوتی کوردەکان لە لایەن عێراقەوە نەهێنا. هەرچەند کە کیمیابارانی هەڵەبجە ناخۆشـــترین ڕووداو بـــوو بەڵام تەنها یەکێ لە زنجیرە کردەوە دڵڕەقەکانی عێراق بوو دژ بە کورد. لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠ تا کۆتایی ئەم دەیە، هێزەکانی عێراق بە شـــێوازی سیســـتماتیک گوندە کوردنشـــینەکانیان ڕووخاند و

گوندنشـــینەکانیان بە زۆر لە ئۆردوگا زۆرە ملێیەکاندا نیشـــتەجێکرد و دەیان هەزار کوردیان گرت و بێ سەروشوێن کرد و سەدان گوند و شاری کوردنشـــینیان خاپوور کرد. ئەم کردەوانە لە شـــاڵاوی ناسراو بە ئەنفال لە ١٩٨٨ گەیشتە لوتکەی خۆی. بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکان، نزیکەی ١٥٠ هـــەزار کورد لەم ماوەیەدا بێ سەروشـــوێن کـــراون و لەناو براون. بە گشـــتی ئەم کردەوانەی عێـــراق دژی کوردەکان لە حوکم و قەبارەی ژینۆسایددایە.

من و ســـەرۆکی هێژای کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە، ســـناتۆر هێلمز زۆر هەوڵماندا‌وە ســـەرنجی ئەنجوومەنی پیـــران بەرەولای ئازار و نەهامەتییەکانی کوردەکان رابکێشین کە یەکێ لەوانە خستنەرووی یەکەم گەلاڵە یاســـای گەمارۆدانی عێراق لە ١٩٨٨ بوو بە هۆی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی کوردەکان.

پاش ئەوەی کۆمەڵێک بەڵگە و نیشـــانەی بایەخدار کەوتە دەســـتی ئێمـــە ســـەبارەت بە رەفتـــاری دڕندانەی عێـــراق دژی کـــوردەکان کە زۆربەیان بەدەســـتی خودی کاربەدەســـتانی عێراق نووسراون، کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە ( بەتایبەت لە رێگای هەوڵە بێ وچانەکانی«پیتر گالبریـــس» کە ئەو کاتە ئەندامی ئەم کۆمیتەیە بوو و ئێســـتا باڵوێزی ویلایەتـــە یەکگرتووەکانـــی ئەمریکایە لە کرواتیا) هەوڵیـــدا پتر لە ١٨ تەن بەڵگەنامەی هەواڵگری عێراق وەدەســـتبخات کە کوردەکان لە کاتی راپەرینی ١٩٩١ دەســـتیان بەســـەردا گرتبوو. ئەم بەڵگەنامانە دەتوانێ رەفتاری تاوانبارانەی عێراق بە تەواوی ئاشکرا بکات. رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ کە رێکخراوێکی ســـەربەخۆیە، دەستیداوەتە کارێکی شاز بۆ تاوتوێ و شـــیکردنەوەی ئەم بەڵگەنامانە کە پەیوەندییان بە ژینۆسایدی کوردەوە هەیە بە دەستی دەوڵەتی عێراق.

ئەمە بەســـەرهاتێکە کـــە دەبێ بگێڕدرێتەوە. هەروەهـــا کە لەوانەیە هەندێ لە هاوکارانم بزانن مەســـەلەی جینۆساید بایەخێکی یەکجار زۆری لای من هەیە. پاش شەڕی دووەمی جیهانی باوکم، «هێربێرت کلایبۆرنی

پێــڵ»[٢١١] دەورێکی بەرچاوی بینی بۆ ئەوەی ژینۆســاید وەک تاوانی جەنگ لەقەڵەم بدرێت. باوکم هەرچەند تەنگ و چەڵەمەی زۆری توشبوو، بەڵام ســەرەنجام ســەرکەوتنی بەدەســتهێنا و منیش لە پێداگربوون و بەرپرســیاربوونی ئەو لە بەرامبەر پرەنســیپەکان گەلێ شت فێر بووم. جیهان دەبێ دژی ژینۆســاید رابوەســتێ لە هەر شوێنێک و هەر کاتێک کە روو بدات.

هەڵەبجــە نابێــت لە بیر بکرێــت و عێراق دەبێ بەرپرســیار بێ لە بەرامبەر کــردەوە دڵرەقەکانی دژ بە کورد. ئێمە نابێ بهێڵین ئەم هەلە بە سادەیی لە دەستمان بچێت.

بریا بمتوانیبا بمگوتایا بەخۆشــییەوە چیرۆکی دڵتەزێنی کوردەکانی عێــراق کۆتاییپێهاتووە و بووە بە وانەیــەک بۆ رێبەرایەتی عێراق، بەڵام بەداخەوە ناتوانم وابڵێم. هەرچەند کە کوردەکانی عێراق ئێستا کۆنترۆڵی بەشــێکی بەرچاو لــە خاکی کوردســتانیان بەدەســتەوەیە (لە ئاکامی شــەڕی کەنداوی فارسدا) بەڵام رەفتاری خراپی سەدام لەگەڵ کوردەکان بەردەوامە. هێزەکانی عێراق ئابڵۆقەیەکی توندوتۆڵیان خســتووەتە سەر پارێزگاکانی ژێر کۆنترۆڵی کوردەکان. جگە لەوەش لە ئاکامی ئابڵۆقەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ســەر عێراق، کــوردەکان لە ژێر باری گران و تاقەتپڕووکێنی دوو ئابڵۆقەی ئابووریدان.

کوردەکان لە پارچەکانی دیکەی کوردســتانیش (بەتایبەت ئێران و تورکیا) لەگەڵ پێشێلکاریی جیدی مافی مرۆڤ و سەرکوتی لە رادەبەدەر بەرەوڕوون و ئەمە نیشان دەدات بارودۆخی نالەباری کورد هیچ سنوورێکی نییــە. بارودۆخەکە ئەوەندە نالەبارە کــە لە ماوەی ١٨ مانگی رابردوودا کوردەکانــی عێراق ( کە ســەرەتا یەک هەڵوێســت و هاودەنگ بوون بۆ ئۆتۆنۆمی و دژایەتیکردنی ســەدام) دەســتیان کردووە بە شــەڕ لە ناو خۆیاندا.

ئــەم بارودۆخە بۆ من راســت و دادپەروەرانە نییــە و لەوە ناچێت وەڵامێکی بــاش بێت لەلایەن کۆمەڵــگای نێونەتەوەییــەوە بە میراتی

ترســـناکی هەڵەبجە. بە باوەڕی من دەبێ هەوڵێکی یەکجار زۆرتر بدرێت بـــۆ دۆزینەوەی کۆمەڵـــە رێگایێک بۆ یارمەتیدانـــی کوردەکانی عێراق بۆ ئـــەوەی بیرەوەرییە پڕ ئێـــش و ئازارەکانی رابردوویـــان لە بیر بەنەوە، بـــۆ ئەوەی هێدی هێدی لـــە گریدراوبوون بـــە یارمەتیەکانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی رزگاریان بێت و لەگەڵ دوژمنی هاوبەشـــمان واتا ســـەدام حوسەین بەربەرەکانی بکەن. کوردستانی عێراق تەنها ئەو کاتە دەتوانێت ببێت بە بنەما و بەردی بناخەی عێراقێکی ئازاد و دیمۆکراتیک.

لانیکەم کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و بەتایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ ئەرکی خۆی بەنیســـبەت پاراســـتنی کوردەکان جێبەجێ بکات. لە ژێر چەتری شاڵاوی دابینکردنی ئاسایشدا، هێزە هاوپەیمانەکان، لەوانـــە ویلایەتـــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەریتانیا و فەرانســـا درێژە بە پاراســـتنی هەوایی هەرێمی دژەفڕین و پاراســـتنی کوردەکانی عێراق دەدەن و ئاسانکاری دەکەن بۆ گەیاندنی یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکان. بە هەرحاڵ ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی ئەم دواییانەی تورکیا کۆمەڵێک گومانی دروســـت کردووە لە بەرامبەر بەردەوامبوونی ئەم شاڵاوە لە درێژخاندا و بارودۆخی ئابووری کوردســـتانی عێراق بە گشتی بەرەو خراپی دەچێت. ئەم بارودۆخەی ئێســـتا نە بە قازانجی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەواو دەبێـــت و نە بەقازانجی کۆمەڵگای نێونەتەوەییە و نە یارمەتی بە ســـارێژکردنەوەی مێژووی خەمباری چەوساندنەوەی کورد دەدات. کاری ئێمە لە عێراق ( چ دژی سەدام و چ پشتیوانیکردن لە کوردەکان) هێشتا تەواو نەبووە.

ســـناتۆر هێڵمـــز: جەنابـــی ســـەرۆکی ئەنجومەن، منیـــش لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی دۆســـتی بەڕێز و ئەندامی هێـــژا و بەتوانای کۆمیتەی پەیوەندییەکانـــی دەرەوەی ئەنجوومەنـــی پیران، بەڕێـــز پێڵ هاوڕام و سپاسی دەکەم بۆ وەبیرهێنانەوەی کارەساتی کۆمەڵکوژی خەڵکی سڤیلی کورد کە ٨ ســـاڵ پێش لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ لە شارۆچکەی هەڵەبجە روویدا.

فرۆکــە جیتەکانی عێراق بێ هۆشــداری پێشــوو بەچەکی کیمیایی شارۆچکەی کوردنشــینی هەڵەبجەیان لە باکووری عێراق بۆمباران کرد. ئەم هێرشە ترســناکە کە تەنانەت بە گوێرەی ستانداردەکانی عێراقیش کردەوەیەکی دڕندانەیە، هەزاران ژن، پیاو و منداڵی بێ گوناحی کوشت. کۆمەڵکوژی هەڵەبجە ســەرنجی جیهانی بەرەولای شــالاوی ژینۆسایدی سەدام دژی کوردەکانی باکووری عێراق راکێشا. بەهەرحاڵ ئەم سەرنجدانە نەیتوانی پێش لە کۆمەڵکوژی سیستماتیکی سەدان هەزار خەڵی سڤیلی کورد بە دەستی دەوڵەتی عێراق بگرێت.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، سپاسی بەڕێز پێڵ دەکەم لەبەر ئەوەی هەمیشە یەکێ لەو کەسانە بووە کە ویستوویەتی باسی بارودۆخی خراپی کــوردەکان بکات. من لەگەڵ بەڕێز پێڵ لە ســاڵی ١٩٨٨ کارم کرد بۆ ئابلۆقەدانــی عێراق بەهــۆی رەفتارە چەوســێنەرەکەی. ئەگەر کۆمەڵە کەسانێکی دیکە وەک سناتۆر پێڵ لە سەراسەری جیهان و بەتایبەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەبانا کە داوای پاراستنی کوردەکانیان کردبایا، لەوانەیە ژمارەیەکی زۆرتر لە کوردەکان ئیستا زیندووبان.

بە هەرحاڵ بەشــی کۆتایی ئەم تراژیدییە هێشتا جێبەجێ نەکراوە. سەدام حوسەین دەستی لە رەفتارە دڵرەقەکانی دژی هاوولاتیانی کوردی عێراق هەڵنەگرتووە و هەرچەند کە ناتوانێ لە ناویان ببات بەلام هەرچی لە دەســتی دێت دەیکات بۆ ئەوەی لە سەرەتاییترین مافەکان بێبەشیان بکات.

جەنابی ســەرۆکی ئەنجومەن، لە ئەنجامی هەوڵەکانی سناتۆر پێڵ، بارودۆخــی کوردەکان ســەرنجی جیهانــی بەرەولای خۆی راکێشــاوە. کوردەکان نابێ قەت لە بیر بکرێن.

**سناتۆر دیان فینێستین (۲۱۲):**

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن، ٨ ساڵ پێش لە هەفتەیەک وەک ئەم هەفتەیەدا لە کۆتایی شەڕی ئێران و عێراق، سەدام حوسەین هێزە چەکدارەکانی خۆی نارد بۆ ئەوەی راپەڕینی کوردەکانی باکووری عێراق تێکبشکێنن.

لەم هێرشەدا کە لە شارۆچکەی هەڵەبجە چڕبووەوە، هێزەکانی سەدام بە چەکی کیمیایی هەڵەبجەیان بۆمباران کرد و پتر لە ٥ هەزار کورد بە شێوازێکی دڕندانە گیانیان لەدەستدا کە ژمارەیەکی زۆریان منداڵ بوون.

هەروەها لێکۆڵینەوەکانی کۆتایی جەنگی ئێران و عێراق نیشانیداوە هەڵەبجە تەنها یەکێ لە دڕندەترین بەشەکانی شاڵاوی ژینۆسایدی سەدام دژبە کوردەکانی باکووری عێراق بووە نە هەمووی.

لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠ هەتا کۆتایی جەنگی ئێران و عێراق، دەوڵەتی عێراق بە چەکی کیمیایی هێرشیکردە سەر گوند و شارە کوردنشینەکان، سەدان هەزار کوردی لە ئۆردوگا زۆرەملێکاندا نیشتەجێکرد و دەیان هەزار کوردی دیکەی بێ سەروشوێنکرد. نزیکەی ١٥٠ هەزار کورد لە شاڵاوی ناسراو بە ئەنفالدا گیانیان لە دەستدا کە تەنها دەکرێت وەک شاڵاوی ژینۆسایدی کوردەکانی عێراق لەلایەن سەدام حوسەینەوە ناوزەد بکرێت.

بەداخەوە ئەمە تەنها کردەوەی دڕندانەی سەدام نەبوو دژ بە خەڵکی خۆی. کۆمەڵکوژی دەوڵەتی عێراق لە شاڵاوی ئەنفال بواری بۆ دوایین ژینۆسایدی سەدام خۆش کرد، ئەمجارە دژی عەرەبە زۆنگاونشینەکانی باشووری عێراق. لە ساڵانی پاش شەڕی کەنداو کاتێک کە شیعە راپەڕیوەکانی عێراق پەنایان بۆ کۆمەڵگا دووردەستەکانی «عەرەبە زۆنگاونشینەکان» برد سوپای سەدام هێرشیکردە سەر ئەم کۆمەڵگایە.

لەم سێ سالەی دواییدا هەزاران کەس لە عەرەبە زۆنگاونشینەکان بێسەروشوێن کراون و هەموو گوندەکانیان خاپوور کراوە و سوتێنراوە. ژینۆسایدی ئەمجارە لەگەڵ دەستدرێژی بۆ سەر ژینگە ئەنجامدراوە، چونکە ئەندازیارە عێراقیەکان ژینگەی بە پیت و بەرەکەت و هەزاران کێڵگەی عەرەبە زۆنگاونشینەکانیان وشک کردووە بۆ ئەوەی گوندنشینەکان لەوێ دەربکەن و رێگای بژێوی کۆنی عەرەبە زۆنگاونشینەکان لەناوببەن.

کوردەکانیش هەروا بە دەستی سەدام دەچەوسێنەوە. کوردەکان لە کۆتایی شەڕی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١ بە یارمەتی دەستێوەردانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانان توانیان لە دەستی شەپۆلێکی نوێی کۆمەڵکوژی سەدام رزگاریانبێ. ئەمڕۆ هەرچەند کە کوردەکانی عێراق بە شێوازی ئۆتۆنۆمی پارێزگاکانی باکووری عێراق بەڕێوە دەبەن (لە ژێر سایەی هەوڵی هاوبەشی هێزەکانی ئەمریکا، بەریتانیا و فەرانسا کە شالاوی دابینکردنی ئاسایش بەڕێوە دەبەن بۆ پاراستنی کوردەکان) بەڵام هێشتا لەگەڵ گەمارۆی ناوخۆیی هێزەکانی سەدام و هەروەها گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر عێراق و هێرشە کاتییەکانی عێراق بۆ سەر شارە کوردنشینەکان بەرەوڕوون.

هیچکام لە ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران بە قەد ئەندامی هێژا و پایەبەرزی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە، بەڕێز سناتۆر پێڵ هەوڵیاننەداوە بۆ خستنەڕووی بارودۆخی کوردەکان. لە ئاکامی هەوڵەکانی سناتۆر پێڵ و هەوڵەکانی سەرۆکی هێژای کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە، سناتۆر هێڵمز پتر لە ١٨ تەن بەڵگەنامەی دەوڵەت و هەواڵگری عێراق لە پەیوەندی لەگەڵ شالاوی ژینۆسایدی کوردەکان بۆ شیکردنەوە و توێژینەوە گوازراوەتەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەم بەڵگەنامانە لە کاتی ڕاپەڕینی ١٩٩١ لە لایەن کوردەکانەوە دەستیان بە سەرداگیراوە. ئەنجامی ئەم توێژینەوانە مێژووی ڕەفتارە دڵڕەقەکانی

عێراق دژ بە کوردەکان دەردەخات، لەوانە بەکارهێنانی ترسناکی چەکی کیمیایی.

لەم ساڵیادە دڵتەزێنەدا، سپاسی سناتۆر پێڵ و سناتۆر هێڵمز دەکەم بۆ ڕێبەرایەتییەکەیان لەم پەیوەندییەدا. هیوادارم ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریــکا درێژە بە دەوری ڕیبەرایەتی خۆی بدات بۆ دابینکردنی ژیانێکی باشتر بۆ کوردەکانی عێراق، چ پێش و چ پاش لە سەر دەسەڵات لابرانی سەدام.

## بڕیارنامەیەک بۆ دەربڕینی هاوخەمی لەگەڵ کۆمەڵکوژی کورد لە هەڵەبجە

### ئەنجوومەنی نوێنەران

### ٢٦ی ئاداری ١٩٩٦

کۆنگرێسمەن گیلمان:

جەنابی ســەرۆکی ئەنجومەن، داوا دەکەم هاوکارانم دەنگ بدەن بە بڕیارنامەی ٣٧٩ کە دەربڕی هەســتی کۆنگرێسی ئەمریکایە بەنیسبەت هەشــتەمین ســاڵوەگەڕی کۆمەڵکوژی پتر لە ٥ هەزار کورد لە ئاکامی هێرشی کیمیایی دەوڵەتی عێراق. ئەمە دەقی بڕیارنامەکەیە:

بڕیارنامەی ٣٧٩ی کۆنگرێس

- بــە لەبەرچاوگرتنــی ئەوەی کە پتر لە ٤ میلیــۆن کورد لە عێراق دەژین کە دەکاتە ٢٠٪ی دانیشتووانی عێراق.
- بــە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە دەوڵەتی عێــراق درێژە بە کردەوە توندوتیژەکانی خۆی دەدات دژی کوردەکانی عێراق.
- بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ٧ی ئاداری ١٩٨٨ دەوڵەتی عێراق چەکی کیمیایی دژی هاووڵاتیانی ســڤیلی کوردی عێراق لە شــارۆچکەی ســنووری هەڵەبجە بەکارهێناوە و لە ئەنجامدا پتر لە ٥هەزار خەڵکی بێ

گوناه کوژراون.

- بە هۆی ئەوەی ئەم کردەوە نامرۆڤانە و درندەیەی دەوڵەتی عێراق بووەتە هۆی ناڕەزایەتی و تورەیی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی.

- بـــە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق درێژە دەدات بە کەڵکوەرگرتن لە چەکی کیمیایی دژی خەڵکی بێ پاراســـتنی کورد، هەروەها کە لە ساڵی ١٩٨٨ ئەنجامیداوە.

- بـــە هۆی ئەوەی پتر لە ١٨٢ هەزار کوردی عێراق لە ســـەروبەندی شاڵاوی ئەنفال لە ١٩٨٨دا کوژراون.

- بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەگەر کۆمەڵگای نیونەتەوەیی وەڵامی داگیرکرانی کوێتی لە ١٩٩٠ بە دەستی عێراق نەدابایاوە و کۆمەڵێک رێگای نەگرتبایابەر بۆ لەناوبردنی ئەمباری چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراق.

- بە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق پتر لە ٢٠ ملیۆن مینی لە سەراسەری ناوچە کوردنشینەکان چاندووە کە کەند و کۆسپ دروست دەکات لە سەر رێگای نیشتەجێکردنەوەی خەڵکی ئاوارە.

- بـــە لەبەرچاوگرتنی ئـــەوەی کە بڕیارنامەی ٦٨٨ی ١ی نیســـانی ١٩٩١ی ئەنجوومەنی ئاسایشـــی نەتەوە یەکگرتـــووەکان داوای لە عێراق کردووە سەرکوتی هاووڵاتیانی خۆی رابوەستێنێت و داوای لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی کردووە پرۆگرامێکی حەواندنەوە بۆ خەڵکی سڤیلی عێراق، بەتایبەت کوردەکان دابرێژێت.

- بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە بەهاری ١٩٩١وە ئەمریکا، بەریتانیا و فەرانســـا هەر رۆژ هەرێمی دژەفڕین لە مێلی ٣٦ لە باکووری عێراق بە هێزی ئاسمانی دەپارێزن.

- بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە جگە لە چەتری پاراســـتنی ئاسمانی هێـــزە هاوپەیمانەکان، نەتـــەوە یەکگرتووەکانیش شـــاڵاوی حەواندنەوە و ئاسایشـــی لە عێـــراق، بەتایبەت لە ناوچە کوردنشـــینەکان جێبەجێ

کردووه.

- بــه لەبەرچاوگرتنــی ئــەوەی کە لــە ســاڵی ١٩٩١ەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانــی ئەمریکا نزیکەی ١/٢ بلیــۆن دۆلاری تەرخان کردووە بــۆ پاراســتن و یارمەتیدانی کوردەکانی عێراق لە شــاڵاوی دابینکردنی ئاسایشدا.

- بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە کوردەکانی عێراق قەت ئاشــتییەکی راســتەقینە بە چاو نابینــن هەتا کاتێک کە داپــەروەری لە بەرامبەر تاوانبارانی عێراق جێبەجێ نەکرێت.

کەوابوو کۆنگرێســی ویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئەمریــکا بڕیاریدا حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ:

١- هەشتەمین ساڵوەگەڕی کوژرانی ٥ هەزار کوردی عێراق لە هێرشی کیمیایی ١٩٨٨ بە دەســتی دەوڵەتی عێراق لــە هەڵەبجە بەرز رابگرێت لەرێگای یادکردنەوەی ئەو ژن و منداڵ و پیاوە بێ گوناهانەی کە گیانیان لەم رووداوەدا لەدەستداوە.

٢- جەخت لە ســەر ئەرکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکاتەوە بۆ پاراستن و یارمەتیدانی خەڵکی کورد لە عێراق و ئەوە مسۆگەر بکات کە تراژیدیای هەڵەبجە قەت دووپات نابێتەوە.

٣- پشــتیوانی بــکات لە هەوڵەکان بــۆ پێکهێنانــی ئاڵترناتیڤێکی دیموکراتیک بۆ رژێمی ئێســتای عێراق کە مافی ئۆتۆنۆمی کوردەکان لە چوارچێوەی سیستمێکی فیدراڵدا بە فەرمی بناسێت.

٤- درێژە بــە هەوڵەکانی بدات بۆ پێکهێنانــی دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکانــی جەنگ بۆ دادگاییکردنــی رێبەرانی عێراق کە تاوانیان دژ بە مرۆڤایەتی و تاوانی جەنگیان ئەنجامداوە.

* * * * * *

**کۆنگرێسمەن گیلمەن:**

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، من بە توندی پشتیوانی دەکەم لە بڕیارنامەی ٣٧٩ی کۆنگرێس کە لە ١٧ی ئاداری ١٩٩٦ لەلایەن هاوکاری هێژامان بەڕێز پۆرتێر، نوێنەری ئەیالەتی ئیلۆنویز ئامادەکراوە کە هەستی کۆنگرێس دەردەبڕێت بەنیسبەت هەشتەمین ساڵیادی کۆمەڵکوژی ٥ هەزار کوردی عێراق لە ئاکامی هێرشی کیمیایی دەوڵەتی عێراقدا.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا باش ئاگاداری کردەوە دڕندەکانی ڕژێمی سەدام حوسەینە دژ بە کەمینەکانی عێراق، بەتایبەت کوردەکان کە ئێستا لە باکووری عێراق لە شاڵاوی دابینکردنی ئاسایشدا دەپارێزرێن. پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم شاڵاوە شتێکی یەکلاییکەرەوەیە، چونکە ئەمریکا لە پاراستنی هەرێمی دژەفڕین لە باکووری عێراق لە هێڵی ٣٦ بەشداره و هەروەها بەهۆی یارمەتی ١/٢بلیۆن دۆلاری ئەمریکا بۆ یارمەتی و پاراستنی کوردەکان لە باکووری عێراق کە ئێمە دەتوانین لەم ڕێگایشەوە وەلامی دەستدرێژییەکانی سەدام بدەینەوە.

بڕیارنامەی ٣٧٩ی کۆنگرێس ڕووداوەکانی ١٧ی ئاداری ١٩٨٨ وەبیر دەهێنێتەوە و داوا لە حکوومەتی ئەمریکا دەکات یادی ئەو خەڵکە بێ گوناحە بەرز رابگرێت کە لەم هێرشە دڵتەزێنەدا گیانیان لە دەستداوە و جارێکی دیکە جەخت لە سەر ئەرکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکاتەوە بۆ پاراستن و یارمەتیدانی کەمینەی کورد لە عێراق و مسۆگەرکردنی ئەوە کە کۆمەڵکوژی هەڵەبجە جارێکی دیکە دووپات نابێتەوە و پشتیوانی لەو هەوڵانە بکات بۆ پێکهێنانی ئاڵترناتیڤێکی دیموکراتیک بۆ ڕژێمی ئێستای عێراق کە لە چوارچێوەی سیستمێکی فیدراڵدا دان بە مافی ئۆتۆنۆمی کوردەکاندا بنێت و درێژە بە هەوڵەکانی بدات بۆ پێکهێنانی دادگای تاوانباری جەنگ بۆ دادگاییکردنی ڕێبەرانی عێراق بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی.

سپاســـی نوێنەری هێژای ئەیالەتی ئیلونیۆز و هاوسەرۆکی کۆمیتەی مافی مرۆڤ، بەڕێز پۆرتێر دەکەم کە ڕێبەری خەباتی ئێمە بوون بۆ مافی مرۆڤ و بە ماوەی چەند ساڵ کێشەی کوردیان هێناوەتە بیرمان.

کۆنگرێســـمەن مۆران:[٢١٣] جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، ئەندامانی گرووپی کەمینەی کۆنگرێس ستایشی ئەم بڕیارنامەیە دەکەن کە لەلایەن بەڕێز پۆرتێـــر و بەڕێز گیلمانەوە خراوەتەڕوو. پێویســـتە ئێمە تووڕەیی و ناڕەزایەتـــی خۆمان دەرببڕین بەنیســـبەت کۆمەڵکوژی ٥ هەزار کورد بـــە چەکـــی کیمیایی. لە پێشـــەرۆژدا ئێمە دەبێ لەلایـــەن کۆمەڵگای نێونەتەوەیـــی و لەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی درێژە بە چاودێریکردن و گوشارخستنەسەر عێراق بدەین.

ئـــەم بڕیارنامەیـــە جەخت لە ســـەر بەرپرســـیاربوونی ئێمە دەکات بەنیسبەت پاراستن و یارمەتیدانی کوردەکانی عێراق و پشتیوانی دەکات لە هەوڵەکان بۆ پێکهێنانی ئاڵترناتیڤێکی دیموکراتیک بۆ ڕژێمی ئێستای عێراق کە لە چوارچێوەی سیستمێکی فیدراڵی دیمۆکراتیکدا دان بە مافی ئۆتۆنۆمـــی کوردەکاندا بنێت و داوا لە دەوڵەتی ئەمریکا دەکات درێژە بە هەوڵەکانی بدات بۆ پێکهێنانی دادگای تاوانبارانی جەنگ بۆ دادگاییکردنی ڕێبەرانی عێراق بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی، بەتایبەت ســـەدام حوسەین. کەوابوو ئەمە بڕیارنامەیەکی باشە، داواکارم پەسەند بکرێت.

کۆنگرێسمەن پۆرتێر: جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، سپاسی هاوسەرۆکی هێـــژای کۆمیتەی مافی مـــرۆڤ، بەڕێز گیلمان دەکەم کـــە کاتی خۆی بەخشـــی بە من و زۆر سپاسی دەکەم بە هۆی ڕێبەرایەتییە شازەکەی لە خەبات بۆ مافی کەمینەکان لە سەراسەری جیهان. بەڕێز گیلمان شێلگیر بووە لە سەر پشتیوانیکردن لە گەلی کورد کە مەزنترین گرووپی ئەتنیکی جیهانە کە ٢٥ملیۆنـــە و دەوڵەتی خۆی نییە و لە نێوان تورکیا، ئێران، عێراق و ســـووریادا دابەش بووە. بەڕێز گیلمان بەتەواوی ســـەرکەوتوو بووە لە ڕێبەرایەتییەکەی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی ئێمە بەرەولای بارودۆخی کوردەکان و خەبات بۆ مافە بنەڕەتییەکانی خۆیان لەم چەند وڵاتەدا.

جەنابی سەرۆک ٨ ساڵ پێش لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ رژێمی سەدام حوسەین بە چەکی کیمیایی هێرشـــیکردە سەر شارۆچکەی کوردنشینی هەڵەبجە و لە ئەنجامدا پتر لە ٥ هەزار خەڵکی سڤیلی کورد، لەوانە ژن و منداڵ کوژران. دوابەدوای هێرشەکە دەوڵەتی عێراق لە رێگای درێژەپێدانی سەرکوتی کوردەکان، سرووشتی نامرۆڤانەی خۆی نیشاندا.

لە ســـاڵی ١٩٨٨ پتر لە ١٨٢ هەزار کوردی عێراق لە ئاکامی هێرشی کیمیایـــی دەوڵەتی عێراق کـــوژران و تەنها پـــاش داگیرکرانی کوێت لە لایـــەن عێراق لە ١٩٩٠ بوو کە کۆمەڵـــگای نیونەتەوەیی هەنگاوی بۆ لە ناوبردنی ئەمباری چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراق هەڵگرت. ئەمرۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمەڵگای نیونەتەوەیی پشـــتیوانی لە هەوڵی پاراســـتنی کوردەکانی عێراق دەکەن. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەوری سەرەکی بینیوە لە مسۆگەرکردنی دەستپێراگەیشتنی کوردەکانی عێراق بە یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکان و پاراستنیان لە بەرامبەر هێرشەکانی دەوڵەتی عێراقدا.

بەهەرحـــاڵ بارودۆخی کوردەکانی عێراق هەروا لەو پەڕی خراپیدایە. سەدام حوسەین درێژە بە کردەوە تیرۆریسیەکانی لە ناوچە کوردنشینەکان دەدات لە رێگای خراپکاری و ئابڵۆقەی ئابووری. جگە لەوەش چاندنی ٢٠ ملیۆن مین لە سەراسەری ناوچە کوردنشینەکان لەلایەن دەوڵەتی عێراق، کەند وکۆســـپی دروست کردووە لە سەر رێگای هەوڵە مرۆڤدۆستانەکان. ئەمرۆ نزیکەی ١٠٠هەزار سەربازی عێراقی لە لێواری ناوچە کوردنشینەکان مۆڵیانداوە و هەڕەشە لەم ناوچانە دەکەن.

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، دەوڵەتی عێـــراق هاووڵاتیانی خۆی لە ســـەرەتاییترین مافەکان و ژیان لە ژێر ســـەروەری یاسا بێبەشکردووە. نەتەوە یەکگرتووەکان دوابـــەدوای داگیرکرانی کوێت لە ١٩٩٠، گەمارۆی خستووەتە سەر عێراق. سەدام حوسەینیش درێژە بە سەرپێچییکردن لە جێبەجێکردنی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان دەدات. لـــە ئاکامدا بارودۆخی ئابووری رۆژ بەرۆژ خراپتر دەبێت، بەڵام

باری ئەم بارودۆخە ئابووریە لە ســـەر شـــانی سەدام حوسەین نییە، بە پێچەوانەوە باری گرانی دیکتاتۆری و سیاســـەتە ســـەرکوتکەرەکانی لە سەرشـــانی هاوولاتیانی بێ گوناحی عێراقە کە لە مافی گۆڕینی دەوڵەت و مافی ئازادیی رادەربڕین و پێکهێنانی کۆڕ و کۆمەڵەکان بێبەش کراون. تەنها لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی کوردەکان لە باکووری عێراق (کە لەلایەن هێزە نێونەتەوەییەکانەوە دەپارێزرێت) رێز لە مافی مرۆڤ دەگیرێت.

جەنابـــی ســـەرۆکی ئەنجومەن، عێراق دەبێ هەر وەکـــوو رابردوو لە کۆمەڵـــگای نیونەتەوەیـــی گۆشـــەگیر بکرێت هەتا کاتێـــک کە رێز لە مافی هەموو مرۆڤێک بۆ ژیان، عیبادەت و قســـەکردن بە زمانی زگماکی بگرێـــت. ئێمە قەد نابێ ئەو کوردانەی عێراق لە بیر کەین کە لە ئاکامی کردەوە دڕندە و ســـەرکوتکەرانەکانی دیکتاتۆری سەدام گیانی خۆیان لە دەستداوە.

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، بەرپرســـیارێتی زیندووڕاگرتنی یادی ئـــەوان بۆ هەتا هەتایە لە ئەســـتۆی ئێمەیە. ڕووداوەکانـــی رابردوو بە روونی دەریخستووە سەدام حوســـەین سبەینێ دیسان هێرش دەکاتەوە سەر کوردەکان ئەگەر ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا نەیانپارێزێت. لە ساڵی ١٩٩١ەوە «شالآوی دابینکردنی ئاسایش» یارمەتی مرۆڤدۆستانەی بۆ کوردەکان دابینکردووە و پاراستوونی.

من لە ســـەر ئەو بڕوایەم بێ یارمەتـــی ئەخلاقی و ئابووری ویلایەتە یەککگرتووەکانـــی ئەمریکا، بێ هیچ گومانێـــک ژمارەیەکی زۆرتر لە پیاو و ژن و منداڵـــی بێ گونـــاح ژیانی خۆیان لە دەســـت دەدەن. ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ درێژە بە پشـــتیوانیکردن لە کەســـانێک وەک کوردەکانی عێراق بدات کە مافە بنەڕەتییەکانی خۆیان رادەســـتی دیکتاتۆرێکی مرۆڤکوژ و سەرکوتکەر وەک سەدام نەکردووە.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، ئەمڕۆ بە پەسەندکردنی ئەم بڕیارنامەیە کۆنگرێس رەچەشکێنی دەکات لە بەرزڕاگرتنی یادی هێرشی ١٧ی ئاداری ١٩٨٨ بۆ سەر کوردەکان و جەخت دەکاتەوە لە سەر پشتیوانی بە هێزی

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە خەڵکی کوردی عێراق.

تکا دەکەم دەنگبدەن بەم بڕیارنامەیە.

کۆنگرێسمەن ئێسمیت:[٢١٤] جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، منیش سپاسی بەڕێز پۆرتێر دەکەم بۆ ئامادەکردنی ئەم بڕیارنامە باشە و ڕێبەرایەتیەکەی لەم پەیوەندییەدا.

بەڕێز پۆرتێر ساڵەهای ساڵە شێلگیرانە هەوڵ دەدات بۆ خستنەڕووی بارودۆخی دژواری کوردەکان کە ئێش و ئازاری زۆریان چەشتووە و سپاسی دەکەم بۆ وەبیرهێنانەوەی ساڵڕۆژی کوژرانی ٥هەزار کورد بە چەکی کیمیایی.

من قەت وێنەی ئەو دایکە کوردە لە بیر ناکەم کە منداڵە ساواکەی توند لە ئامێز گرتبوو و دەمی منداڵەکە هەروا کراوە مابووەوە و لە ئەنجامی کیمیاییەکەدا هەردوویان بە شێوازێکی ترسناک کوژرا بوون. ئەم دایک و منداڵە تەنها یەکێ لە قوربانیانی سەدام حوسەین بوون، یەک لە هەزاران. هەروەها دەمەوێت وەبیرتان بهێنمەوە کە رژێمی سەدام حوسەین درێژەدەدات بە کوشتن، ئەشکەنجەو زیندانیکردنی نایاسایی کوردەکان لە عێراق و خەڵکی دیکەی نەیاری رژێم لە شوێنەکانی دیکەی عێراق. کارمەندانی رێکخراوە فریاگوزارییە نێونەتەوەییەکانیش کە یارمەتی کوردەکان دەدەن، بوونەتە قوربانی کوشتن و بێ سەروشوێنکردنی دەوڵەتی عێراق.

جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن، لە سەرەتای دەیەی ١٩٩٠ من یەکێ لە ئەندامانی ئەو لێژنەیە بووم کە سەردانی ئوردوگای ئاوارەکانم کرد لە سەر سنووری تورکیاو عێراق و قسەم لەگەڵ گەلێ لەو کوردانە کرد کە لە سەرکوتی سەدام هەڵاتبوون. ئەم سەردانە دروست دوابەدوای شەڕی کەنداوی فارس و لە گەرماوگەرمی سەرکوتی کەمینەی کورد لە لایەن گاردی کۆماری عێراقەوە بوو. بۆ من زۆر سەرنجراکێش بوو کە ببینم چۆن سوپای ئێمە شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش ئەنجام دەدات. هێزەکانی ئێمە هاتنە ناوچە، بە رێکخستنکران و توانیان پێداویستی

لۆجیســـتیکی خوراک و دەواو دەرمان دابین بکـــەن و هەزاران کورد لە هەوڵە مرۆڤدۆستانەکانی سوپای ئەمریکا لە شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش کەڵکیان وەرگرت. پاش چەند مانگ، بارودۆخەکە ســـەقامگیر بوو و ڕێگا بۆ ئەوە هەموارکرا ڕێکخراوە ناحکوومییەکان پێداویستیەکانی کوردەکان دابین بکەن.

ئـــەو کۆمەڵکوژییە ٥هەزار کەســـییە کە لـــەم بڕیارنامەیەدا ئاماژەی پێکـــراوە تەنها یەکێ لـــە ئاڵقە گـــەورە و زۆر دڵتەزێنەکانـــی زنجیرە نەهامەتییەکانی کەمینەی کـــوردە. کەوابوو ئەمە بڕیارنامەیەکی گرنگە، تکا دەکەم پەسەند بکرێت.

## بڕیارنامەیەک بۆ دادگاییکردنی ڕێبەرانی ڕژێمی عێراق
## ئەنجوومەنی نوێنەران
## ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧

کۆنگرێسمەن گیلمان:

جەنابی ســــەرۆکی ئەنجومەن، دەمەوێــت ڕەزامەندی خۆم دەرببڕم بەنیســـبەت بڕیارنامەی ١٣٧ کە هەستی کۆنگرێس دەردەبڕێت سەبارەت بە پێویســـتبوونی دەســـتبەجێ دادگاییکردنی ڕێبەرانی ڕژێمی عێراق لە دادگای تاوانەکان بە تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی.

ئەمە دەقی بڕیارنامەکەیە:

- بە هۆی ئەوەی ڕژێمی ســـەدام حوسەین، مافی هاوولاتیانی عێراق و خەڵکی دیکەی ناوچەی بە گشتی پێشێلکردووە، لەوانە لەسێدارەدانی سەرەڕۆیانە، ئەشکەنجە و ڕەفتاری دڵڕەقانە و نامرۆڤانە، دەستگیرکردن و زیندانیکردنی ســـەرەڕۆیانە، بێ سەروشـــوێنکردن و سەرکوتی ئازادی دەربڕینی بیروڕا و هزر بە شێوازی تاکەکەسی و بە کۆمەڵ.

- بەهۆی ئەوەی ســـەدام حوســـەین و دارودەســـتەکەی بە شێوازی سیســـتماتیک هەوڵیانداوە خەڵکی کورد لە عێـــراق لە ناوببەن لەڕێگای کەڵکوەرگرتن لە چەکی کیمیایی دژی خەڵکی ســـڤیلی کورد و شـــالاوی ئەنفـــال لـــە ١٩٨٧ – ١٩٨٨ کە لە ئەنجامدا پتـــر لە ١٨٢ هەزار کەس بێســـەرو شـــوێن کراون و پتر لە ٤ هەزار گوند کاولکراون و پتر لە ١٠ میلیون مین لە کوردســـتانی عێراق چێندراون و پاکتاوی ڕەگەزی شاری کەرکووک بەردەوامە.

- بەهۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق بە ڕێبەرایەتی ســـەدام حوســـەین، عەشـــیرە تە ســـوننەکانی ڕۆژئاوای عێراقی ســـەرکوت کردووە، گوند و کنیسەی ئاشووری و کلدانیەکانی کاولکردووە، تورکمانەکانی لەسێدارەداوە و دوورخســـتوەتەوە، شـــیعەکانی بە کۆمەڵ کوشـــتووە و «شارستانی کەونـــاری زۆنگاوەکانی « لە ناو بردووە لە ڕێگای تێکدانی ژینگەی ئەم شوێنە.

- بەهــۆی ئەوەی چارەنووســـی پتر لە ٦٠٠ کوێتی هێشـــتا نادیارە کـــە لە کاتـــی جەنگی کەنداو لە لایەن رژێمی عێراقـــەوە بە دیل گیراون و نزیکـــەی هەمان ژمـــارە لە خەڵکی دیکەی کوێت لـــە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە بێ سەروشـــوێن کراون و ژمارەیەکـــی زۆر مینی نەتەقێنراو لە کوێت ماوە و ئێســـتا پاش ٦ ســـاڵ لە کوتاییپێهاتنـــی جەنگی کەنداو، دەوڵەتی عێراق قەرەبووی ئەو زەرەر وزیانانەی نەکردوە کە ســـەربازانی عێراق لە کوەیتیان داوە

- بە هۆی ئـــەوەی کۆماری عێراق جارنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ، کنڤانســـیونی نێونەتەوەیـــی مافی مەدەنی و سیاســـی، کنڤانســـیونی پێشگیری و ســـزادانی تاوانی ژێنوساید و کنڤانسیونی ١٢ ئابی ١٩٤٩ی ژنێڤ (لە بارەی شـــێوازی هەڵســـوکەوت لەگەڵ دیلەکانی جەنگ)ی واژۆ کردووە و بەرپرســـیارە لـــە بەرامبەر جێبەجێکردنی ئـــەم رێکەوتننامە نێونەتەوەییانە.

- بەهۆی ئەوەی سەدام حوسەین و رژێمەکەی کەشوهەوای ترساندن و تۆقاندنیان بەســـەر عێراق و سەراسەری ناوچەدا زاڵ کردووە لە رێگای سیاسەتی پێشلکردنی رێوشوێن و کنڤانسیۆنە نێونەتەوەییەکان.

- بەهـــۆی ئـــەوەی کۆنگرێس زۆر نیگەرانە لە پێشـــێلکردنی توند و بەردەوامـــی مافی مرۆڤ لەلایەن دەوڵەتی عێراق لـــە ژێر رێبەرایەتی و رێنوێنی سەدام حوسیندا

کەوابوو کۆنگرێسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:

١- پێشێلکردنی توندی مافی مرۆڤ لەلایەن دەوڵەتی عێراق شەرمەزار دەکات کە بووەتەهۆی هەمەگیربوونی سیستمی سەرکووت و جێگیربوونی ئەم سیستمە لە رێگای سەرکوت و ترساندن و تۆقاندنی بەرفراوان.

٢- کەڵکوەرگرتنی بەردەوامی دەوڵەتی عێراق لە هێزی ســـەربازی و چەکە کۆمەڵکوژەکان دژی هاووڵاتیانی خۆی و وڵاتانی دراوسێ شەرمەزار دەکات.

٣- سەرپێچی دەوڵەتی عێراق لە جێبەجێکردنی یاسا نێونەتەوەییەکانی

مافی مرۆڤ شـــەرمەزار دەکات، لەوانە بەشدارینەکردن و هاوکارینەکردن لەگەڵ ڕێکخراوە چاودێرە نێونەتەوەییەکان و جەخت لە سەر گرتنەبەری میکانیزمەکان بۆ رونکردنەوەی چارەنووسی زیندانیە بێ سەروشوێنکراوە کوێتیەکان دەکاتەوە.

٤- ســـەرۆک کۆمار و وەزیـــری دەرەوەی ویلایەتـــە یەکگرتووەکانی ئەمریـــکا دەبێ کار بکەن بۆ پێکهێنانـــی دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکان بە مەبەســـتی دادگاییکردن ســـەدام حوســـەین و هەموو کاربەدەستانی دیکەی عێراق کە بەرپرســـیارن لە بەرامبەر تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی، لەوانە کەڵکوەرگرتنی نایاســـایی لە هێزی سەربازی، تاوان دژی ئاشتی، تاوانەکانی دژ بە کنوانســـیونی ژنێڤ (دەربارەی شـــێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵ دیلەکانی جەنگ) و تاوانی ژینوساید.

٥- ســـەرۆک کۆمـــار و وەزیـــری دەرەوەی ئەمریکا، دەســـتبەجێ و چالاکانە هاوکاری بکەن لەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بۆ پەسەندکردنی بڕیارنامەیـــەک لـــە ئەنجوومەنی ئاسایشـــی نەتەوە یەکگرتـــووەکان بۆ پێکهێنانی دادگای تاوانە نێونەتەوەییەکان بۆ عێراق.

***

## کۆنگرێسمەن گیلمەن:

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، ئـــەم بڕیارنامەیە کـــە ئەمڕۆ لە بەر دەســـتی ئێمەدایە واتا بڕیارنامـــەی ١٣٧ی کۆنگرێس کە من و نوێنەری ئەیالەتی «ئیلۆنۆیز» و هاوسەرۆکی کۆمیتەی مافی مرۆڤ، بەڕێز پۆرتێر خستومانەتەڕوو، هەستی کۆنگرێس دەردەبڕێت بەنیسبەت پێویستبوونی دەســـتبەجێ پێکهێنانی دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکان بۆ دادگاییکردنی ســـەدام و ئەندامانی ڕێبەرایەتی ڕژێمی عێراق بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی. دەمەوێت سپاســـی بەڕێز پۆرتێر بکەم بۆ ڕێبەرایەتییەکەی لەپەیوەندی لەگەڵ ئەم مەســـەلە گرینگەدا. پێویســـتبوونی پێکهێنانی ئەم دادگایە دوای ڕووداوەکانـــی ئەم دواییـــە زۆرتر بووە. بڕیارنامـــەی ١٣٧ ئاماژە بەوە دەکات کە ســـەدام حوســـەینی دیکتاتور مافی هاووڵاتیانی عێراقی

پێشێلکردووە، لەوانە لەسێدارەدانی سەرەڕۆیانە، ئەشکەنجە، ڕەفتاری زاڵمانە و نامرۆڤایانە، دەستگیرکردن و زیندانیکردنی سەرەڕۆیانە و بێسەروشوێنکردنی خەڵک.

سەدام حوسەین هەوڵیداوە خەڵکی کوردی عێراق لە ڕێگای چەکی کیمیایی لە ناو ببات، عەشیرەتە سوننەکانی ڕۆژئاوای عێراقی سەرکووت کردووە، کنیسە و گوندەکانی ئاشووری و کلدانیەکانی کاول کردووە، تورکمانەکانی لەسێدارەداوە و شیعەکانی بە کۆمەڵ کوشتووە. سەدام هەروەها درێژە بە لەناوبردنی ژینگەی شارستانی کەوناری عەرەبە زۆنگاونشینەکان دەدات. ڕەفتارە دڕندانەکانی سەدام تەنها هاووڵاتیانی عێراق ناگرێتەوە، ئێمە ڕۆژە تاریکەکانی جەنگی کەنداو لە بیر ناکەین کە سەدام کوێتی داگیر کردبوو و خەڵکی بێ گوناحی کوێت بە ماوەی چەند مانگ بە بارمەتە گیرابوون. چارەنووسی پتر لە ٦٠٠ کوێتی کە لە کاتی شەڕی کەنداو بە دیل گیراون هێشتا نادیارە و دەوڵەتی عێراق هیچ حیسابێکیان بۆ ناکات.

کەوابوو بڕیارنامەی ١٣٧ هەستی کۆنگرێس دەردەبڕێت بۆ شەرمەزارکردنی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەلایەن دەوڵەتی عێراق و ئیدانەی سەرپێچی عێراق دەکات لە جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ کە واژۆی کردوون.

ئەم بڕیارنامەیە هەروەها پشتیوانی دەکات لە پێکهاتنی دادگای تاوانە نێونەتەوەییەکان بۆ دادگاییکردنی سەدام و داروودەستەکەی و داوا لە سەرۆک کۆمار و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دەکات چالاکانە کار بکەن بۆ پەسەندکردنی بڕیارنامەیەک لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پێکهێنانی دادگای تاوانی نێونەتەوەیی بۆ عێراق. داوا لە هاوکارانم دەکەم بە تەواوی پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە بکەن.

### کۆنگرێسمەن هاستینگز (٢١٥):

سپاسی بەڕێز پۆرتێر دەکەم بۆ هەوڵەکانی بۆ ئامادەکردنی ئەم بڕیارنامە بەوەختە و هەروەها سپاسی نوێنەری ئیندیانا، بەڕێز هامیلتۆن دەکەم بۆ دەربڕینی هەستی ئێمە لە ڕێگای ئەم بڕیارنامە تایبەتەوە.

ئێمە دژی ئەم بڕیارنامەیە نین. منیش پەیوەست دەبم بە سەرۆکی کۆنگرێس بۆ شەرمەزارکردنی عێراق بە هۆی پێشێلکردنی توندی مافی مرۆڤ. ئەوانەی کە ئەم تاوانانەیان ئەنجامداوە دەبێ لە دادگای تاوانی نێونەتەوەیی دادگایی بکرێن، هەروەها کە ئەم بڕیارنامە بە دروستی ئاماژەی پێکردووە. بەڵام پرسیاری من و گەلێ لە هاوکارانم ئەوەیە کە ئایا ئەم بڕیارنامەیە ئەوەندە کاریگەری هەیە؟ بڕیارنامەکە داوای دادگاییکردنی سەدام دەکات لە دادگایەکی نێونەتەوەییدا، بەڵام پێمان ناڵێت ئێمە لێرەوە چۆن دەتوانین شتێکی وابکەین. نیگەرانی سەرەکی من ئەوەیە کە ئەم بڕیارنامە کۆمەڵێک چاوەڕوانی دروست دەکات، بەتایبەت لە کوێت بۆ ئەوەی ئەم دادگایە پێکبێت، بەڵام ئێمە تا ئێستا بەکردەوە نەمانتوانیوە دادگایەکی وا پێکبهێنین. بە هەرحاڵ من بەتەواوی پشتیوانی لەم بڕیارنامەیە دەکەم. ئەم بڕیارنامەیە داوا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات کار بکات بۆ پەسەندکردنی بڕیارنامەیەک لە نەتەوە یەگرتووەکان بۆ پێکهاتنی دادگای تاوانی نێونەتەوەیی بۆ عێراق. هیوادارم ئێمە بەردەوام هەوڵ بدەین بۆ ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات.

### کۆنگرێسمەن پۆرتێر:

بە لەبەرچاو گرتنی ئەو شتانەی کە ئێستا لە عێراق ڕوودەدات ئەم بڕیارنامەیەی بەردەستمان ناتوانێت بڕیارنامەیەکی نوێ بێت. جارێکی دیکە سەدام حوسەین سیمای ڕاستەقینەی خۆی وەک دیکتاتۆرێکی دڵڕەق نیشاندا کە دەیەوێت هەموو کارێک بکات بۆ ئەوەی لە دەستی گەمارۆکان و پشکنینەکانی چەکە کۆمەڵکوژەکان ڕزگاری بێت. جەنابی

سەرۆک بەداخەوە من لە سەردەمێکدا گەورە بووم کە سەردەمی دیکتاتۆرە دڵڕەقەکان (هیتلەر، مۆســولینی و ستالین) بوو. ئەمانە کەسانێک بوون کــە تاوانگەلــی بەزماننەهاتوویان دژی خەڵکی خۆیــان و کەمینەکانی خۆیان ئەنجامدا. رژێمی عێراقیش لە شێوەی هەمان حکومەتی ئاڵمانیای نازی، ئیتالیای فاشیست و یەکێتی سۆفیەتی کومونیستی ژێر دەسەلاتی ســتالینە. ئێمە دەبێت هەر ئێستا سەدام حوسەین رابوەستێنین، دەبێ گۆشــەگیری بکەین و دڵنیابین لەوەی کە جیهان پەی بە سروشتی ئەم رژێمە دڵڕەقە بردووە. ئێمە دەبێ لەوە دڵنیابین کە ســەدام حوسەین و هەموو ئەندامانی داروەدەســتەکەی وەک تاوانبارانی جەنگ و کەســانێک کە تاوانی دژی مرۆڤایەتیان ئەنجامداوە، بناســرێن. من خۆشــحاڵم کە یەکێ لە پشــتیوانە ســەرەکییەکانی ئەم بڕیارنامەیە بووم بۆ سپاردنی ســەدام بە دەســتی دادپەروەری بە هۆی ئەو تاوانانە کە دژی خەڵکی عێــراق و هاوولاتیانی ولاتانی دیکە ئەنجامیداوە، لەوانە خەڵکی ئەمریکا. کوردەکان، عەرەبە زۆنگاونشــینەکان، کەمینەی ئاشــووری، ئەندامانی کۆنگرێســی نیشــتمانی عێراق و دیلە کویتیەکانــی جەنگ، تەنها چەند نمونەیەک لە قوربانیانی سەدام و رژێمە دڵڕەقەکەینی.

جەنابی ســەرۆکی ئەنجومەن، ســەدام چەکی کیمیایی دژی خەڵکی خــۆی بەکارهێناوە. لە ســاڵی ١٩٨٨، ٨ هەزار کورد لــە هەڵەبجە لە ئەنجامی هێرشی سەدام بە چەکی کیمیایی (کە خۆی بەرهەمی هێنابوو) کوژران[٢١٦]. ئێستا ئێمە لە عێراقداین و هەوڵ دەدین ئەوە روون بکەینەوە کە ئایا ئەم چەکانە لە عێراقدا ماون و بەتایبەت چەکی کیمیایی VX کە هەروەک کیمیایی ســارین دەتوانێ خەڵک بکوژێت بە هەمان شێوە کە کوردەکانی عێراقی لە هەڵەبجە کوشــت. بە بیروبۆچوونی من سەدام بێ هیچ گومانێک تاوانی دژی مرۆڤایەتی و تاوانی دژی ئاشتی ئەنجامداوە و یاساکانی مافی مرۆڤی بە توندی پێشێلکردووە. ئەگەر ئەمڕۆ تەنها یەک کــەس لە جیهاندا هەبێت کە حەقبێ بدرێتە دەســتی دادپەروەری، ئەو کەسە سەدام حوسەینە.

من پیرۆزبایی ئەم بڕیارنامەیە لە هاوکارانم دەکەم و داوا لە هەموویان دەکـــەم پەیوەســـت بن بە من بۆ ئـــەوەی پەیامێکی بەهێـــز بنێرین بۆ سەدام حوسەین و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە بارەی ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تاوانەکانی ســـەدامی لە بیر نەکردووە و ئێمە بە بەرپرســـیاری دەزانین بۆ ئەم پێشلکارییانە و داوای دادپەروەری دەکەین بۆ قوربانیەکانی.

جەنابـــی ســـەرۆکی ئەنجومەن، ئێســـتا تورکیا و عێـــراق بەیەکەوە هێرش دەکەنە ســـەر کـــوردەکان لە باکووری عێـــراق. تورکیا بە دەیان هەزار ســـەربازی تایبەت، سنووری عێراق دەبەزێنێ و بە بۆمبی ناپاڵم و هێشوویی هێرشدەکاتە ســـەر کوردەکانی خۆی کە لە تورکیا هەڵاتوون. عێراقیـــش لەو لاوە هەروا دەکات. هەردوویان ئێســـتا کوردەکانی خۆیان دەچەوســـێننەوە. هەمووی ئەو وڵاتانەی کە کورد تێیدا دەژین واتا ئێران و عێراق و تورکیا و ســـوریا کەمینەی کورد دەچەوســـێننەوە. هەموویان کوردەکان دژی یەکدی هاندەدەن و هەوڵدەدەن بەم شێوەیە سەرکووتیان بکـــەن و هەموویـــان بە خەڵکی کورد دەڵێن تروریســـت، لە کاتێکدا کە کوردەکان تەنها داوای مافە سەرەتاییەکانی خۆیان دەکەن و تەنها خۆیان لە بەرامبەر چەوساندنەوەدا دەپارێزن.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، ئەم چەوساندنەوەیە دەبێ کۆتاییپێبێت، کورد تیرۆریســـت نییە، لەوانەیە هەندێ کەس لە سەر ئەو باوەڕە بن کە ئیللا کوردەکان تروریســـتن بەڵام کوردەکان تروریســـت نین، کوردەکان تەنهـــا داوای مافی خۆیان دەکـــەن، ئەو مافەی کـــە دەوڵەتی تورکیا، دەوڵەتی ئێران، دەوڵەتی ســـوریا و ڕژێمی ســـەدام حوسەین لە عێراق لێیانی زەوتکردووە. ئەو دەوڵەتانە تروریســـتن کە کوردەکان سەرکووت دەکەن، ئەو دەوڵەتانە تروریستن کە مافە سەرەتاییەکانی کوردەکان زەوت دەکەن و لە ناو کۆمەڵگای خۆیاندا ڕێزیان لێناگرن و هەموو ڕۆژێ خۆیان و منداڵەکانیـــان دەکوژن و هەوڵـــدەدەن کوردەکان لە کۆمەڵگای خۆیان دەربکەن. جەنابی سەرۆک، تروریستی ڕاستەقینە ئەم دەوڵەتانەن.

سەردەستەی ئەم دەوڵەتانە، سەدام حوسەینە کە رژێمەکەی وەڵامی هیچ کەس ناداتەوە و حیساب بۆ گوشاری بیروڕای گشتی و بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ناکات. ئێستا کاتی ئەوەیە کە ئەم رژیمە گۆشـــەگیر بکەین، کاتی ئەوەیە ڕابگەیەنین سەدام کێیە، ســـەدام کەســـێکە کە تاوانی دژی مرۆڤایەتی ئەنجامداوە کە هەموومان نەفرەتی لێدەکەین، ئێستا کاتی ئەوەیە رووی ڕاستەقینەی سەدام نیشان بدەین و دادگایی بکەین و لەســـەر دەســـەڵات لایببەین و دەوڵەتێک لە عێراق پێکبهێنین کە لەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و دراوســـێکانی بە ئاشـــتی بژی و پێش بەم رژیمە دیکتاتـــورە خوێنرێژە دڵڕەقە بگرین بۆ سەرکوتی زیاتری خەڵکەکەی و هەڕەشەکردن لە دراوسێکانی.

**کۆنگرێسمەن لانتۆس:**

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، سپاســـی هاوسەرۆکی (سەربە پارتی کۆماری) کۆمیتەی مافی مرۆڤی کۆنگرێس و نوێنەری ئەیالەتی ئیلۆنۆیز، بەڕێز پۆرتێر دەکەم بۆ لێدوانە بەهێز و پاراوەکەی و هەروەها سوپاســـی ســـەرۆکی کومیتەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان دەکەم بۆ خەباتە بێ وچانەکەی بۆ مافی مرۆڤ و ئامادەکردنی بڕیارنامەی ١٣٧ من بەتەواوی لەگەڵ ئەو وتانەدام کە ســـەبارەت بە سەدام و رژیمە سەرکوتکەرەکەی هێنایە سەر زمان.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، هەر ئێستا کەسانێک هەن لە رۆژئاوا کە داکۆکی لە ســـەدام و رژێمە دڕندەو دڵڕەقەی دەکەن. هەندێک لە وڵاتانی رۆژئاوا هەن کە ناتوانن لە بازرگانیە پڕ ڕەونەق و بەرفراوانەکەیان لەگەڵ عێراق چاوپۆشی بکەن، سەرەڕای ئەو ڕاستیە کە رژێمی سەدام حوسەین هەوڵیداوە پێشکەوتنە بەردەوامەکانی خۆی لە بواری بەرهەمهێنانی چەکە کۆمەڵکوژەکان بشارێتەوە و بە درۆی بخاتەوە و حاشای لێبکات.

پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆ کۆنگرێس هەلی ئەوەی بۆدەڕەخسێت بڕیارنامەیەک تاوتـــوێ بکات کە روانگەی کۆنگرێس دەردەبڕێت ســـەبارەت بەوەی کە

ئەگەر ڕێگا ئاشتیخوازانە و دیپلۆماتیکەکان سەرنەکەوت دەبێ ڕێگاچارەی سەربازی (باشتر ئەوەیە لە ڕێگای هاوپەیمانییەکی نێونەتەوەییەوە بێت) بەکارببرێت بۆ لەناوبردنی توانایی کیمیایی، بیولوژیکی، ناوکی و موشەکی سـەدام حوسەین. بەڵام ئەم مەسەلەیە لە هەمان کاتدا کە مەسەلەیەکی سەربازییە، پەیوەندی بە مافی مرۆڤیشەوە هەیە.

ڕژێمێک کە بە چەکی کیمیایی هێرشـیکردووتە سەر خەڵکی خۆی، ڕژێمێـک کە خراپتریـن و توندترین پێشـێلکارییەکانی مافی مرۆڤی لە سـەدەی ٢٠ دژ بە خەڵکی خۆی ئەنجامداوە دەبێ ڕاکێشـی دادگایەکی نێونەتەوەیـی بکرێت و بە تاوانی دژی مرۆڤایەتی دادگایی بکرێت. ئەگەر تەنها یەک کەسـی سـەرەکی هەبێت کە دەبێ لـە بەرامبەر کۆمەڵگای نێونەتەوەیـی بە تاوانـی دژی مرۆڤایەتی دادگایی بکرێت، ئەو کەسـە سـەدام حوسەینە. دڕندەیی، دڵڕەقی و بەخوێن تینووبوونی سەدام هیچ سنوورێک ناناسێ. داوا لە هەموو هاوکارانم دەکەم پشتیوانی لە هەنگاوە گرنگەکانی ئەم بڕیارنامەیە بکەن.

**کۆنگرێسمەن وڵف:**

جەنابی سـەرۆکی ئەنجومـەن، من بە توندی پشـتیوانی دەکەم لە بڕیارنامەی ١٣٧ی کۆنگرێس کە دەوڵەتی عێراق شەرمەزار دەکات بە هۆی سەرکوتکردنی بەردەوام و ترساندن و تۆقاندنی کوردەکان. بەداخەوە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا، ڕۆژئاوا سەرنجی بە کەشوهەوای ترساندن و تۆقاندنی سـەدام نەداوە، بەڵام لە ڕێگای ئـەم بڕیارنامەیە و هەوڵی خـودی کوردەکان، خەڵک زۆرتر سـەرنجی پێدەدات. ئـەم بڕیارنامەیە پێکهاتنی دادگای تاوانەکانی جەنگ هان دەدات بۆ دادگاییکردنی سەدام حوسـەین و کاربەدەستانی دیکەی دەوڵەتی عێراق بە هۆی تاوانەکانیان دژ بە مرۆڤایەتی.

دەمەوێت سپاسـی بەڕێز پۆرتێر و بەڕێز گیلمان و ئەندامانی دیکەی پشـتیوانی ئەم بڕیارنامەیە بکەم. خۆشبختانە ئەم بڕیارنامەیە نە تەنها پەیامێکـە بۆ خەڵکی ئەمریـکا، بەڵکو پەیامێکە بـۆ خەڵکی کورد لە

سەراســەری جیهان و بەتایبەت خەڵکی ناوچە کە کۆنگرێســی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریــکا واتا خانووی خەڵکی ئەمریکا زۆر زۆر بەوردی چاودێری دەکات بە سەر بارودۆخەکەدا.

دەوڵەتی عێراق دەوڵەتێکی خراپە، ســەدام حوســەین دیکتاتۆرێکی دڕندەیە کە لە بیری هیچدا نییە جگە لە پاراســتنی دەســەڵاتی خۆی. ســەدام خەڵکی عێراقی چەوســاندووە و ســەرکووت کردووە و لەگەڵ رۆژئاوا کەوتووەتە ناو کایەکی مەترسیدار. سەدام لە کوشتنی ئەندامانی بنەماڵەی خۆی ســڵ ناکات کە راســتیەکانی رەفتارە دڕندەکانی ئەویان درکاندووە یان هەڕەشەیان لە دەسەڵاتەکەی کردووە.

ســەدام بە شوێن ئەوەدایە کوردەکانی باکووری عێراق پاکتاو بکات کە بە هۆی بارودۆخە جوگرافیایەکەیــان گیریان خواردووە. کوردەکانی باکووری عێراق هیچ شوێنکیان نییە تا لەم بارودۆخە زۆر خراپە هەڵبێن و بچنە ئەو شوێنە. کوردەکان کوژراون و ئێستاش دەکوژرێن، زیندانیکراون و ئێستاش زیندانی دەکرێن، ئەشکەنجەدراون و ئێستاش ئەشکەنجە دەدرێن و سەرکووت کراون و ئێســتاش هەر سەرکووت دەکرێن. خۆشبختانە لە رێگای ئەم بڕیارنامەیە ئەو پەیامە دەدرێت بە سەدام کە رۆژئاوا ئاگاداری کردەوەکانیەتــی و ئەو پەیامــەش دەگەیەنێت بە کوردەکان کە ئێمە بە وردی ئاگاداری بارودۆخەکەیانین و پشتیوانیان لێدەکەین.

## ئاسەوارەکانی کارەساتی هەڵەبجە
## لە زمانی پزشکێکی رۆژئاواییەوە

**ئەنجومەنی نوێنەران**

**١٧ی ئاداری ١٩٩٨**

کۆنگرێسمەن گینگریچ:(٢١٧) جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، (لە ساڵیادی کیمیاباران هەڵەبجەدا) داوا دەکەم وتارێکی دۆکتۆر کریستیەن گوسدێن بخرێتە بەردەستی هاوکارانم کە ١١ی ئاداری ١٩٩٨ لە رۆژنامەی «واشینگتۆن پۆست» دا بڵاو بوەتەوە. ئەم وتارە یارمەتی دەدات بە تێگەیشتن لە کاریگەرە مەترسیدارەکانی چەکی کیمیایی و بیۆلۆژیکی، بە روونی نیشانی دەدات کە سەدام حوسەین بووە بە مەترسییەکی هەمیشەیی بۆ هەسارەی زەوی. نابێ قەت نەهامەتیەکانی کارەساتی هەڵەبجە لەبیر بکەین، نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە سەدام ویستویەتی نەتەنها هێزەکانی ئێران بەڵکوو خەڵکی خۆشی تووشی کاریگەریە کارەساتبارەکانی چەکی کیمیایی و بیۆلۆژیکی بکات.

**ئەمەش دەقی وتارەکەیە:**

### بۆ رۆیشتم؟ چیم بینی؟
### کریستیەن گۆسدێن (٢١٨)

**١١ی ئاداری ١٩٩٨**

**واشینگتۆن پۆست**

پێشەکی: لەمێژە ئێمە بەخوێنساردییەوە لە بارەی «چەکە کۆمەڵکوژەکان» قسە دەکەین، دەستەواژەیەک کە واتا و گرنگی راستەقینەی خۆی لەدەستداوە، وەک» کاولکاری ناوکی» و جەنگی کیمیایی و بیۆلۆژیکی»

لێهاتووه، دەستەواژەیەکە کە تەنها لە سەر کاخەزی دەوڵەتەکاندا ماوە و پسپۆڕان و سیاسەتمەدارەکان باسی دەکەن. وایلێهاتووە کە خەڵک ئیدی هەستی بیزاری خۆی لەو جۆرە چەکانە دەربڕێت.

رۆژی یەکشـــەمەی دوو حەفتە لەمەو پێش بەرنامەی «٦٠ خولەک» دەســـتێکرد بە گۆڕینی ئەو راســـتییە کە باسم کرد و بەسەرهاتی شاری هەڵەبجەی عێراقی بڵاو کردەوە، ١٠ ساڵ پاش ئەوە کە سەدام حوسەین بە چەکی کیمیایی هێرشـــی کردە سەر دانیشـــتوانی سڤیلی ئەو شارە. زۆربـــەی خەڵکی هەڵەبجە کوردن و لە کاتی شـــەڕی ئێـــران و عێراقدا لایەنگری ئێران بوون. سەدام خەڵکەکەی خۆی کیمیاباران کرد بۆ ئەوەی تۆڵەی ئەو هاوســـۆزییە لەگەڵ ئێرانیان لێبســـێنێتەوە. بەرنامەی «٦٠ خولـــەک» ئەو فیلـــم و وێنانەی بڵاو کردەوە کە گەویـــن رۆبیرتز، فیلم دەرهێنەری بریتانیایی لە ١٩٨٨ و ١٩٨٩ گرتبوونی.

ســـتافی بەرنامـــەی ٦٠ خولەک هەروەهـــا یارمەتیاندا لەگەڵ زۆر بەڕێز دوکتۆر کریستیەن گوسدێن، پزشکی پسپۆڕی بریتانیایی ئاشنابین کە هەوڵیداوە یارمەتی خەڵکی هەڵەبجە بدات. دوکتۆر گوسدێن ١٠ ساڵ پاش کیمیابارانەکە رۆیشـــتووە بۆ هەڵەبجە و دەیەوێت ئەو شتانەمان بۆ باس بکات کە بە چاوی خۆی لە عێراق بینیویەتی. خەڵکی سەراســـەری جیهـــان وێنـــەی قوربانیە شـــێواوەکانی بۆمبارانی ناوکی هیروشـــیما و ناکازاکییان بینیوە، ئەو بۆمبارانە بووە هۆی ئەوەی کە خەڵک لەبەرامبەر بەکارهێنانی چەکی ناوکی هەڵوێســـت بگـــرن. لەوانەیە ئەگەر بەڵگە و وێنەی راســـتەقینەی زیاترمان لە بارەی کاریگەرییەکانی بۆمبی کیمیایی لەســـەر مرۆڤ لە دەستدابێت باشتر بتوانین کاریگەریەکانی ئەو چەکانە بە درێژایی کات بەراوەرد بکەین.

لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ ســـوپای عێراق هەڵیکوتایە سەر هەڵەبجە (کە شـــارۆچکەیەکی کوردنشـــینی ٤٥ هەزار کەسییە لە باکوری عێراق) و بۆ یەکەمجار گەورەترین هێرشی کیمیایی دژی خەڵکی سڤیل ئەنجامدا. ئەو کیمیایە کە لە هەڵەبجە بەکاربرا تێکەڵێک بوو لە گازی دەمار، ســـارین،

تابون، VX و موســـتارد کە پێســـت، چاو، لوت، قورگ و ســـییەکانی مرۆڤ دەســـوتێنێت. ئەو کیمیاییە کە درا لە خەڵکی هەڵەبجە، پێست و تەنانەت جلوبەرگی خەڵکەکەی ســـووتاند، چاو و ئەندامی هەناسەدانی خەڵکەکەی تێکدا و ئاو و خواردەمەنی خەڵکەکەی ژەهراوی کرد.

کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵک خێرا دوای کیمیابارانەکە مردن کە ژمارەیان نزیکـــەی ٥ هەزار کەس خەملێندراوە. ژمارەیەکی کەم لە بریندارەکان لە نەخۆشخانەکانی ئەمریکا، ولاتانی ئوروپایی و ئێران تیمار کران، زۆربەیان گەڕانـــەوە بۆ هەڵەبجە و لەو کاتەوە تا ئێســـتا هیچ تیمێکی پزشـــکی عێراقی، ئوروپایی یان ئەمریکایی یان تیمێکی رێکخراوە نێونەتەوەییەکان لێکۆڵینەوەی کورتخایەن یان درێژخایەنی دەربارەی کاریگەرییەکانی ئەو هێرشە کیمیاییە نەکردووە. گەوین رۆبیرتز فیلمێکی بەناوی «شنەبای مەرگ» لە بارەی هێرشەکەی ١٩٨٨ دروستکردوە کە خەلات کراوە[٢١٩]. من فیلمەکەم بینی و یەکجار زۆر کاری تێکردم. گەوین لە ١٩٩٧ دیسان ســـەردانی هەڵەبجەی کـــردەوە و بینی کە خەڵکەکەی زۆر نەخۆشـــن. نەیدەزانـــی بۆ کەس هەوڵینەداوە تێبگات کە چی بەســـەر ئەو خەڵکەدا هاتووە. گەوین قەناعەتی پێهێنام کە من هەوڵ بدەم لەوە تێبگەم.

بۆ دەبێت ژنێکی پرۆفیســـۆری پســـپۆڕی نەخۆشـــییە ژنیتیکەکان بیەوێت سەفەرێکی وا بکات؟. من بۆ ئەوە چووم فێربم و یارمەتی خەڵک بـــدەم. یەکەمجار بوو لە مێژوودا کە چەکـــی جۆراوجۆری کیمیایی دژی ژمارەیەکی ئەوەندە زۆری خەڵکی ســـڤیل بەکاربربردرێت. من دەمەویست سروشت و رەهەندەکانی ئەو گیروگرفتانە ببینم کە ئەم خەڵکە لەگەڵی رووبەڕوو بوون. ١٠ ســـاڵ پاش کیمیابارانی هەڵەبجە هێشتا هیچ کەس و رێکخراوێکی یارمەتیدەر سەردانی هەڵەبجەی نەکردبوو بۆ ئەوەی بزانێت ئەو چەکانە چی کاریگەرییەکیان بووە.

ئەو بەشە پزشکیە کە من پسپۆڕی بووم پەیوەندی راستەوخۆی بەو بابەتەوە هەبوو، من زیاتر لە بارەی هۆکارە ســـەرەکیەکانی نەخۆشـــییە زگماکیەکان وەک منداڵدارنەبوون و شێرپەنجە، لەوانە شێرپەنجەی مەمک،

هێلکەدان، پرۆتستات و کۆلۆن لێکۆڵینەوە دەکەم. پێشتر بەتایبەت لە بارەی کاریگەرییەکانی ئەو نەخۆشـیانە لە سەر ژن و منداڵ لێکۆڵینەوەم دەکرد. ئەو زانیارییە پزشـکیانە کە پێشتر لە بارەی قوربانیانی چەکی کیمیایی و گازی موسـتارد لەدەستدا بوو دەربارەی ئەو پیاوانە بوو کە سەرباز بوون. چەکی کیمیایی پێشتر لە هیچ شوێنێک بە قەت هەڵەبجە دژی خەڵکی سڤیل بەکارنەهاتبوو.

ئـەوەی کـە لە هەڵەبجـە بینیم زۆر لـەوە خراپتر بـوو کە بیرم لێدەکردەوە. پاش تیپەڕبوونی ١٠ ساڵ، کیمیاییەکە کاریگەرییەکی زۆری کردبووە سـەر چاو و هەناسـە و دەماری خەڵکەکـە. زۆرێک لە خەڵک کوێر ببوون، پێسـتیان سووتابوو و وردەوردە توشی شێرپەنجەی پێست دەبـوون. من بە یارمەتـی دکتۆرەکانی خەڵکی ئـەو ناوچەیە ڕێژەی تووشبوون بە نەخۆشیگەلێک وەک منداڵدارنەبوون، ناتەواو بەدنیاهاتنی منداڵ و شێرپەنجە ( لەوانە شێرپەنجەی پێست، سەر، مل، هەناسەدان، هەناو، مەمک و شـێرپەنجەی منداڵان) لە ناو خەڵکی هەڵەبجە (کە کاتی کیمیابارانەکـە لەوێ بـوون) لەگەڵ خەڵکی ناوچەیەکـی دیکە کە بەر کیمیاییەکە نەکەوتبون بەراوەرد کرد.

ئێمە بەو ئەنجامە گەیشـتین کە ڕێژەی تووشبوونی خەڵکی هەڵەبجە بەو نەخۆشـیانە سـێ قات و چوار قاتی خەڵکی شـوێنەکانی دیکەیە، سـەرەڕای ئـەوەش کە ١٠ سـاڵ بەسـەر کیمیابارانەکـەدا تێپەڕیوە. هەموو سـاڵێک ژمارەی ئەو منداڵانە زیاتر دەبێت کە بە هۆی نەخۆشی leukemias و lymphomas دەمـرن. جوانەکانی هەڵەبجە لە جوانی شـوێنەکانی دیکە زیاتر توشی شـێرپەنجە دەبن و گەلێک کەس tumeur ی زۆر خراپیـان هەیە، بۆیە ڕێژەی مردن لە نیویاندا زۆرە. تەداوی رادیۆلۆژی یان شـیمۆترافی لە ناوچەی هەڵەبجە نییە. هەروەها دەزگای نەشـتەرگەری راوەسـتانی دڵ و تەداویکردنی لێوی کەروێشکی و دەمی زل و نەخۆشـیەکانی دیکەی منـداڵان لە هەڵەبجە نییە، بۆیە منداڵەکانـی هەڵەبجە بەهۆی راوەسـتانێکی دڵ دمرن، لەکاتێکدا کە لە

بریتانیـــا و ئەمریکا ئەو جۆرە نەخۆشـــیانە دەکرێت بە نەشـــتەرگەریی چارەســـەر بکرێت. زۆرم پێناخۆش بوو کە ئەو منداڵە جوانانەم بینی کە دەموچاویان بەهۆی لێوی کەروێشکی و دەمی زلەوە تێکچووبوو لەکاتێکدا کـــە هەموو رۆژێک لە باکوری ئەمریکا و ئوروپا ئەو جۆرە نەخۆشـــیانە بەدەستی دۆکتۆری نەشتەرگەری شارەزا چارەسەر دەکرێن.

کاریگەرییەکانـــی کیمیاییەکـــە لـــە ســـەر دەروون و دەماری خەڵک وەک کارەســـاتێکی مرۆڤی لە هەموو شـــەقام، ماڵ و نەخۆشخانەیەکی هەڵەبجەدا دەبینرێت. خەڵک تووشـــی خەمۆکـــی و بێ هیوایی بوونە و رێژەی مەیل بۆ خۆکوشـــتن لە نێویاندا زۆرە. پزیشکەکان زۆر جار گولە لە لاشـــەی ئەو کەســـانە دردێنن کە هەوڵیانداوە خۆیـــان بکوژن بەڵام هەوڵەکەیان ســـەرنەکەتووە. دکتورەکانی «نەخۆشخانەی شەهیدان»ی هەڵەبجـــە دەیانگوت ناتوانن ئەو نەخۆشـــانە ببینینن کە باری دەروونی و دەماریـــان تەواو نییە، چونکە دەزگا و پێداویســـتیەکانی تەداویکردنی ئەو نەخۆشـــیانەیان نییە. گەلێک کەس باری دەمارەکانیان تەواو نییە و تووشی نەخۆشی دەماری درێژخایەن بوونە.

لە رۆژی یەکەمی ســـەردانەکەمدا لە بەشی ژنان و لەدایکبوونی منداڵ لە نەخۆشـــخانەی شەهیدانی هەڵەبجە هیچ ژنێکم نەبینی کە منداڵەکەی ئاسایی لەدایکبێت و پێشتر لەوەش هیچ منداڵێک ئاسایی لەدایک نەبووە، ســـێ ژن منداڵەکەیان لەبارچووبوو. پزیشـــک و پەرەستارەکانی بەشی منداڵبوون دەیانگوت کە ژمارەیەکی زۆر لە منداڵەکان بە شێواوی لەدایک دەبن. ژمارەیەکی زۆر کۆرپە لە ســـکی دایکیانـــدا دەمرن و ژمارەیەکی زۆری دیکە یەکســـەر پاش لەدایکبوون دەمرن. رێـــژەی ئەو گیروگرفتە لە نێو ژنەکانی هەڵەبجە چوار قاتی ژنەکانی شـــاری سلێمانییە رێژەی ئـــەو منداڵانە کە چەند ســـاڵ دوای کیمیابارانەکە بە شـــێواوی لەدایک دەبن نیشـــان دەدات کە کاریگەرییەکانی ماددەە کیمیاییەکە لە نەوەیەک دەگوازرێتەوە بۆ نەوەیەکی دیکە.

ناتەواو بەدنیاهاتنی منداڵ، مردنی منداڵ و منداڵدارنەبوون بە واتای

ئەوەیـــە کە ژیان لە کۆمەڵگای هەڵەبجە تازە نابێتەوە. خەڵکی هەڵەبجە هیوایان ئەوە بوو کە پاش کیمیابارانەکە منداڵیان بێت و جێگای کەسوکارە لەناوچووەکەیان پڕ بکەنەوە و کۆمەڵگاکەیان ســـەرلەنوێ بنیاتبنێنەوە بەڵام کە بینیان ئەوەیان بۆ ناچێتەسەر، ئەوەندەی دیکە تێکچوون، ژیان و هیواکانیان مرد. یەکێ لە شـــایەتحاڵەکانی کیمیابارانەکە دەیگێڕایەوە کە کاتی کیمیابارانەکە لەگەڵ ١٠٠ کەسی دیکەدا لە ژێرزەمینێکدا بووە کە هەموویان مردوون. ئەوانە کە لە کیمیابارانەکە رزگاریان بووە نەتەنها ناچارن شـــەو و رۆژ لەگەڵ بیرەوەری کەســـوکارەکەیان بژین کە لەناکاو لە باوەشـــیاندا گیانیان دەرچوو، بەڵکوو ناچارن لەگەل نەخۆشیەکانی خۆیان و دۆست و خزم و کەسوکارەکانیشیان بژین.

ئەو نەخۆشـــیە زگماکییانە کە خەڵکی هەڵەبجە تووشـــی هاتوون لە نەخۆشیەکانی ئەو خەڵکە دەچێت کە کیلۆمەترێک، دوو کیلۆمەتر دورتر لە ســـەنتەری شـــاری هیروشـــیما و ناکازاکی دەژیان لە کاتی بومبارانە ناوکیەکـــەدا. ئـــەو گازە کیمیایانـــە، بەتایبەت گازی موســـتارد کە لە هەڵەبجەدا بەکارهاتووە کاریگەرییەکی هاوشـــێوەی بومبە ناوکیەکەی هیروشیما و ناکازاکی لە سەر جەستەی خەڵک بووە.

رۆژێک پێش ئەوەی بگەمە هەڵەبجە لە رادیۆدا بانگەواز کرابوو ئەوانە کە نەخۆشن و دەیانەوێت نەخۆشییەکەیان دەستنیشان بکرێت سەردانی نەخۆشـــخانە بکەن. رۆژی یەکەم ٧٠٠ کەس هاتبوون کە ٤٩٥ کەسیان دوو- ســـێ نەخۆشـــیان هەبوو. بینینی ئەو نەخۆشـــانە زۆر خەمباری کردم.

خەڵکی هەڵەبجە پێویســـتیان بە یارمەتی خێرا هەیە، پێویســـتیان بە پزیشکی پســـپۆڕ و دەواودەرمان و کەرەستەی پێشکەتووی پزیشکی هەیە، تەنانەت پێویســـتیان بە ئاوی خواردنـــەوەی خاوێن هەیە، دەبێ لەبەرامبەر هێرشـــێکی هاوشـــێوە لە داهاتودا بپارێزرێن. پزشـــکەکانی هەڵەبجە زانیاریەکی ئەوتۆیان بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ قوربانیانی هەڵەبجە نییە. دەبێ بەدیقەتەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ قوربانیەکان بکرێت،

چونکە چەند جۆر گازی کیمیایی توکسید لێیداون.

ئەو وێنانە کە پاش کیمیابارانی ١٩٨٨ لە رۆژنامە و تەلەڤزیۆنەکاندا بڵاو بوەوە ترسـناک بـوون. وێنەیەکیان هی باوکێک بوو کە باوەشـی کردبوو بە دوو کورە سـاوا دوانەکەیدا بـۆ ئەوەی کیمیایی نەیانگرێت. ئـەو پەیکەرەیە کە ئێسـتا لە دەروازەی هەڵەبجـە دانراوە، وێنەی ئەو پیاوەیـە. ئـەو پەیکەرەیە پەیکەرەی بەردین یان ئاڵتونی کەسـێک نییە کە راوەسـتابێت بۆ ئەوەی سەرکەوتن و داگیرکارییە سەربازیەکانی نیشان بدات بەڵکوو پەیکەرەی کەسێکە کە باوەشی کردووە بە خاکدا بۆ ئەوەی منداڵەکانی لە مەرگ رزگار بکات. ئەو دیمەنە کاریگەرییەکی قوڵ و درێژخایەنی کردەسەرم، کاتێک چوومە ناو شاری هەڵەبجە و بارودۆخی شارم بینی و وەک مۆتەکەیەک باڵی کێشا بەسەرمدا.

ئاسان نیە بتوانم ئەو مۆتەکەیە لە خۆم دوور بخەمەوە، دەهاتەبەرچاوم کاتێک خەڵکم دەبینی، بەسـەرهاتەکەیانم دەبێسـت و دەمبینی کە بە هۆی کیمیابارانەکە تووشی چی نەخۆشیگەلێکی درێژخایەن بوونە. وێنە ترسـناکەکانی خەڵکی هەڵەبجە و ئەو بارودۆخـە کە تێیدان، بەردەوام شـەو دێتە خەوم و مێشکمی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە. لەوانەیە ئەم بیرکردنەوەیـە ببێتەهـۆی ئەوەی کە قەت لە بیـرم نەچێت کە ئەرکی سەرەکیمان ئەوەیە کە هەوڵ بدەین و یارمەتی خەڵکی هەڵەبجە بدەین.

## دادگاییکردنی سەدام حوسەین بە تاوانی کاری دژەمرۆڤایەتی
## ئەنجومەنی پیران
## ١٢ی ئاداری ١٩٩٨

ســـناتۆر ســـپێکتێر:[٢٢٠] جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، بڕیارنامەی ٧٨ لەلایەن من و ســـناتۆر دۆرگان[٢٢١] پێشـــنیارکراوە بۆ سکاڵاکردن و دادگاییکردنی ســـەدام حوســـەین بە تاوانی جەنگ و تاوانەکانی دیکەی دژ بە مرۆڤایەتی. بۆ ئەوەی بە خێراترین شـــێوە بچمە ناو بڕیارنامەکە، ئاماژە بە بڕگەیەکی دەکەم کە دەڵێت سەرۆک کۆمار دەبێ:

١- داوای پێکهاتنـــی کومیســـیونێک بکات لە بـــن چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ لێپرسینەوەی نێونەتەوەیی لەگەڵ تاوانەکانی سەدام و کاربەدەستانی دیکەی عێراق

٢- داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان بکات دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکان پێکبهێنێت بە مەبەستی سکاڵاکردن و دادگاییکردن و زیندانیکردنی سەدام حوســـەین و کاربەدەســـتانی دیکەی عێراق کە تاوانـــی دژە مرۆڤایەتی، تاوانی ژینوســـاید و پێشـــێلکارییەکانی دیکەی یاسا نێونەتەوەییەکانیان ئەنجامداوە.

٣- هەنگاوی پێویست هەڵبگریت بۆ پێکهاتنی دادگایەکی ئەوتۆ (دادگای تاوانـــە نێونەتەوەییەکان)، لەوانە تەرخانکردنی پارە و بەدەســـتهێنانی پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ سپاردنی سەدام حوسەین و کاربەدەستانی دیکەی عێراق بە دەستی دادپەروەری.

ئەم بڕیارنامە کار دەکات بۆ ئەوەی سەدام حوسەین وەک تاوانباری جەنـــگ دادگایی بکرێت و دوایین ئاڵقەی زنجیـــرە هەوڵەکانە بۆ ئەوەی ســـەروەری یاســـا نێونەتەوەییـــەکان لـــە ڕێـــگای دادگای نێونەتەوەی تاوانەکانەوە دەســـتەبەر بێت. مێژینەی ئەم چالاکییـــە دەگەڕێتەوە بۆ دادگای ســـەربازیی نێونەتەوەیـــی «نۆرمبێرگ» کە بـــۆ دادگاییکردنی

هەندێــک کەس پێکهات کە لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم تاوانیان دژی یاســا نێونەتەوەییەکان ئەنجامدابوو. بە گوێــرەی مەرجەکانی دادگای نورمبێرگ «یاســای نێونەتەوەیی دژی ئەو کەســانە جێبەجێ دەکرێت و ئەو کەســانە ســزا دەدات کە تاوانیان دژی یاســا نێونەتەوەییەکان ئەنجامداوە.»

ئــەم مەرجــە ئەمڕۆش هەر وەک ســاڵی ١٩٤٦ لە جێــی خویدایە. پــاش تێپەڕبوونی یەک دەیــە، گەلێ لە ئێمە لە کۆنگرێســی ویلایەتە یەکگرتووەکانــی ئەمریکا هەوڵمانــداوە دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکان پێکبهێنین بۆ ســزادانی ئەو کەســانەی کە تاوانــی دژ بە مرۆڤایەتی و تاوانــە نێونەتەوەییەکانی دیکەیان ئەنجامداوە. من و ســناتۆر دۆد[٢٢٢] کۆمەڵێک بڕیارنامەمان لەم پەیوەندییەدا لە ئەنجوومەنی پیرانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نووسیوە.

لــە ئەنجومەنــی نوێنەرانیش لە ژێر ڕێبەرایەتی کونگریســمەن جیم لیــچ،[٢٢٣] هەندێــک بڕیارنامە پێشــنیار کــراوە. دادگای نێونەتەوەیی تاوانەکان بەرەوپێش دەچێت ئەگەر نزیکایەتییەکی ڕاستەقینە هەبێت بۆ پێکهێنانی دادگایەکی وەها لە داهاتوویەکی نزیکدا و لەم ســەروبەندەدا دادگای تاوانەکانی جەنگ لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دروستکراوە بۆ لێپرســینەوە لەگــەڵ تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی لە یوگوســلاڤیای پێشــوو و ئەو تاوانانە کە لە بۆسنیاو وڵاتانی پەیوەندیدار ئەنجامدران و هەروەها ئەو تاوانانەی کە لە «ڕواندا»[٢٢٤] دژی مرۆڤایەتی ئەنجامدران. ئێستا دادگای تاوانەکانی شەڕ هەیە. من جارێکیان هەلی ئەوەم بۆڕەخسا لەنزیکەوە ســەیری کاری ئەم دادگایە بکەم. دەبێ بازنەی کاری دادگای تاوانەکانــی جەنــگ ئەوەندە بەرفــراوان بکرێت کە ئــەم بڕیارنامەیەی بەردەســتمان بکەوێتە ناوی بۆ ئەوەی ســەدام حوسەین وەک تاوانباری جەنگ دادگایی بکرێت.

ئاشــکرایە کە ســاڵی ١٩٨٨ دەوڵەتی عێراق بە ڕێبەرایەتی سەدام حوســەین شاڵاوێکی سیســتماتیکی بۆ قڕکردنی خەڵکی کورد لە عێراق

بەڕێوەبرد. ڕێبەرە کوردەکان ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە ئەنجامی ئەم شاڵاوەدا کوژراون لە نێوان ٥٠ هەزار تا ١٨٢ هەزار کەس هەڵدەسەنگێنن. لە ١٦ ی ئاداری ١٩٨٨ هێزی هەوایی عێراق شاری هەڵەبجەی بۆمباران کرد پاش ئەوەی دەوڵەتی ئێران بە یارمەتی هێزە کوردەکان هەڵەبجەی گرت. ئەم بومبارانە بە چەکی کیمیایی ئەنجامدرا و لە ئەنجامدا ٥ هەزار ژن و منداڵ کوژران. دەوڵەتی عێراق لە ١٩٨٢ و ١٩٨٤ لە شەری ئێران و عێراق کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە.

عێراق سەرەتا لە ساڵی ١٩٨٢ دژی ئێرانیەکان چەکی کیمیایی بەکارهێنا و پاشان لە تەموزی ١٩٨٣ گازی «موستارد»ی دژی هێزە ئێرانیەکان بەکارهێنا. برێکی زۆر گازی موستارد لە تشرینی دووەمی ١٩٨٣ و شوباتی ١٩٨٤ لەلایەن عێراقەوە بەکارهێنرا. هەروەها دەگوترێت عێراق لە هێرشەکەی شوباتی ١٩٨٤ گازی دەماری بەکارهێناوە. لە پەیوەندی لەگەڵ قەیرانی عێراق- کوێت لە ١٨ی کانوونی دووەم تا ٢٥ی شوباتی ١٩٩١، عێراق ٣٩ موشەکی قەدەغەکراوی Scudی لە ١٨ هێرشی جیاوازدا هاوێشتووە بۆ ئیسرائیل کە دوو کەسی بە شێوازی راستەوخۆ و ١٢ کەسی بە شێوازی ناڕاستەوخۆ کوشتووە و پتر لە ٢٠٠ کەسی بریندار کردووە.

لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٠ ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی راپورتێکی بڵاو کردەوە کە تێیدا هاتووە عێراق سەدان کوێتی ئەشکەنجە کردووە و کوشتووە بە تۆمەتی ئەوەی کە هێرشیان کردووەتەسەر هێزەکانی عێراق. هەزاران کوەیتی بە تاوانی ملکەچنەبوون بە فرمانی سەربازانی عێراق دستگیر کراون. رێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی هەروەها ڕاپورتیداوە کە نزیکەی ٣١٢ منداڵ لە زگی دایکیاندا مردوون پاش ئەوەی سەربازانی عێراق دایکی ئەو منداڵانەیان کوشتووە. دەوڵەتی عێراق هەروەها تاوانی بەئەنقەست و برنامەداڕێژراوی تروریزمی ژینگەی لە ناوچە ئەنجامداوە لە رێگای ئاگرتێبەردانی بەئەنقەستی ٧٠٠ بیری نەوتی کوەیت لە شوباتی ١٩٩١

له به‌هاری ١٩٩٣ ده‌وڵه‌تی کوه‌یت ده‌وڵه‌تی ئه‌مریکای ئاگادار کرده‌وه که‌ کۆمه‌ڵێک به‌ڵگه‌ی دۆزیوه‌ته‌وه له باره‌ی ئه‌وه‌ی که عێراق هه‌وڵیداوه سه‌رۆک کۆماری پێشووی ئه‌مریکا، جورج بوش له کاتی سه‌ردانی جورج بوش بۆ کوه‌یت له ١٤، ١٥ و ١٦ای نیسان بکوژێت. له‌م په‌یوه‌ندییه‌دا ئیداره‌ی فدراڵی لێکۆڵینه‌وه و ئاژانسه هه‌واڵگریه‌کانی دیکه‌ی ئه‌مریکا بۆ لێکۆڵینه‌وه ناردران بۆ کوه‌یت و له ٢٤ی حوزه‌یرانی ١٩٩٣ راپۆرتیاندا به سه‌رۆک کۆمار و رایانگه‌یاند به‌و ئه‌نجامه گه‌یشتوون که عێراق له پشتی ئه‌م پیلانه‌دا بووه. عێراق حاشای له‌وه کردووه که هه‌وڵی کوشتنی سه‌رۆک کۆماری ئه‌مریکای دابێت، به‌ڵام راستبوونی ئه‌م مه‌سه‌له‌یه سه‌لمێندرا، هه‌ر بۆیه ویلایه‌ته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له ٢٦ ی حوزه‌یرانی ١٩٩٣، ٢٣ موشه‌کی Tomahawkی دا له به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی ئیستیخباراتی عێراق. له ٢٨ی حوزه‌یرانی ١٩٩٣ سه‌رۆک کلینتۆن نامه‌یه‌کی نارد بۆ کۆنگرێس و ئاماژه‌ی به‌وه کرد که هێرشی موشه‌کی بۆ سه‌ر عێراق به گوێره‌ی بڕیارنامه‌ی ده‌سه‌ڵاته‌کانی جه‌نگ ئه‌نجامدراوه.

ئه‌مانه کورته‌یه‌کی چروپڕ له تاوانه جه‌نگیه‌کانی سه‌دام حوسه‌ین و ڕێبه‌رانی دیکه‌ی عێراقه. هه‌روه‌ها سه‌دام کۆمه‌ڵێک کرده‌وه‌ی شایانی سه‌رزه‌نشتی دیکه‌ی به گوێره‌ی ڕێوشوێنه نێونه‌ته‌وه‌ییه‌کان ئه‌نجامداوه. سه‌دام حوسه‌ین بڕیارنامه‌کانی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کانی به توندی پێشێلکردووه و له‌گه‌ڵ جیهان به‌ربه‌ره‌کانی ده‌کات، به‌ڵام له دوایین ساته‌کاندا پاشه‌کشه ده‌کات. ئه‌گه‌ر سه‌دام سکاڵای له سه‌ر تۆمار بکرێت و وه‌ک تاوانباری جه‌نگ دادگایی بکرێت، ده‌بێ به نموونه‌یه‌کی زۆر باش. روونه که دادگاییکردنی سه‌دام مه‌سه‌له‌یه‌کی زۆر ئاڵۆزه و له‌وانه‌یه بێ که‌ڵکوه‌رگرتن له هێزێکی زۆری سه‌ربازی مومکین نه‌بێت.

هه‌ندێک داواکاری هه‌یه بۆ ڕووخاندنی سه‌دام حوسه‌ین. شتێکی دوور له ڕاستی نییه که هێزه ناوخۆییه‌کانی نه‌یاری سه‌دام بتوانن شۆڕشێک دژی سه‌دام ئه‌نجام بده‌ن. ویلایه‌ته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا ده‌توانێت له ڕێگای رادیۆ ده‌نگی ئه‌مریکا یارمه‌تی ئه‌م هه‌وڵانه بدات

و دەتوانێت (بەهاوئاهەنگی لەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی) پشـــتیوانی لەو کەســـانە بکات کە دژی ســـەدام خەبات دەکەن بۆ پەســـەندکردنی بڕیارنامەیەکی وەهـــا بۆ دادگاییکردنی ســـەدام وەک تاوانیاری جەنگ. ئەم دادگاییکردنە تەنانەت ئەگەر خودی ســـەدامیش تێیدا ئامادە نەبێت ورەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر بەرز دەکاتەوە بۆ ڕووخاندنی سەدام.

سناتۆر دۆرگان:

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ شتی زۆری نووســـیوە سەبارەت بە شـــاڵاوی ئەنفال دژی کوردەکانی باکووری عێراق. ئەم شـــاڵاوە سیاسەتی کۆمەڵکوژیی سیستماتیک و بە ئەنقەست بوو. ڕێکخـــراوی چاودێری مافی مرۆڤ گەیشـــتووەتە ئەو ئەنجامە کە دەوڵەتی عێراق لانیکەم ٥٠ هەزار تا ١٠٠ هەزار کوردی کوشتووە.

شـــاڵاوی ئەنفال بریتیبوو لە کاولکردنی هەزاران گوندی کوردنشین و کوشتن و بێسەروشـــوێنکردن و قەڵاچۆکردنی خەڵک بە چەکی کیمیایی و نیشـــتەجێکردنی زۆرەملێی ســـەدان هەزار کورد. ئەم شاڵاوە پاکتاوی ئەتنیکی بوو، پاشـــان دەستەواژەی ئەنفالی لە سەر دانرا. مەسەلەی زۆر خراپتر ئەوەیە کە لە شاڵاوی ئەنفالدا کەڵک لە چەکی کیمیایی وەرگیراوە. ڕاپۆرتـــی ئەنجوومەنی وەزیرانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەڵێت لـــە ١٩٨٧ و ١٩٨٨ گەلێ جـــار بە چەکی کیمیایی هێرشکراوەتەســـەر دانیشـــتوانی گوەندەکان. ئەم ڕاپۆرتە ١٠ نمونە لە هێرشە کیمیاییەکانی عێراقی خســـتووەتەڕوو و دەڵێت عێراق ٥ جۆر گازی موســـتارد و گازی دەماری سارین و تابونی خستووەتەسەر بومبی هەوایی و «rocket»ی ١٢٠ میلیمی و چەند جۆر تۆپ.

عێـــراق بەرنامەی چەکی کیمیایـــی و بیولۆژیکی هەیـــە. ئەمباری چەکـــە کیمیاییەکانی عێـــراق، ٤٠ هەزار چـــەک و تەقەمەنی کیمیایی و ٤٨٠ هـــەزار لیتر ســـووتەمەنی چەکی کیمیایی و ٨ سیســـتمی هەڵگری بومب لە خـــۆ دەگرێت. ئەمباری چەکـــە بیولۆژیکەکانی عێراق، ٨/٥٠٠

لیتــر anthrax، ۱۹ هەزار لیتــر botulinum toxinو ۲۲۰۰ لیتر alfatoxin لەخۆدەگرێت. ئەم بەرنامەیە پێشــێلکردنی کونڤانسیونی چەکە بیولۆژیکەکانە کە عێراق واژۆی کردووە. هەروەها لیستی تاوانەکانی عێراق و پێشێلکردنی پەیماننامەکان زۆر دوور و درێژە.

## شایەتحاڵێکی ئەنفال

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، با سەیرێکی رەفتار و کردەوەکانی سەدام حوسەین و رژێمی عێراق بکەین لە رێگای ئەو بەسەرهاتە ترسناکەی کە بەســەر کورێکی منداڵدا هاتووە بە ناوی «دژوار» کە تەمەنی ٥ ســاڵ بووە و ئێستا مردووە. بەسەرهاتی «دژوار» لە راپۆرتی سەیروسەمەرەی «رێکخراوی چاودێریی رۆژهەڵاتی ناوەڕاســت» و «رێکخراوی پزیشکانی مرۆڤدۆست» وەرگیراوە. رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ ئەم راپۆرتەی لــە کتێبێکدا بەناوی «شــاڵاوی ئەنفــال لە کوردســتانی عێراق» بڵاو کردووەتــەوە، ئەم کتێبە بەســەرهاتی زۆر ترســناکی «دژوار»مان بۆ دەگێڕێتەوە:

لە ئێوارەی رۆژی ٢٥ ی ئابی ١٩٩٨ باوکی «دژوار» کە جووتیار بووە و ناوی حەسەن بووە لەگەڵ دایک و باوک و ٤ براکەی و هاوسەرەکەی و ٤ منداڵەکەی (کە «دژوار» یەکێ لەوانە بووە) لەگوندی «بیرجینی»[٢٢٥] دەژیان. حەســەن، باوکی «دژوار» سەرلەبەیانی ئەو رۆژە خۆی ئامادە کردبوو بچێتە باخەکەیان، بەڵام گوندەکەیان بۆمبارانکرا. حەسەن دەڵێت تەقینەوەکانی ســەرلەبەیانی ئەو رۆژە بە قەد بۆمبارانەکانی پێشــووی گوندەکەیان بەدەســتی عێراق بەهێز نەبووە. خەڵکی گوند (ئەوانەی کە لە هێرشــەکە رزگاریان بووە) وتوویانە دووکەڵی بۆمبەکان رەنگی سپی، رەش و زەرد بــووە و بەرزایــی دووکەڵەکەی ٥ تــا ٦ مەتر بووە، بۆنی گازەکەی ســەرەتا خۆش بووە و بۆنی ســێو و هەروەها بۆنی شــتێکی شیرینی داوە. گەلێ لە گوندنشینەکان وتوویانە:

« گازەکە بۆنی ژەهری دژە ئافەتی کێڵگەکانی دەدا. پاش ماوەیەکی

کورت بۆنەکە تاڵ بوو و کاری کردە سەر چاو و دەم و پێستمان. لە ناکاو بە زەحمەت دەمانتوانی هەناســە بکێشین. هەناسەمان نەدەهاتە دەرەوە و بەتەواوی پچڕا بوو.»

خەڵکی ئەم گوندە- کە تەنها یەکێ لەو گوندانە بووە کە سەرلەبەیانی ئەو رۆژە لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە هێرشی کراوەتەسەر- نەیاندەزانی لە کاتــی بومبارانەکەدا چی بکەن و کەمکەم زانیــان کە ئەمانە بومبی ئاسایی نین بەڵکو بۆمبی کیمیایین. کاتێ کە دوکەڵی بۆمبە کیمیاییەکان نیشــتووەتە ســەر زەوی، وەک پەڵە هەور چــۆم و کێڵگە و مەزراکانی داپۆشیوە. باوکی«دژوار» دەڵێت:

« دەســتی سێ منداڵەکەم و ژنەکەم گرت و بەهەڵاتن چووینە سەر شــوێنێکی بەرز. ئێمە بەرەو ئاراســتەی پێچەوانەی دوکەڵەکە هەڵاتین. بارودۆخەکە زۆر شــڵەژاو بوو. خەڵک بــەرەو هەموو لایەک هەڵدەهاتن. ئەندامانی بنەماڵە لەیــەک دابڕابوون و منداڵەکان دایک و باوکی خۆیان ون کردبوو. هەموو کەســێک هەوڵیدەدا خۆی رزگار بکات. هەر کەسێک لــە بیری خۆیدا بوو، تەنانەت دایکــی منداڵەکانیش، چونکە منداڵەکان نەیاندەتوانی هەناسە بدەن».

بەڵام باوکی حەسەن و ئەندامانی دیکەی بنەماڵە هەر لە سەرەتاوە لە ماڵ نەهاتبوونە دەرەوە، لەبەر ئەوەی کە نەیاندەزانی ئەم دوکەڵە چییە، بەڵام کاتێ کە زانیان هێرشــی کیمیاییە، گەلێکیــان لە گوندەوە بەرەو باخێک هەڵهاتن کە لە نێو دۆڵێکی قووڵدا بوو. دووکەڵەکە بەشــوێنیاندا دەچــووە ناو چۆمەکە. ئەو کاتە حەســەن و باوکــی زانیان یەکێ لە ٤ منداڵەکانیان لێیان جیابووەتەوە کە ئەو منداڵە ٥ ســاڵە بوو کە باســم کــرد واتا «دژوار» بــوو، «دژوار» ون ببوو، لەگەڵ باپیری چووبووە نێو باخەکەی نێو چۆمەکە و لەوێ مابووەوە. کاتێک کە دووکەڵەکە پاش نیو کاتژمێر تۆزێک لاچوو، حەســەن و کەسانی دیکە کە رزگاریان ببوو بە ســلامەت گەڕانەوە ناو گوند، حەســەن بینی دایک و خۆشکەکەی بە ســەر زەویدا ڕاکێشراون و کیمیایی گرتوونی، دەست و لاقیان فەلەج بوو

و دەلەرزی، هەوڵیاندەدا ئاو بخۆن، بەڵام نەیاندەتوانی، قورگیان وشـــک ببوو و دەسووتا، دەرپشانەوە. حەسەن دەڵێت:

« دایکم بە هەناســـەدان وتی هەست دەکەم ســـەرم کونی تێبووە. لـــە ماوەی چەند کاتژمێر پاش کیمیابارانەکە دایک و خۆشـــکەکەم کوێر بوون. لە گوند چوومە دەرەوە و باوک و کوڕەکەم (دژوار) دۆزییەوە کە مردبوون و لە دەرەوەی باخەکەمان کەوتبوون. هیچ نیشانەیەکیان پێوە دیـــار نەبوو. وەک ئەوە وابوو خەوتبن، تەنها ئەوە نەبێ کە دەموچاویان شـــین ببوو. پاشـــان زانیم کە دوو براکەشم لە ئەشـــکەوتێکی بچووکدا مردوون کە خۆیان تێدا داڵدەدابوو».

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، ئەمە تەنها چەند پاراگراف لەو کتێبەیە کە باســـی بە سەرهاتی یەکێ لە گوندەکان دەکات کە لە لایەن دەوڵەتی عێراق کیمیاباران کراوە.

تەنهـــا یەک کەس لـــەم جیهانەدا هەیە کە نە یەک جار بەڵکو چەند جار چەکی کۆمەڵکوژی دژی خەڵکی خۆی و دراوســـێکانی بەکارهێناوە، ئەویش سەدام حوسەینە و تەنها یەک وڵاتیش هەیە کە کارێکی وای تێدا کرابێ، ئەویش عێراقە. من و ســـناتوری ئەیالەتی پنســـیلڤانیا و ئەوانی دیکە دەڵێین ئێستا کاتی ئەوەیە ( هەر چەند  کە کاتی زۆری بە سەردا چـــووە) کە دادگایەکی نێونەتەوەیی پێکبهێنرێـــت بۆ دادگاییکردنی ئەو کەســـانە کە ئەم کردەوە دڵڕەقانە و تاوانـــە جەنگیانە ئەنجامداوە. ئەم دادگایە دەتوانێ کۆمەڵێک بەڵگەنامەی زۆرتر لەو پەیوەندییەدا بخاتەڕوو، لە چاو ئەو شـــتانەی کە ئەمڕۆ ســـناتۆری ئەیالەتی پنســـیلوانیا و من باسمان کرد.

لەوانەیە پاشـــان هەمـــوو جیهان ئاگاداری ئـــەم بەڵگەنامانە و ئەو کردەوە ترسناکە بەزمان نەهاتووانە بێتەوە کە بە سەر ئەم ژن و پیاو و منداڵە بێ گوناهانەدا هاتووە. نەتەنها دەیان هەزار بەڵکو ســـەدان هەزار کەس بێسەروشـــوێن کران و بە تاک و بە کۆمەڵ کوژراون کە هەندێکیان بـــە چەکی کیمیایی کوژراون. لەوانەیە پاشـــان خەڵکـــی جیهان ئاگادار

ببنەوە کە سەدام تەنها سەرکردەی وڵاتێک نییە، تەنها سەرکردەی عێراق نییە، بەڵکو تاوانباری جەنگــە. دادگای تاوانەکانی جەنگ دەبوایا پاش شەڕی کەنداو پێکبهاتبایا.

ســـەدام حوســـەین چ بە ئامادەبوون و چ بـــە ئامادەنەبوونی خۆی لـــە دادگا دادگایی بکرێت بۆ من جیاوازی نییـــە، گرنگ ئەوەیە دادگایی بکرێت. ئێمـــە دەبێ ( وەک خەڵکی جیهان) لـــە دەوری یەک کۆببینەوە و کردەوەیەکـــی دادپەروەرانەی وا ئەنجام بدەین. ئەو کردەوە ترســـناکە بەزماننەهاتووە کە دەوڵەتی عێراق بە سەر گەلێ لەم خەڵکە بێ گوناهەدا هێناویەتی، نابێ بێ وەڵام بمێنێتەوە و دەبێ لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێ. ئێمە دەتوانین و دەبێ دادگایەکی نێونەتەوەیی پێکبهێنین. ئێمە کارێکی وامان لە رابردوودا کردووە و ئێستاش دوو دادگای هاوشێوە هەیە.

بـــە رێبەرایەتی ســـناتوری پنســـیلڤانیا، ئێمە دەتوانیـــن و دەبێ دادگایەکی نێونەتەوەیی بۆ عێراق پێکبهێنین. لەوانەیە ئەم بڕیارنامەیە بۆ هەندێ کەس ناتەبا بێ و بڵێن دیپلۆماسی ناشەفافی جیهانی ئەمڕۆ ئەم جۆرە کردەوە لێبڕاوانە و گرنگانە قبوڵ ناکات. ئەگەر دەستپێشـــخەریی دیپلۆماتیـــک لە داهاتوودا لە کەنداوی فارس ئەنجـــام بدرێت، نابێت لە نێوان دیپلۆماتە هێژاکان لە لایەک و سەدام حوسەین وەک سەرکردەیەکی نەتەوەیـــی لە لایەکی دیکە بکرێت. دەبێ ســـەدام وەک تاوانباری جەنگ دادگایـــی بکرێت و بەڵگەنامەکان کە هەموو خەڵکی جیهان لە داهاتوودا دەیانبینن، تاوانباربوونی سەدام دەسەلمێنن.

## بەگوێرەی یاسا نێونەتەوەییەکان، ئەنفال ژینوسایدە

پێشیلکارییەکانی یاسـا نێونەتەوەییەکان لە کوەیت لەلایەن عێراق سیسـتماتیک و بەرفراوان بووە، بەڵام دادگای نێونەتەوەیی نابێت خۆی لە بازنەی جەنگی کەنداوی فارسدا بەرتەسک بکاتەوە و بۆ ئەم مەبەستە دەبێ نمونە گەورەترەکانی تاوانەکانی سەدام حوسەین لە بەر چاو بگرێت کـە داگیرکردنی کویت تەنها یەکێ لـەو تاوانانەیە. دادگای تاوانەکان و لەوانە دادگای تاوانەکانی سەدام حوسەین یەکێ لە دادگا درێژخایەنەکانە و دەگەڕێتەوە بۆ پێش لە جەنگی کەنداوی فارس و پاش ئەم جەنگەش بەردەوام بووە.

گەورەترین تاوانێک کە سەرکردەکانی عێراق ئەنجامیانداوە، شاڵاوی ئەنفالە بۆ ژینوسـایدی خەڵکی کورد لە ناوچە گوندنشینەکانی باکووری عێـراق. ئەنجامدانی پتر لـە ٣٠٠ گفتوگۆ و لێکۆڵینـەوەی مەیدانی لە کوردسـتانی عێراق و کەڵکوەرگرتن لە بەڵگەنامە دادگاپەسـەندەکان و بەڵگەنامە فەرمییەکانی عێراق کە دەسـتیان بەسەردا گیراوە، ڕێکخراوی چاودێـری مافی مرۆڤی گەیاندووەتە ئەو ئەنجامە کە لە شـاڵاوی ئەنفال دژ بـە کوردەکانـی عێراق، ٥٠ هـەزار تا ١٠٠ هەزار کورد بە شـێوازی سیستماتیک و بە ئەنقەست کوژراون.

لەم شـاڵاوەدا هەزاران گوندی کوردنشین کاولکران و گەلێ کەس بە چەکی کیمیایی کوژران، بێ سەروشـوێن کران و قەڵاچۆکران یا سـەدان هەزار کورد بە زۆر نیشتەجێ کران. ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ ئەوە نیشان دەدات کە چۆن ئەم شاڵاوی جینوسایدە گوند بەگوند بەڕێوە چووە. گوندەکان سـەرەتا بۆمباران یا تۆپباران کراون و هەندێک جار هێرشـی کیمیاییان کراوەتەسـەر (بەهەمان جۆرە چەکی کیمیایی کە لە کاتی شـەری ئێران و عێراقدا کەڵکی لێوەرگیراوە). دانیشتووانی گوندەکان هەوڵیانداوە هەڵبێن بەڵام کەوتوونەتە داوی سـەربازەکان کە گوندەکانیان گەمارۆ داوە. هێزەکانی هەواڵگری عێراق پیاو و کوڕەکانیان جیاکردووەتـەوە و بێسەروشـوێنی کـردوون. ئەو شـاهیدانە کە ئەم

رووداوانەیـــان بە چـــاوی خۆیان بینیوە وتوویانە ئەم کەســـانە بە لۆری گوازراونەتەوە بۆ باشووری عێراق و لەوێ کوژراون و خراونەتە ناو گۆڕە بەکۆمەڵەکان.

ئەم کردەوانەی دەوڵەتی عێراق دژ بە خەڵکی کوردی خۆی، تاوانی ژینوسایدە بە گوێرەی ئەو پێناسەیەی کنڤانسیونی ژینوساید کە دەوڵەتی عێراقیش لە ١٩٥٩ واژۆی کردووە. ئەو کنڤانســـیونە کۆمەڵکوژی خەڵک بە هۆی رەگەزیانەوە قەدەغە دەکات. لە بەڵگەنامەکانی خودی دەوڵەتی عێراقدا دەردەکەوێت کە دەوڵەتی عێراق هەوڵیداوە کوردەکان بە کۆمەڵ لەناوبەرێـــت تەنها لەبەر ئەوەی کە کورد بوونە. ئەم کردەوەیە دەکەوێتە ناو پێناسەی کونڤانسیونی ژینوساید. دەوڵەتی عێراق لە شاڵاوەکەی خۆی دژی خەڵکی کورد کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە کە پاشـــماوەی چەکە کیمیاییەکانی جەنگی ئێران و عێراق بووە.

بە پێی راپۆرتێکی ئەنجوومەنی وەزیرانـــی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بارەی چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراق، دەوڵەتی عێراق لە ١٩٨٧ و ١٩٨٨ لە ناوچەکانی سەر سنووری ئێران و تورکیا هێرشێکی کیمیایی گەورەی کردووەتە سەر گوندنشینەکانی خۆی. هەمان راپورت ئاماژە بە ١٠٠ نمونە هێرشـــی کیمیایی عێراق دەکات دژ بە سەربازەکانی ئێران یان خەڵکی کـــورد. بەگوێرەی ئەم راپۆرتە عێراق لە بـــواری بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی پێشـــکەوتنی باشی بەدەســـتهێناوە و لە دەیەی ١٩٨٠ ئەم چەکانەی دژ بە ئێـــران و خەڵکی کوردی وڵاتی خۆی بەکارهێناوە. هێزەکانـــی عێراق هەم بـــە ئامانجی تاکتیکە ســـەربازییەکان و هەم بە ئامانجی ترساندنی خەڵک، گازی کیمیاییان ( لەوانە گازی Mustard و گازی دەماری Tabunو Sarin ) خستووەتە سەر بۆمبە هەواییەکان و رۆکێتی ١٢٠ میلیمی و چەند جۆر تۆپ.

# ئەنفال ژینۆسایدکردنی مرۆڤایەتییە

## ١٣ی ئاداری ١٩٩٨

## ئەنجومەنی پیران

سناتۆر جۆزیف بایدێن:[٢٢٦] جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، دەمەوێت سپاسی سناتۆر سپیکتێر بکەم بۆ رێبەرایەتیکردنی هەوڵەکان بۆ ئامادەکردنی ئەو بڕیارنامەیە کە دوێنێ بە تێکڕای دەنگ لە ئەنجومەنی پیران پەسەندکرا.

ئەو بڕیارنامەیە پشتیوانی دەکات لە پێکهاتنی دادگایەکی نێونەتەوەیی بۆ لێپرسینەوە، دادگاییکردن و لە کۆتاییدا سزادانی سەدام حوسەین و کاربەدەستانی دیکەی عێراق بەهۆی تاوانی ژینۆساید و تاوانانەکانی دیکە کە دژی مرۆڤایەتی ئەنجامیانداوە. رژێمی سەدام بە هۆی ئەنجامدانی ژینۆسایدی کورد و شیعەکان و هەڵسوکەوتی دڕندانە لەگەڵ هاوولاتیانی کوەیت و بەکارهێنانی بەردەوامی چەکی کیمیایی، بووە بە یەکێ لە بێزلێکراوترین دیکتاتۆرە زۆردارەکانی جیهان لەم سەردەمەدا.

لەوانەیە شالاوی ئەنفال یەکێ لە باشترین و بەڵگەمەندترین سیاسەتەکانی سەدام حوسەین بۆ ژینۆسایدکردنی مرۆڤ بێت کە لە شوباتی ١٩٨٨ دژی کوردستانی عێراق بەڕێوەچوو و لە ئاستی جیهانیدا کەمتر ناسراوە. ئامانجی ئەنفال ئەوەبوو کە پشتیوانی کۆمەلانی خەڵک لە بزووتنەوەی کورد وشک بکات و بۆ گەیشتن بەو ئامانجە رژێمی عێراق لە هەموو ئامرازێکی پێویست کەڵکی وەرگرت. عێراق بەشێکی زۆری گوندەکانی خستە ناو ناوچەی قەدەخەکراو و خەڵکەکەی بە زۆر دەرکرد. ئەوانە کە ئامادە نەبوون گوندەکانیان بەجێبێڵن نازناوی «خائین» و «خراپکار»یان پێوە لکێندرا و لە کاتی شالاوی دڕندانەی ئەنفالدا کە ٦ مانگ و نیوی خایاند، بێسەروشوێنکران. بەگوێرەی هەڵسەنگاندنی رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، ٥٠ تا ١٠٠ هەزار هاوولاتی سڤیلی بێگوناه لە کاتی ئەنفالدا کوژراون.

لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ یانی نزیکەی ١٠ ساڵ لەمەوپێش، سەدام حوسەین شارۆچکەی کوردنشینی هەڵەبجەی کیمیاباران کرد. رۆژی

چوارشـــەمە کریســـتیەن گوســـدێن وتارێکی لە ڕۆژنامەی «واشینگتۆن پۆســـت»دا بڵاو کـــردەوە کـــە ئاســـەوارەکانی ئـــەو کیمیابارانەی لە ســـەر پیـــاو، ژن و منداڵی بـــێ گوناهـــی هەڵەبجە نیشـــانداوە کە لە ئەنجامـــی هێرشـــەکەی ١٠ ســـاڵ لەمەو پێش تـــا ئەمـــڕۆ بەردەوامە. داوا دەکـــەم ئـــەم وتـــارە بخرێتە بەردەســـتی ئەندامانـــی ئەنجومەن.

وەڵامە لاوازەکـــەی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بە کیمیابارانی هەڵەبجە، ســـەدام حوســـەینی زیاتر هاندا. لە ئابی ١٩٨٨ سەدام قۆناخی کۆتایی شـــاڵاوی ئەنفالی دژی کۆمەڵێک گوندی دیکە ئەنجامدا، ســـەدان کەس کوژران و دەیان هەزار کەســـی دیکە هەڵاتن بۆ وڵاتانی دراوســـێ. کاتی خۆی ســـتافی ئەنجومەنی پیـــران لەگەڵ ئـــاوارەکان گفتوگۆیان کرد و ڕاپۆرتێکیان بۆ کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی نوێنەران ئامادە کرد کە بەمشـــێوەیە باســـی ئەو شـــاڵاوە دڵڕەقانەیەی کردبوو:

« دەنگـــی بۆمبەکان زۆر نەبوو، پـــاش تەقینەوەی بومبەکان تۆزێ دەنگـــی دەهـــات و پاشـــان پەلەهەورێکی زەرد بە ئاســـمانی شـــوێنی تەقینەوەکەدا بڵاو دەبووەوە. ئەوانە کە لە شوێنی تەقینەوەکە زۆر نزیک بـــوون، کتوپڕ مردن و ئەوانەش کە دوورتر بوون هەناســـەیان تێکچوو و ڕشانەوە. کیمیاییەکە چاو، پێست و سییەکانی گوندنشینەکانی سووتاند، ژمارەیەکی زۆریان بۆ هەتاهەتایە کوێر بوون. پاش تەقینەوەی بومبەکان گەلێک لە گوندنشـــینەکان هەڵاتن بۆ ناو چـــۆم و باخەکانی دەوروبەر. گەلێـــک لەوانەی کـــە توانیان خۆیـــان بگەیەنن بە چـــۆم و باخەکان، ڕزگاریـــان بوو و ئەوانەی کە نەیانتوانـــی ڕابکەن (کە زۆربەیان منداڵ و پیـــرەژن و پیرەمێرد بوون) مردن. خوێن لە دەمی هەندێ لە مردووەکان دەهاتە دەرەوە، لاشـــەی هەندێکیان وشک بوو و ڕەش و شین هەڵگەڕا.

کۆمەڵگای نێونەتەوەیی وەڵامێکی ئەوتۆی بەو دەستدرێژییانەی سەدام نەدایەوە. یەکێ لەو کوڕ و کۆمەڵە دەگمەنانە کە ناڕەزایەتی لە بەرامبەر ئەو کردەوانەی سەدام دەربڕی ئەم ئەنجومەنی پیرانە بوو کە تێیدا سناتۆر پێڵ و ســـناتۆر هیڵمز گەڵاڵەیاسایەکیان بۆ ســـەپاندنی ئابڵۆقە بەسەر

عێراقدا ئامادەکرد. گەلاڵەیاســاکە پاش یەک ڕۆژ لە ئەنجومەنی پیران تیپەڕی، بەڵام بەداخەوە ئیدارەی ڕەیگان ( کە هێشتا پێیوابوو دەتوانێت لەگەڵ ســەدام مامەڵە بکات)، گەلاڵەیاساکەی «بێ ئەنجام» لە قەڵەمدا و لە دوا ڕۆژەکانی ١٠٠مین خولی کۆنگرێســدا گەلاڵەیاســاکە وەلاوەنرا.

کــوردەکان تەنها قوربانیانی دەســتی ســەدام حوســەین نەبوون. ســەدام جگە لە ســەرکوتکردنی هاوولاتیانی خۆی، ڕق و کینەی خۆی ڕژاندووە بەسەر دراوسێکانیشیدا. سەدام لە کاتی شەڕی ئێران و عێراقدا کنڤانســیۆنی ١٩٢٥ی ژنێڤی پێشێلکرد و بەردەوام چەکی کیمیایی دژی هێزەکانی ئێــران بەکارهێنا. لە کاتی داگیرکردنی کوەیت، ســەربازانی عێراق دەســتدرێژیان کردەســەر خەڵک و خەڵکیان کوشــت. ســەدام موشەکی «ئیســکاد»ی دا لە خەڵکی ســڤیلی بەحرەین، عەرەبستانی سعودی، ئێران و ئیســرائیل. لەمێژە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی چاوپۆشی لــەم تاوانــە گەورانــە دژی مرۆڤایەتی دەکات. ئێســتا کاتــی هاتووە بەڵگەکانی کردەوە دڵڕەقانەکانی سەدام کۆبکرێتەوە و بدرێت بە دادگای تاوانەکان بۆ ئەوەی بە و شــێوەیە کە شــایانیەتی سزای سەدام بدات.

ئــەم بڕیارنامەیــە کــە دوێنــێ پەســەندکرا داوا لــە کۆمەڵگای نێونەتەوەیــی دەکات لــە پاڵ ویلایەتــە یەکگرتوەکانــی ئەمریکادا بۆ ســپاردنی ســەدام حوســەین بە دەســتی دادپەروەری هــەوڵ بدات. ئێمە دەزانین کە ڕادەســتکردنی ســەدام حوســەین بــە دادگا کارێکی ئاســان نییە، بەڵام دادگایینەکردنی ســەدام کارێکی بــێ ویژدانانەیە. بێدەنگبوون و هیچنەکردن غەدرێکی گەورەیە کەهەق ســەدان و هەزاران کەس کە بوونەتە قوربانی سەدام حوسەین.

# کۆمەڵکوژی هەڵەبجە یەکێ لە ڕووداوە ترسناکەکانی مێژووی هاوچەرخی ئەم جیهانە بوو

**ئەنجوومەنی نوێنەران**

**٢٤ی ئاداری ١٩٩٩**

کۆنگریســـمەن ستێنی هۆیێر:[٢٢٧] جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، ئەمڕۆ دەمەوێت یەکێ لە ڕووداوە ترسناکەکانی مێژووی هاوچەرخی ئەم جیهانە وەبیربهێنمەوە. ١١ ساڵ پێش سەدام حوسەین بە چەکی کیمیایی هێرشی کردە ســـەر شاری کوردنشـــینی هەڵەبجە و گازی ژەهراوی، لەوانە گازی Mustard، Sarinی ڕژاند بە ســـەر خەڵکی خۆیدا تەنها لەبەر ئەوەی کە کـــورد بوون. ئەم کردەوە قێـــزەون و دزێوە بووەهۆی کوژرانی پتر لە ٥ هەزار خەڵکی بێ گوناە و برینداربوونی پتر لە ١٠٠ هەزار کەســـی دیکە. بەهەرحاڵ هێرشـــی کیمیایی ســـەر هەڵەبجە یەکەمین هێرشی کیمیایی سەدام دژی کوردەکانی عێراق نەبوو و دواییینیشی نابێت.

لە ســـاڵی ١٩٨٨دا ڕژێمی دڕندەی ســـەدام حوســـەین درێژەیدا بە کەڵکوەرگرتـــن لـــە چەکی کیمیایی دژی خەڵکەکەی خۆی. لە شـــاڵاوی دڕندانەی ئەنفالدا تەنها لە ماوەی ٦ مانگدا پتر لە ٢٠٠ گوندی کوردنشین هێرشیان کرایەسەرو بە هۆی چەکی کیمیایی ٢٥ هەزار کەس کوژران. لە ئەنجامی ئەم شـــاڵاوەدا بەگشتی ٤٥٠٠ گوندی کوردنشین کاولبوون، ٥٠٠ هەزار کورد گیانیان لە دەستدا[٢٢٨]، پتر لە ٢٠٠ هەزار کورد بێسەروشوێن کران و ٥٠٠ هەزار کوردی دیکە لە ناوخۆی عێراق ئاوارەبوون.

هـــەر چەند کە بێگومان خەڵکی هەڵەبجە لە کاتی کیمیابارانەکەی ١١ ســـاڵ پێشـــدا نەهامەتییەکی بەزماننەهاتوویان بەسەرداهات، بەڵام منداڵەکانیان و منداڵی منداڵەکانیان لە نەوەکانی داهاتووش بە دەســـت کاریگەرییەکانی ئەم هێرشەی سەدام دەناڵێنن. پاش ١١ ساڵ ئاکامەکانی

هێرشـــی کیمیایی هەڵەبجە هێشتا لە راستیدا کۆتایی پێنەهاتووە. گەلێ لە دانیشـــتووانی ناوچەکە هێشتا بەدەست کێشـــەی هەناسەدان، کزەی چاو و تێکچوونی دەمار و نەخۆشـــی پێست و شـــێرپەنجەوە دەناڵێنن. ئەم نەخۆشـــییانە بۆ ماوەیەکی درێژ لە رێگای DNA وە لە نەوەیەک بۆ نەوەیەکی دیکە دەگوازرێتەوە.

رژێمی عێراق قەت پەشیمانی هێرشەکەی بۆ سەر هەڵەبجە نییە و نە سەدام و نە داروودەستەکەی قەت لێپرسینەوەیان لەگەڵدا نەکراوە بەهۆی ئەو تاوانانە کە دژی هاووڵاتیانی خۆیان ئەنجامیانداوە. ئێمە دەزانین ئەم هێرشـــانە ( چی کرابێتە سەر خەڵکی عێراق و چی کرابێتە سەر خەڵکی وڵاتانی دراوســـێی عێراق) نامرۆڤانەیە و توخمی هاوبەشی سیاسەتەکانی ســـەدام حوســـەینە. ئێمە نابێ قەد ئەو خەڵکە بێگوناحە لە بیر بکەین کە لەم هێرشانەدا کوژراون و ئەو کەسانە کە هێشتاش بەدەست کردەوە دڵڕقەکانی سەدامەوە دەناڵێنن.

## بڕیارنامەیەک بۆ بەرزڕاگرتنی ساڵیادی کۆمەڵکوژی هەڵەبجە

## ئەنجوومەنی پیران

### ٩ی ئاداری ٢٠٠٠

سناتۆر گرامز:[٢٢٩] داوا دەکەم ئەنجوومەنی پیران دەستبەجێ بڕیارنامەی ٩٥ تاوتـــوێ بکات بـــۆ یادکردنەوەی ١٢هەمەین ســـاڵیادی کۆمەڵکوژی هەڵەبجە کە سناتۆر لۆت[٢٣٠] لەلایەن خۆی و کۆمەڵێک سناتۆری دیکەوە ئامادەی کردووە. ئەمە دەقی بڕیارنامەکەیە:

- بەهۆی ئەوەی لە ١٦ ئاداری ١٩٨٨، ســـەدام حوســـەین بە چەکی کیمیایی (لەوانـــە گازی دەمار، VX و گازی Mustard) هێرشـــی کردووەتە سەر شاری کوردنشینی هەڵەبجە.

- بەهۆی ئەوەی پتر لە ٥ هەزار پیاو، ژن و منداڵ لە ئاکامی هێرشی

کیمیایی ســـەدام بۆ سەر هەڵەبجە کوژران کە پێشلکردنی یەکجار توندی یاسای نێونەتەوەییە.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هێرشـــی کیمیایی بۆ ســـەر هەڵەبجە بەشێک بوو لە شاڵاوی سیستماتیکی دەوڵەتی عێراق بۆ ژینوسایدکردنی کوردەکانی عێراق کە بە شاڵاوی ئەنفال ناسراوە.

- بەهۆی ئەوەی لە ئاکامی شاڵاوی ئەنفالدا  پتر لە ١٨٠ هەزار پیاو، ژن و منداڵی کوردی عێراق کوژراون.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ســـەرەڕای تێپەڕبوونی ١٢ ساڵ، هیچ هەوڵێکی ســـەرکەوتوو نەدراوە لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یا ڕێکخراوە نێونەتەوییەکانی دیکە بۆ ســـپاردنی تاوانبارانی کۆمەڵکوژی هەڵەبجە بە دەستی دادپەروەری.

- بـــە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەنجوومەنـــی پیران و ئەنجوومەنی نوێنەران تا ئێســـتا لە ١٦ کاتی جیـــاوازدا، داوایان لە دەوڵەتە یەک لە دوای یەکەکانـــی ئەمریکا کردووە کە کار بکەن بۆ پێکهێنانی دادگاییەکی نێونەتەوەیی بۆ لێپرســـینەوە لەگەڵ تاوانەکانی جەنگی ڕژێمی سەدام.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە بە ماوەی چەند ســـاڵ، پارەی ســـاڵانە تەرخان کـــراوە بۆ تۆمارکردنی پێشـــێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لەلایەن ڕژێمی ســـەدام و پێکهێنانی دادگایەکـــی نێونەتەوەیی بۆ دادگاییکردنی سەدام و سەرکردەکانی  دیکەی ڕژیمەکەی.

- بەهۆی ئەوەی ڕژێمی سەدام درێژە بە سەرکوتی دڕندانەی خەڵکی عێراق دەدات، لەوانە بێبەشـــکردنی ئەم خەڵکە لە مافە سروشتیەکان و مافە سیاســـی و مەدەنیەکانی ســـوننە، شـــیعە و کوردەکانی عێراق و هەروەها کەمینەکانی دیکەی عێراق.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هەموو ســـاڵێک بەشـــێوازی بەڵگەمەند ڕایگەیاندووە کە ڕژێمی ســـەدام

حوسەین نەیتوانیوە پێداویستییە سەرەکیەکانی خەڵکی عێراق دابین بکات، لە کاتێکدا کە خۆراک لە بنکە سەربازییەکانی بەغداد فراوانە.

بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رژێمی سەدام حوسەین ساڵانە پتر لە ١٢ ملیارد دولاری لەبەردەستدایە (بەگوێرەی نرخی ئێستای نەوت) بۆ دابینکردنی هەموو جورێک پێداویستی خەڵکی عێراق.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هیچ بەربەستێکی ئەوتۆ لە سەر رێگای دەوڵەتی عێراقدا نییە بۆ کرینی خۆراک، بەلام سەرەرای ئەوەش رێژەی مردنی منداڵە ساواکان لە ناوچەکانی ژێر کونترۆڵی سەدام لە سەرووی رێژەی مەرگ لە کاتی جەنگدایە لە کاتێکدا کە ئەم رێژەیە لە ناوچە کوردنشینەکانی ژێر کونترۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکان کەمترە لە رێژەی مەرگ لە کاتی جەنگدا.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە بەدوور لە دادپەروەرییە کە پاش تێپەڕبوونی ١٢ ساڵ، دیکتاتوری دڕندە، سەدام حوسەین هێشتا سزا نەدراوە بە تاوانی کوشتنی سەدان هەزار خەڵکی بێگوناه و کەڵکوەرگرتن لە چەکە کیمیاییە قەدەغەکراوەکان دژی خەڵکی کوردستانی عێراق و گەلێک پێشێلکاری دیکەی مافی مرۆڤ.

کەوابوو ئەنجوومەنی پیران بڕیاریدا کە کۆنگرێسی ئەمریکا:

١- ساڵیادی ئێش و ئازارەکانی خەڵکی هەڵەبجە و سەرجەم قوربانیانی شالاوی ئەنفال بەرز رابگرێت.

٢- رژێمی سەدام حوسەین بەهۆی درێژەپێدانی رەفتارە دڕندەکانی دژی خەڵکی عێراق شەرمەزار دەکات.

٣- داوا لە سەرۆک کۆماری ئەمریکا دەکات ئەو پەڕی هەوڵی خۆی بدات لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پێکهێنانی دادگایەکی نێونەتەوەیی بۆ سەرکردەکانی عێراق.

٤- داوا لە سەرۆک کۆماری ئەمریکا دەکات بە خێرایی دەست بەکاربێت بۆ ئەوەی بە کاریگەرترین شێوە کەڵک لەو پارەیە وەرگرێت کە کۆنگرێس

تەرخانی کردووە بۆ تۆمارکردنی تاوانەکانی رژێمی سەدام حوسەین.

٥- دووپاتـــی دەکاتەوە کە کردەوە دڕندەکان و دەســـتدرێژییەکانی ســـەدام هەڕەشـــەیە هەم بۆ خەڵکی عێراق و هەم بـــۆ هەموو ناوچەی کەنداوی فارس.

٦- دیســـان جەخت لە ســـەر ئەوە دەکاتەوە کە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ ئەوە بێت کە پشتیوانی لە هەوڵەکان بکات بۆ لەســـەر دەسەڵات لابردنی سەدام حوسـەین لە عێراق و دەستبەجێ هاتنەسەر دەسەڵاتی دەوڵەتێکی دیموکرات، هەروەها کە لە یاسای گشتی ٣٣٨ ـ ١٠٥ دا ئاماژەی پێکراوە.

## ئەنفال و هەڵەبجە یەکێ لە تاوانەکانی رژێمی سەدام حوسەینە

## ئەنجومەنی نوێنەران

## ٢١ی ئەیلوولی ٢٠٠٠

کۆنگرێسمەن جان ئیدوارد پۆرتێر: جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، دوێنێ ١٩ی ئەیلول کومیسیونی کاروباری مافی مرۆڤ لە کۆنگرێس دانیشتنێکی بۆ تاوتوێکردنی چۆنیەتی داگاییکردنی سەدام حوسەین وەک تاوانباری جەنگ بەڕێوەبرد. ئەم حەفتەیە دەوڵەتی ئەمریکا پێداگری لەسەر نەتەوە یەکگرتوەکان کرد دادگایەکی تاوانەکانی جەنگ پێکبهێنێت بۆ سەدام حوسەین و ١١ کەسی دیکە لە کاربەدەستانی عێراق کە لە بەرامبەر مەرگی زیاتر لە ٢٥٠ هەزار کەس لە خەڵکی سڤیلی عێراق، ئێران، کوەیت و شوێنەکانی دیکە بەرپرسیارن.

دەیڤید شیفتێر[٢٣١] نوێنەری کاروباری تاوانەکانی جەنگ دوێنێ لە دانیشتنەکەدا شایەتیدا. شیفتێر ئەو بەڵگە و شەواهیدانەی خستەڕوو کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دژی سەدام حوسەین کۆیکردوەتەوە. ئەم بەڵگانە بریتین لەو تاوانانە کە لە کاتی شەڕی ئێران و عێراقدا ئەنجامدراوە، بەکارهێنانی بەرفراوانی چەکی کیمیایی لە هەڵەبجە دژی هاووڵاتیانی خۆی لە ١٩٨٨، داگیرکردنی کوەیت لە ١٩٩٠ و ١٩٩١ و کوشتنی نەیارانی سیاسی کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە. قسەکانی باڵوێز شیفتێر هەڵسەنگاندنێکی راست و دروستە بۆ ئەو تاوانە ترسناکانە کە سەدام حوسەین ئەنجامیداوەو ئێستاش ئەنجامی دەدات و هەروەها وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە کە ئەمریکا ئێستا چی دەکات بۆ ئەوەی دادپەروەری لە عێراق بچەسپێت. داوا لە هاوکارانم دەکەن سەرنج بە قسەکانی باڵوێز شیفتێر بدەن و هیوادارم کە کۆنگرێسی ئەمریکا بە توندی پشتیوانی لە هەوڵەکانی دەوڵەتی ئەمریکا بکات بۆ دادگاییکردنی سەدام حوسەین.

## کەیسی دادپەروەری لە عێراق
## دەیڤید شیفتێر، نوێنەری(ئەمریکا) بۆ کاروباری تاوانەکانی جەنگ
## کارنامەی تاوانەکانی رژێمی سەدام حوسەین

١- شـــەڕی ئێران و عێراق: لە کاتی شـــەڕی ئێران و عێراقدا سەدام حوســـەین و هێزەکانی چەکی کیمیایان دژی هێزەکانی ئێران بەکارهێنا. بەگوێرەی ئامارە رەســـمیەکانی ئێران، کە پێمانوایە راستن، نزیکەی ٥ هەزار ســـەربازی ئێرانی لە نێوان ١٩٨٣ و ١٩٨٨دا بە چەکی کیمیایی کـــوژراون. بەگوێـــرەی پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی ژنێـــڤ، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی تاوانی جەنگە و عێراقیش ئەو پرۆتۆکۆلەی واژۆ کردووە. هەروەها لە کاتی شـــەڕی ئێران و عێراقدا بە گوێرەی راپۆرتە متمانەپێکراوەکان هێزەکانی عێراق چەند هەزار کەس لە دیلە ئێرانیەکانیان کوشـــتووە کە ئەمەش تاوانی جەنگە و پێشێلکردنی هەمەلایەنەی کونڤانسیۆنی ١٩٤٩ی ژنێڤیشـــە کە عێراقیش واژۆی کردووە. سەدام حوسەین و کاربەدەستە پایەبەرزەکانی دیکـــەی عێراق کۆمەڵێک تاوانی جەنگی و دژەمرۆڤایەتی دیکەشـــیان دژی ئێران و خەڵکی ئێران ئەنجامداوە کە شایانی ئەوەیە لە ئاستی نێونەتەوەییدا تاوتوێ بکرێت.

٢- هەڵەبجە: لە ناوەڕاســـتی ئاداری ١٩٨٨ سەدام حوسەین و عەلی حەسەن ئەلمەجیدی ئامۆزای کە زیاتر بە عەلی کیمیایی ناسراوە فەرمانی کیمیابارانی شارۆچکەی هەڵەبجە لە باکوری رۆژهەڵاتی عێراقیان دەرکرد کە لە ئەنجامدا نزیکەی ٥ هەزار خەڵکی سڤیل کوژران. ئەمە تاوانی جەنگە و تاوان دژ بە مرۆڤایەتیشـــە. وێنە و فیلمی ئەو هێرشە و دوای ئەوەش لەبەردەســـتدایە. هەندێ لەم وێنە و فیلمانە لە بەردەستی لێکۆڵەراندایە و ئیشـــەڵا لە ئەنجامی هەوڵەکانی «ئینیستیتۆی نێونەتەوەیی چاودێری لۆسئانجلێس»[٢٣٢] لە کالیفۆرنیا دەخرێتە بەر دەستی داواکاری گشتی.

کۆمەڵێک بەڵگەی فیلم و وێنەی دیکە لە دەستی ئەو فلیمهەڵگر و

وێنەگرە ئێرانیانەدایە کە وێنەی قوربانیەکانی ئەم هێرشە دڕندانەیانە (کە زۆربەیان ژن و منداڵ بوون) لە کتێبێکدا لە تاران بڵاو کردوەتەوە. بەڵام باشــترین بەڵگە، ئەو کەســانەن کە لە خودی کیمیابارانەکەی هەڵەبجە رزگاریان بووە. بە شانازییەوە دەڵێم کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەگەڵ کۆمەڵێک گروپ، لەوانە «ئینیســتیتۆی کورد لە واشینگتۆن» و زانستڤانگەلێک وەک دۆکتۆر کریستیەن گوسدێن کاری کردووە بۆ ئەوەی نەهامەتیەکانــی خەڵکی هەڵەبجە بکەن بە بەڵگــە بۆ ئەوەی رێگایەک بدۆزنــەوە بۆ یارمەتێدانــی قوربانیانی هەڵەبجە و هیــوای ژیانیان تێدا زیندوو بکەنەوە.

ئێمە هەروەها لەگەڵ کاربەدەســتانی هەڵەبجــە کارە دەکەین و بە شوێن رێگاگەلێکدا دەگەڕێین بۆ ئەوەی یارمەتی بە لێکۆڵەران، پزیشکان و زانستڤانەکان بدەن بۆ ئەوەی تاوانی هەڵەبجە بکەن بە بەڵگە، و پلانێک دابرێژین بۆ یارمەتێدانی ئەو قوربانیانە کە لە کیمیابارانەکە زیندوو ماون. ئێمــە دەزانین کە ســەدام یارمەتــی ئەو خەڵکە نادات. بــۆ نمونە بۆ یارمەتیدان بە رەوتی لێپرسینەوە لە تاوانەکانی جەنگ، دەوڵەتی ئەمریکا ئەمڕۆ ئەو وێنانەی بڵاو کردەوە کە لە ئاداری ١٩٨٨ (بە ســەتەلایت) لە ئاسمانەوە لە هەڵەبجە گیراون و باشترین وێنەکان کە لە دەستی ئێمەدان وێنەکانی حەفتەیەک تــا ١٠ رۆژ دوای کیمیابارانەکەیە. هیواداریین ئەم وێنانــە کەڵکی لێوەربگیردرێت بۆ ئەوەی دۆکتۆرەکان و زانســتڤانەکان باشــتر بتوانن لێکۆڵینەوە بکەن لە بارەی رۆژە کارەساتبارەکانی هێرشە کیمیایەکانی عێراق و دوای ئەوەش.

٣- شــاڵاوی ئەنفال: لە ١٩٨٧ دەستیپێکرد و لە سەرەتای ١٩٨٨ خێراتر کرا. ســەدام حوســەین فەرمانی شــاڵاوی ئەنفالی دژی خەڵکی کوردی عێراق دەرکرد. ئەنفال بە هەمو شێوەیەک تاوان دژی مرۆڤایەتیە و تاوانــی جەنگــە. عەلــی کیمیایی دانــی بەوەداناوە کــە خۆی ئەم شــاڵاوەی ئەنجامداوە. لە ١٩٩٥ «رێکخــراوی چاودێری مافی مرۆڤ» کــۆی راپۆرتەکانی لە کتێبێکدا بە ناوی» تاوانی ژینۆســایدی عێراق»

بـــلاو کردەوە. پێویســـتە رێکخراوی چاودێری مافـــی مرۆڤ ئەم کتێبە دیســـان بلاو بکاتەوە. رێکخراوی چاودێری مافـــی مرۆڤ بەگوێرەی ئەو بەڵگەنامانەی عێراق کە دەستی بەسەردا گیراوە و گفتوگۆ لەگەڵ سەدان کەس لە شایەتحاڵەکان و لێکۆڵینەوەی مەیدانی بەو ئەنجامە گەیشتووە کە ٥٠ تا ١٠٠هەزار کورد لە شالاوی ئەنفالدا کوژراون.

«رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ» بەو ئەنجامە گەیشتووە کە ئەنفال ژینۆساید بووە. پێموانیە کەسێک کە بەڵگەنامەکانی تاوانەکانی ژینۆسایدی عێراقی بینیبێت بڵێت ئەنفال ژینۆســـاید نەبووە. کێ بەرپرســـیاری ئەم تاوانانەیە؟ سەدام حوسەینیش وەک ئیسلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ[٢٣٣] خۆی بە تەنیا ئەم تاوانەی ئەنجامنەداوە. ســـەدام یەکێ لە درندەترین دەوڵەتانی پۆلیسی جیهانی بنیاتناوە و کۆمەڵێک لە دارودەستەکانی بەکاردێنێت کە ئەوانیش وەک خۆی لە بەرامبەر ئەم کردەوە تاوانبارانە بەرپرســـیارن. گروپی ناحکوومی INDICT ماوەیەک پێش لە ئێستا ناوی ١٢ کەس لەوانـــەی بلاو کردەوە کە شـــایانی ئەوەن لە دادگایەکـــی نێونەتەوەییدا دادگایی بکرێن. ئەم ١٢ کەسە بریتین لە:

١- ســـەدام حوسەین، سەرۆک کۆماری عێراق و سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش (RCC)

٢- عەلی حەســـەن ئەلمەجید، ناســـراو بە عەلـــی کیمیایی کە ئەو نازناوەی لەبەر ئەوە پێبەخشراوە کە خولیای ئەوە بووە چەکی کیمیایی دژی کوردەکانی عێراق و هێزەکانی ئێران لە کاتی شەڕی ئێران و عێراقدا بەکاربێنێت. عەلی کیمیایی هەروەها سوپاسالاری کوەیتی داگیرکراو بووە و ئەمدوایانە لە میانەی ســـەرکوتی خەڵکی باشـــوور بـــووە بە حاکمی باشووری عێراق. کاتێک مرۆڤێک یەک لە دوای یەک تاوان ئەنجام بدات، وێنەی هەموو تاوانەکانی روون دەبێتەوە.

٣- عودەی[٢٣٤]، کوڕی گەورەی ســـەدام، کە فەرماندەی رێکخراوێکی میلیشیایی درندەیە کە دەسەلاتی سەدام دەپارێزێت.

٤- قوســـەی [٢٣٥]، کوڕی بچوکی ســـەدام، کە سەرۆکی رێکخراوێکی

ئاسایشی تایبەتە و بە بۆچونی زۆر کەس دەبێت بە جێنشینی سەدام.

٥- محمد هەمزە ئەلزوبەیدی[٢٣٦]، جێگری سەرۆک وەزیرانی عێراق

٦- تەها یاسین رەمەزان، جێگری سەرۆک کۆماری عێراق

٧- بەرزان ئەلتکریتی[١٣٧]، سەرۆکی پێشووی ئیستخباراتی عێراق

٨- واتبان ئەلتکریتی[٢٣٨]، وەزیری پێشووی ناوخۆی عێراق

٩- سەبعاوی ئەلتکریتی[٢٣٩]، سەرۆکی پێشووی ئیستخبارات و رێکخراوی ئەمنی گشتی

١٠- عیزەت ئیبراهیم ئەلدوری، جێگری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق و سەرۆکی پێشووی دادگای شۆڕشی عێراق

١١- تاریق عەزیز، جێگری سەرۆک وەزیرانی عێراق

١٢- عەزیز سالح نوعمان[٢٤٠]، حاکمی کوەیت لە کاتی داگیرکرانی کوەیت

## ئەنفال، هەڵەبجە و تەعریب رەوایەتی بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق دەدەن

### ئەنجومەنی نوێنەران

### ٩ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢

کۆنگرێسمەن شادیگ:[٢٤١] جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، دەمەوێت لە بارەی ئە و مەسەلەیە قسە بکەم کە بۆ دەبێ رێگە بەوە بدەین ئەمریکا لەم بارودۆخەدا هێزی سەربازی دژی عێراق بەکاربێنێت. من دەرک بە نیگەرانی هەندێ لە ئەندامانی کۆنگرێس دەربارەی بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق دەکەم بەڵام هەندێ جار جەنگیش پێویستە. بەداخەوە مێژووی دەسەڵاتی سەدام حوسەین نیشانیداوە کە جگە لە رێگاچارەی سەربازی، هیچ رێگاچارەیەکی دیکە ئەنجامی نابێت. هەرچەند ئێمە هەوڵمانداوە دان بە خۆدا بگرین، بەڵام مێژوو نیشان دەدات کە سەدام حوسەین دان بە خۆدا ناگرێت.

پاش جەنگی کەنداو، سەدام بەڵێنیدا کۆتایی بە هەوڵەکانی بهێنێت بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی و بیۆلۆژیکی، سەدام بەوە رازی بوو کە کۆتایی بە هەوڵەکانی بۆ بەدەستهێنانی چەکی ناوکی بێنێت، بەوە رازی بوو کە کۆتایی بە هەوڵەکانی بۆ وەدەستخستن و پێشخستنی موشەکی دوورهاوێژو سیستمی سەربازی دیکە بهێنێت. مێژووی ١١ ساڵی رابردوو نیشانیداوە کە دان بە خۆداگرتن بەرامبەر بە عێراق رێگاچارە نییە و سەدام سەری لە نەرمو نواندن نابێتەوە.

جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، لە کۆتایی قسەکانمدا ئاماژە بە وتارێکی جێفری گۆڵدینبێرگ[٢٤٢] بە ناوی « ترۆری گەورە »[٢٤٣] دەکەم کە ٢٥ی ئاداری ٢٠٠٢ لە رۆژنامەی «نیۆیۆرکیر»دا[٢٤٤] بڵاوبوەتەوە. لەم وتارەدا نووسەر لەگەڵ کۆمەڵێک لە قوربانیانی (کوردی) هێرشەکانی سەدام حوسەین بۆ سەر هاووڵاتیانی خۆی گفتگۆی کردوە. بە وتەی نووسەر ژمارەی قوربانییە کوردەکانی هێرشەکانی سەدام حوسەین ٥٠ تا ٢٠٠ هەزار کەسە. ئەمەش دەقی وتارەکەیە:

## ترۆری گەورە[٢٤٥]
## جێفری گۆڵدینبێرگ

لە باکوری عێراق بەڵگە و نیشانەیەکی نوێی شاڵاوەکانی سەدام حوسەین بۆ ژینۆسایدی کورد و پەیوەندییەکانی سەدام لەگەڵ ئەلقاعیدە دەردەکەوێت. سەرلەبەیانی ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ هلیکوپتەرێکی سوپای عێراق لە سەر ئاسمانی هەڵەبجە دەرکەوت کە ١٥ میل لە سنوری ئێران دوورە. شەڕی ئێران و عێراق پێینابوە هەشتەمین ساڵ و هەڵەبجە لە هێڵی هەرەپێشووی شەڕەکەوە بوو. ئەو کاتە ٨٠ هەزار کەس لە شاری هەڵەبجە دەژیان کە هەموویان توندوتیژی جەنگ بۆیان شتێکی ئاسایی

بوو و ببوو به بەشـــێک لـــە ژیانی ڕۆژانەیان. وەک زۆربەی شـــارەکانی کوردســـتانی عێراق، هەڵەبجە بەردەوام دژی ڕژێمی سەدام حوسەین لە ڕاپەڕیندا بوو[٢٤٦] و خەڵکی هەڵەبجە پشـــتیوانیان لە هێزی پێشـــمەرگە دەکرد.

## شایەتحاڵەکانی کیمیابارانی هەڵەبجە

ژنێکی گەنج بە ناوی نەســـرین عەبدلقادر محەمـــەد[٢٤٧] لە دەرەوەی ماڵەوە بـــوو و خەریکی کڕینی خۆراک بوو کە هلیکۆپتەرەکەی عێراقی بینی. تازە ئێران و پێشمەرگە هێرشیان کردبوە سەر بنکە سەربازیەکانی عێـــراق لە دەوروبەری هەڵەبجە و ســـەربازەکانی عێراقیان ناچار کردبوو پاشەکشە بکەن. سوپای پاســـدارانی کۆماری ئیسلامی پاشان هاتە ناو شـــار و خەڵکی هەڵەبجە دڵنیابوو عێراق بە شـــێوەیەک لە شـــێوەکان وەڵام دەداتەوە. نەســـرین و بنەماڵەکەی ڕۆژێکی دیکەیان لە ژێرزەمینی ماڵەکەی خۆیان لە چاوەڕوانیدا تێپەڕاند کە ســـارد و تاریک بوو، بەڵام ئەوەندە قایم بوو کە هیچ گولە تۆپێک یان بۆمبی ناپاڵم کاری لێنەدەکرد. نەسرین دەڵێت:

« دەوروبەری کاتژمێر ١٠ تا ١٠ و نیوی سەرلەبەیانی هلیکۆپتەرێکم بینی، بەڵام هێرشی نەکرد. دوو کەسم لە ناو هلیکۆپترەکەدا بینی کە بە کامێرا وێنەیان دەگرت. یەکێکیان کامیرایەکی ئاسایی وێنەگرتنی پێبوو، ئەوی دیکەشیان کامیرایەکی بە دەستەوە بوو کە لە کامیرای گرتنی ڤیدیۆ دەچوو. هلیکۆپتەرەکە زۆر لە زەوی نزیک بوەوە و پاشان دوورکەوتەوە. ئەوە شتێکی ئاســـایی نەبوو، بەڵام من سەرقاڵی لێنانی چێشتی نیوەڕۆ بووم. من و ڕەنگینی خوشـــکم، نانمان دەکرد و برنج و فاسۆلیامان پاک دەکـــرد بۆ ئەو ٣٠-٤٠ خزم و کەســـوکارە کە لـــە ژێرزەمینەکەدا خۆیان حەشـــاردابوو. ڕەنگینی خوشکم ئەو کاتە تەمەنی ١٥ ساڵ بوو، خۆیشم تەمەنم ١٦ ساڵ بوو، بەڵام باوکم چەند مانگ پێش لەوە دامیبوو بە شوو

به ئامۆزایەکەم بە ناوی بەختیار عەبدولعەزیز[٢٤٨] کە تەمەنی ٣٠ ساڵ بوو و یاریدەدەری پزیشک بوو»

هەڵەبجە شارێکی عەشایرییە و ژمارەیەکی زۆر لە ژنەکانی جلوبەرگی کوردی لەبەر دەکەن، بەڵام شـــارە کوردنشـــینە کراوەترەکانی دیکەی باکووری رۆژئاوای عێراق و شـــارە عەرەبنشـــینەکانی باشوور جلوبەرگی جیهانی لەبەر دەکەن.

بومبارانی هەڵەبجە پێش لە کاتژمێر ١١ دەستیپێکرد. سوپای عێراق لە سەر جادەی سەرەکی سەید سادیق بۆ هەڵەبجە جێگیر بوو، هەڵەبجەی تۆپباران کرد و فرۆکەکانی عێراق دەســـتیانکرد بە کیمیابارانی هەڵەبجە بە بۆمبی ناپاڵم، بەتایبەت باکووری شاری هەڵەبجە.

نەسرین دەڵێت:

« من و رەنگینی خۆشـــکەم رامانکرد بۆ نـــاو ژێرزەمینەکە، لە خوا دەپاڕامـــەوە کە بەختیاری شـــووم کە ئـــەو کاتە لە درەوەی شـــاربوو ســـڵامەت بێت. تا کاتژمێر ٢ی نیوەڕۆ هێرشـــەکان رووی لە کەمبوون کـــرد و من بە وریاییەوە لـــە ژێرزەمینەکە هاتمە دەرەوە و چوومە نێو چیشـــتخانەی ماڵەکەمان بۆ ئەوەی چێشـــت بێنم بۆ کەسوکارەکەم. لە کۆتایی بومبارانەکەدا هەستم کرد دەنگی بۆمبەکە گۆڕا. دەنگی زۆر بەرز نەبـــوو، دەنگی وەک کەوتنەخوارەوەی ئاســـتێکدا بوو کە نەتەقێتەوە. ئێمە نەماندەزانی بۆ دەنگی ئەوەندە کەمە» تۆزیک لەو لاتر لە گەڕەکی جوولەکەکان (هەرچەند کە جوولەکەکان لە ١٩٥٠ کاندا کۆچیان کردبوو بۆ ئیســـرائیل) پیاوێکی تەمەن ٤٠ ساڵ بە ناوی محەمەد لە ژێرزەمینەکەی هاتەدەرەوە و دیمەنێکی نائاســـایی بینـــی: هلیکوپتەرەکە گەڕابووە بۆ ناو شـــار و سەربازەکان کاخەزی ســـپییان لە هلیکۆپتەرەکە فڕێدەدایە خوارەوە. یەکسەر زانی کە دەیانەوێت بزانن ئاراستەی با بەرەو کام لایە و چەندە توندە. لەو دەوروبەرە پیاوێک بە ناوی ئاوات عومەر[٢٤٩] کە ئەو کاتە تەمەنی ٢٠ ساڵ بوو، بە بۆنی سیر و سێو تێکچوو.

نەسرین دەڵێت:

« زوو چێشتەکەم لە چێشتخانە کۆ کردەوە، بەڵام هەستم بە بۆنێکی نائاسایی کرد کە با هێنابووەیە ناوماڵەوە. سەرەتا بۆنەکە ناخۆش بوو وەک بۆنی زبڵ بوو بەڵام پاشتر خۆش بوو وەک بۆنی سێوێکی شیرین و پاشان بوو، بە بۆنی هێلکەی گەنیو. پێش ئەوەی بڕۆمە خوارەوە بۆ ناو ژێرزەمین، چووم سەیرێکی کەوەکەمان بکەم کە باوکم لە ناو قەفەسێکدا لـــە ماڵەوە دایانابوو، کەوەکە مردبوو. لە پەنجەرەوە ســـەیری دەرەوەی ماڵـــم کرد، بێدەنگی بوو، بەڵام ئاژەڵەکان مـــردار ببوونەوە، بزن و مەڕ مردار ببونەوە. ڕامکرد بۆ ناو ژێرزەمینەکە، بە کەسوکارەکەم وت شتێکی نائاسایی ڕوویداوە، کەشوهەواکە نائاساییە. کەسوکارەکەم ترسان، ئەوان بۆ ئەوە هاتبوونە نـــاو ژێرزەمینەکە کە بەر بومباران نەکەون و نەدەکرا لـــە ژێرزەمینەکە بڕۆنە دەرەوە. بەحاڵ روناکی دەهاتە ناو ژێرزەمینە،کە بەڵام ئەو تاریکییە هەستێکی ئارام و خۆشی تێدابوو، دەمانەویست هەر لەوێ بمێنینەوە هەرچەند کە نەخۆشیش کەوتبووین. لەناکاو هەستم بە ئێشـــێکی زۆر توند لە چاوما کرد، وەک ئەوە وابوو دەرزییان چەقاندبێت بە چاومدا. خوشـــکەکەم لە نزیکەوە سەیری چاومی کرد و وتی چاوت زۆر ســـوور بووە. پاشـــان منداڵەکان دەســـتیان کرد بە ڕشانەوە. زۆر ئێشـــیان هەبوو و زۆر دەگریان، بەردەوام دەگریان، دایکیشـــم دەگریا، پاشان ئەوانەش کە تەمەنیان زۆر بوو دەستیان کرد بە ڕشانەوە.»

فڕۆکەکانـــی عێراق چەکی کیمیاییان لە هەڵەبجە دابوو، دەیانزانی کە تەنانەت ژێرزەمینەکانیش دەبن بە ژووری پڕ لە گاز. نەسرین دەڵێت:

« مامـــم وتی دەبێ لێرە بڕۆینە دەرەوە. دەمانزانی کە کیمیایی بڵاو بوەتەوە، چاومان ســـوور بووبوو، هەندێکیشمان ئاو لە لوت و دەمییەوە دەهاتە دەرەوە، بڕیارماندا ڕابکەین، من و کەســـوکارەکەم بە وریاییەوە هاتینـــە دەرەوە، مانگاکەمـــان پاڵ کەوتبوو، بەحاڵ هەناســـەی دەدا. بەرگی دارەکان کە تازە شـــین بوبوون، وەریبوو هەرچەند بەهاریش بوو،

کەوەکەمـــان مردبوو، پەڵەهـــەوری دووکەڵ بە دەوروبـــەردا دیاربوو کە خەریکبوو بەسەر زەویدا دەنیشـــتەوە. کیمیاییەکە لە هەوا قورستر بوو و کەوتبووە ناو چاڵ و چۆڵەکاندا. بنەماڵەم ســـەیری ئاراستەی باکەیان کرد و بەپێچەوانەی ئاراســـتەی باکە رایانکرد بەڵام راکردن ئاسان نەبوو. منداڵـــەکان نەیاندەتوانی بڕۆن بەڕێوە، زۆر نەخۆش بوون، رەشـــانەوە تەنگی پێهەڵچنیبوون، بە باوەشی ئێمەوە بوون.»

خەڵکـــی دیکەش هەوڵیاندەدا ڕابکەن، نـــوری حەمە عەلی[٢٥٠] کە لە گەڕەکێکـــی باکوروی هەڵەبجە دەژیا هەوڵیـــدا بنەماڵەکەی ببات بەرەو عەنەب کە کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێکردن بوو لە دەوروبەری هەڵەبجە کە ئـــەو خەڵکەی تێدا دەژیا کە کاتی خۆی ســـوپای عێراق گوندەکانیانی کاول کردبوو. نوری دەڵێت:

« لە سەر رێگای عەنەب ژمارەیەکی زۆر ژن و منداڵ تازە مردبوون، پەلە هەوری کیمیایی بەســـەر زەویەوە دیار بوو، کیمیایەکە قورس بوو، دەمانبینی، تەرمی خەڵک لە هەموو شـــوێنێک کەوتبوو، ئەگەر منداڵێک نەیتوانیبایا بـــڕوا بەڕێوە، دایک و باوکی بەجێیان دەهێشـــت، ئەوەندە پەشـــۆکا و ترسابوون. تەرمی پیرەژن و پیرەمێرد و منداڵێکی زۆر لە قەراخ جادەکە کەوتبوو. منداڵ، پیرەمێرد و پیرەژن رایاندەکرد و کاتێک کە نەیاندەتوانی ئیدی هەناسە بدەن دەکەوتن و دەمردن.»

بنەماڵەی نەسرین هێدی دەڕۆیشتن بەڕێدا. نەسرین دەڵێت:

« دەمانەویســـت دەموچاومان بشـــۆین و ئاو بدۆزینـــەوە بیخۆین، دەمانەویســـت دەموچاوی منداڵەکان بشـــۆین کە دەڕشانەوە منداڵەکان دەگریان بۆ ئاو، پودرێکی سپی بەسەر زەویەوە بوو. نەماندەتوانی بڕیار بدەیـــن ئاوەکە بخۆینەوە یان نا، بـــەڵام هەندێ کەس زۆر تینوو بوون و ئاویـــان لە چاڵێکدا خواردەوە ئێمە هەموومان بە ترســـەوە لە هەڵەبجە رامان کرد. لە ســـەر رێگای عەنەب بۆمبـــاران ناوەبەناوە بەردەوامبوو. فڕۆکەکان بە ئاســـماندا دەسوڕانەوە هەر کەســـێک جۆرێک ئاسەواری

کیمیایـــی پێوە دیاربوو، ژنێک پودری کیمیایی لێیدابوو و لەشـــی ببوو بـــە بلـــۆق. لۆرییەک هات کە هی دراوســـێیەکمان بـــوو، خەڵک خۆیان تێهاویشـــت، بینیمان خەڵک بەســـەر زەویەوە کەوتون و لەشیان وشک بـــووە. منداڵێکی کۆرپە بە ســـەر زەویەوە کەوتبـــوو، تۆزێ لەولاترەوە دایکیشـــی کەوتبوو، پێموابـــوو هەردوویان خەوتوون، بـــەڵام دایکەکە کۆرپەکەی فڕیدابوو و خۆیشـــی کتوپڕ مردبوو، دیاربوو کۆرپەکە بە سەر دەســـتوپێدا هەوڵیدابوو لە دایکی دور بکەوێتەوە بەڵام ئەویش مردبوو. من و بنەماڵـــەم پێمانوابوو لۆریەکە بـــەرەو بەرزایی دەچێت بۆ ئەوەی نەمرین بەڵام لەناکاو لۆریەکە راوەستا، شۆفیرەکەی وتی لەوە زیاتر خۆم پێڕاناگیرێت، ژنەکەی لە پشـــت لۆریەکەوە بەجێهێشت و بە ئێمەی وت ئەگەر دەتوانن ڕاکەن. کیمیایی کاری کردبوەوە ســـەر مێشـــکی، چونکە ئەگەر وانەبوایا بنەماڵەکەی بەجێنەدەهێشت.»

کاتێک کە پەلەهەورێکی قورســـی کیمیایی باڵی بەسەر شاردا کێشا، خەڵکەکە گێژبوون و نەخۆشکەوتن. ئاوات عومەر لە ژێرزەمینی ماڵەکەیدا خۆی و بنەماڵەکەی گیریان کردبوو. ئاوات عەمەر دەڵێت:

« براکەم کۆنترۆڵی لە دەستی خۆیدانەمابوو، قاقا پێدەکەنی، پاشان جلەکانـــی دەرهێنا و تۆزێک پاش ئەوە مرد، شـــەو کە هات منداڵەکانم زۆر نەخـــۆش کەوتن، ئەوەندە نەخۆش بـــوون کە نەیاندەتوانی بەڕێگادا بڕۆن.»

نەسرین شووەکەی نەدۆزییەوە، پێیوابوو مردووە، دەستی منداڵەکانی گرت و بردنی بۆ ســـەر جـــادەی عەنەب. لە گەڕەکێکـــی دیکە محەمەد ئەحمەد فەتاح[٢٥١] کە تەمەنی ٢٠ ســـاڵان بوو بە بۆنی شیرینی سۆلفۆر تێکچـــوو، خێـــرا زانی کە دەبـــێ بنەماڵەکەی لـــە ژێرزەمینەکە بباتە دەرەوە، ژێرزەمینەکە نزیکەی ١٦٠ کەســـی تێدابـــوو. محەمەد ئەحمەد فەتاح دەڵێت:

« بینیم فڕۆکەکان بۆمبیان بەردایە خوارەوە، شـــوێنی بۆمبارانەکە

نزیکەی ٣٠ مەتر لەو ماڵــــە دووربوو کە ئێمە لە ژێرزەمینەکەیدا خۆمان شــــاردبوەوە، خێرا دەرگای ژێرزەمینەکەم داخســـت، خەڵکەکە هاواریان دەکرد و دەگریان، پاشان نەفەسیان تەنگ بوو. یەکەم کەس کە کیمیاییەکە کاری تێکرد سەلاحی برام بوو، چاوی شین و سوور بوو، شتێک لە چاوی دەهاتـــە دەرەوە، ئەوەنـــدە تینوو بوو کە داوای ئـــاوی دەکرد، خەڵکی دیکەش دەلەرزین. بڕیار بوو من ڕۆژی ١٦ی ئادار زەماوەند بکەم، هەموو ئامادەکاریەکـــەم کردبوو، دەزگیرانەکەم کە نـــاوی بەهار جەماڵ[٢٥٢] بوو یەکێ لەو کەســـانە بوو کە زوو لە ژێرزەمینەکەدا مرد، زۆر زۆر دەگریا هەوڵمدا ئارامی بکەمەوە، پێموت ئەمە تەنها تۆپبارانێکی ئاساییە، بەڵام وتی ئەوە بۆنی چەکی ئاسایی نییە، دەزگیرانەکەم ژیر بوو، دەیزانی چی ڕوودەدات، لە سەر پلەکان گیانی دەرچوو، باوکی هەوڵیدا یارمەتی بدات بەڵام ئیدی زۆر درنگ بوو.

ئەوانی دیکەش خێـــرا مردن. ژنێک بە ناوی حەمیـــدە مەحمود[٢٥٣] هەوڵیدا کچە دوو ساڵانەکانی لە مەرگ ڕزگار بکات، شیری خۆی دەدایە، پێیوابوو ئەگەر کۆرپەکەی شیر بخوات گازی کیمیایی هەڵنامژێ، منداڵەکە ناوی دەشنێ[٢٥٤] بوو، ماوەیەکێ درێژ شیری خوارد، دایکی مردو ئەویش هەر مەمکی دایکی دەمژی. بڕیارمدا بڕۆمە دەرەوە، زۆربەی ئەو کەسانە کـــە لە ژێرزەمینەکەدا بوون ئاگایان لە خۆیان نەمابوو، زۆرێکیان مردن، دایک و باوکم و سێ خوشک و برام مردن».

نەسرین دەڵێت:

« لە ســـەر جادەی عەنەب هەموو کەس گێژ ببوو، من و منداڵەکان بەرەوە بەرزایی ڕامانکرد، هەموومـــان کوێر ببوین، منداڵەکان دەگریان، هیچمـــان نەدەبینی، چاوم خوێنی لێدەهات. لەو بشـــێوییەدا ئەندامانی بنەماڵـــەکان لەیـــەک دابڕان، دایک و باوکم ون بوون، من و خوشـــک و ئامۆزاکانم دەستی منداڵەکانمان گرت و لەکاتێکدا کە ئاگامان لە خۆمان نەبوو ڕێگای گەڕانەوە بۆ ناو شارمان گرتەبەر، کەسێک (کە نەمدەناسی)

گەڕاندینیه دواوه و خستینیه سەر ئەو ڕێگایه کە بەرەو بەرزایی دەچوو، گەیشــتینه مزگەوتێک کە خەڵک خۆیان تێدا حەشاردابوو، بەڵام ئێمه له مزگەوتەکەدا نەماینەوه، چونکه دەترســاین هێرشی بکرێته سەر. چوینه نــاو ماڵێک لەو نزیکانه، گەڕام به شــوێن خواردەمەنــی بۆ منداڵەکان، پاشان شەوی بەسەردا هات، منیش دەستپاچه بووم»

بەختیاری شووی نەسرین دەڵێت:

« کاتێک هێرشــەکه دەســتیپێکرد له دەرەوەی شار زۆر به شوێن ژن و بنەماڵەکەمــدا گەڕام، له بنکەیەکی تەندروســتی دوو دانه دەرزی ئاترۆپینم[٢٥٥] دۆزییەوەوه، دانەیەکیانم دا له خۆم، ئەوه نەیهێشت گازی دەمار بەسەرمدا زاڵ بێت، به شوێن نەسریندا دەگەڕام، بەڵام هیوام نەبوو به زیندوویی بیدۆزمەوه، بیرم له ناشــتنی تەرمەکەی دەکردەوه، لانیکەم دەبوایا بمناشتایا. پاش چەند کاتژمێر گەڕان، چەند کەس له دراوسێکانم بینی، وتیان نەســرین و منداڵەکانیان بینیوه کە بەرەو مزگەوتی ســەر تەپۆڵکەکه رایانکردووه. بانگم کرد نەســرین، نەســرین. دەنگی گریانم بیســت، چوومه ناو ماڵەکه، نەســرینم بینی کە زیندوو بوو، بەڵام کوێر بوو، هەموویان کوێر بووبوون. یەک- دوو کاتژمێر پێش له گەیشتنی من، نەسرین کوێر ببوو، به چنەماش له ناو ماڵەکەدا به شوێن خواردەمەنیدا دەگەڕا بۆ منداڵەکان». نەسرین دەڵێت:

« تۆزێ شیرم دۆزیەوه، به چنەماش چووم بۆ لای منداڵەکان، دەمی منداڵەکانم گرت و شــیرەکەم دانێ. بەختیار منداڵەکانی کۆکردەوه، من دەمەویســت بیانبەم بۆ لای بەلوعەی ئاوەکه، سەری منداڵەکانم شۆرد، دووبەدوو دەمبردن و سەرم دەشۆردن، هەندێکیان نەیاندەتوانی له جێی خۆیان هەڵسن، نەیاندەتوانی له سەر پێی خۆیان رابوەستن»

بەختیار دەڵێت:

« دەرزییەکــی ئاترۆپینم پێمابوو، بەڵام نەمــدا له ژنەکەم، چونکه کەسی له و خراپتر له ناو گروپەکەدا هەبوو، ژنێک هەبوو ناوی ئەسمه [٢٥٦]

بوو که دراوسێمان بوو، بانگم کرد بەڵام نەیدەتوانی هەناسە بدات، هاواری دەکرد، بەرەو دیوارێک رایکرد، سەری خۆی کوتا بە دیوارەکەدا، دەرزییەکەم دا لەو ژنە بەڵام تۆزێک پاش ئەوە مرد، دەمتوانی دەرزییەکە بدەم لە نەسرین بەڵام دام لەو ژنە»

پاش ئەوە کە بۆمبارانەکانی عێراق کەمی کرد، هێزەکانی ئێران توانیان هەڵەبجە بگرنەوە و ژمارەیەکی زۆر لە بریندارەکانیان لە هەڵەبجە بردە دەرەوە کە یەکێکیان نەسرین و چەند کەسێکی دیکە لە ئەندامانی بنەماڵەکەی بوون و بردنیان بۆ نەخۆشخانەکانی تاران.

نەسرین دەڵێت:

« بە ماوەی ٢٠ رۆژ هیچم نەدەبینی. بەردەوام بیرم لەوە دەکردەوە بنەماڵەکەم لە کوێن؟ بەڵام کوێر بووم، هیچم لە دەست نەدەهات، هەواڵی دایکم لە شووەکەم پرسی، وتی «هیچ هەواڵێکیان نازانم. لە نەخۆشخانەکانی تاران بە شوێنیاندا گەڕام، بەڵام هیچ هەواڵێکم دەستنەکەوت» رێکخراوی مانگی سووری ئێران کتێبێکی بڵاو کردەوە کە وێنەی ئەو کەسانەی تێدابوو کە لە هەڵەبجە مردبوون. هەروەها کتێبێکی بڵاو کردەوە کە وێنەی ئەوانەی تێدابوو کە لە ئێران نێژرابوون، وێنەی دایکمان لە کتێبەکەدا بینی، خەبەرم پێگەیشت باوکم نەمردووە، بەڵام بۆ هەمیشە کوێر بووە.

پێنج کەس لە خوشک و براکانم کە یەکێکیان رەنگین بوو مردن. دکتۆرەکان پێیانوتم من نامرم، بەڵام شتێکیان پێوتم کە وەک نهێنییەک لە بەختیاری شووم شاردەوە. کاتێک لە نەخۆشخانە بووم سووڕی مانگانەم دەستیپێکرد، ڕانەدەوەستا، ئێمە لە ناو کۆمەڵگای خۆماندا قەت باسی ئەو شتانە ناکەین، بەڵام کەمکەم ژمارەیەکی دیکە لە ژنە برینداەکانی ناو نەخۆشخانە دانیان بەوەدانا کە تووشی هەمان کێشە بوونەتەوەو خوێنیان راناوەستێت. دوکتۆرەکان دەوا و دەرمانیان دامێ بۆ ئەوەی خوێنبەربوونەکەم رابوەستێت، بەڵام پێیانوتم ئیدی منداڵم

نابێـــت. چەند مانگ لە ئێران بووین، کەمکەم خۆم و بەختیار گەڕاینەوە بۆ کوردســــتان. باوەڕم بە قسەی ئەو دکتۆرانە نەدەکرد کە پێیانوتبووم ئیدی منداڵـــم نابێت، هەر واش بوو، ســـاڵی ١٩٩١ منداڵم بوو، ناوم نا ئارەزوو[٢٥٧] سەرەتا هیچ عەیبی نەبوو بەڵام دڵی کونی تێدابوو، ئەوەبو لە تەمەنی سێ مانگیدا مرد»

من نەســـرینم مانگی پێشـــوو لە هەولێر بینی کە گەورەترین شاری کوردســـتانی عێراقە نەسرین ئێســـتا تەمەنی ٣٠ ساڵە، بووە بە ژنێکی جوان و خوێنشیرین، چاوی قاوەییە و ئێسکی گۆنای هەڵگۆزیوە، روومەتی تۆزێـــک تێکچووە، بـــەڵام قەت خەفەتی ئەوە ناخـــوات، وەک دکتۆرێک خزمەتی خۆی دەکات، ورەی بە قەت پێش لە کیمیابارانەکەی ١٤ ساڵ لەمەوبەر بەرزە. نەســـرینیش وەک گەلێ لە قوربانیانی دیکەی ســـەدام حوسەین چیرۆکی بەسەرهاتی خۆی بە خوێنساردیەوە دەگەڕاندەوە

لە کاتی ســـەردانەکەم بۆ کوردســـتان، لەگەڵ زیاتر لە ١٠٠ کەس لە قوربانیانی شاڵاوەکانی ســـەدام حوسەین دژی کوردەکان گفتوگۆم کرد. ســـەدام هەر لە سەرەتای بەدەسەڵات گەیشـــتنی، کوردەکانی ئازارداوە یانـــی لە ٢٠ ســـاڵ لەمەو پێش. گەلێک لەو پیرەژنانە کە شـــووەکانیان بەدەســـتی هێزەکانی ئاسایشـــی ســـەدام کوژراون، ئەوەندەی سەگێک رقیان لێیەتی،بـــەڵام زۆربەی خەڵک، لەوانە نەســـرین چیرۆکی کردەوە دڕندانەکانی ســـەدام وەک خـــۆی و ئەوەندە بە دیقەتـــەوە دەگێڕنەوە کە مرۆڤ ناتوانێت شـــک لە راســـتبوونی بکات. راستبوون بۆ کوردەکان گرنگە، هێشـــتا هەســـت دەکەن کە پاش تیپەڕبوونی ئەم هەموو ساڵە جیهان باوەڕ بە بەسەرهاتەکەیان ناکات.

حەفتەیەک پاش ئەوەی نەسرینم بینی، سەردانی گوندێکی بچوکم کرد کە ناوی گۆپتەپە[٢٥٨] بوو، کە هەڵکەوتووە لە ناو دۆڵێکی سەرسەوزدا کـــە زنجیرە چیایەکی پڕ لە بەفر دەوریـــداوە. گۆپتەپە ٦ حەفتە دوای هەڵەبجە کیمیاباران کرا گۆپتەپە لە کۆمەڵێک خانووی هەرگینی بچوک

پێکهاتووه کە کۆمەڵێک کۆڵانی پیســـی تێدایە. لە گۆپتەپە پیاوێکی پیر بەناوی ئەحمەد رەزا شەریف[٢٥٩] پێمیوت:

«رۆژی کیمیابارانەکە لە ســـی گوڵانـــی ١٩٨٨ لە رەز و باخەکانی دەرەوەی گوندەکەمـــان بووم. بینیم چەند بۆمبێک تەقیەوە و گازێک لە هەوادا بڵاو بوەوە کە بۆنی ســـێوی گەنیوی دەدا. کوڕەکەم، عوسمان ئەحمـــەد کـــە ئەوکاتە تەمەنی ١٦ ســـاڵ بوو لە نزیـــک مزگەوتی گوند دانیشـــتبوو کە کیمیاییەکە لێیـــدا، بە چنەماش لە ســـەر تەپۆڵکەکان رۆیشـــتبووە خوارەوە و لە ناو نەیجەکانـــی روباری زابی بچووک ( کە لە پەنای گونددا تیپەڕ دەبێت) گیانی دەرچووبوو. دەمزانی مردووە، بەڵام تەرمەکەیم نەبینی».

عوســـمان ئەحمەد وەک ١٥٠ کەســـی دیکە لەو هێرشـــەدا گیانیان لەدەستدا. ئەوانەش کە نەمردن لە دەستی سوپای عێراق هەڵاتن، سوپای عێراق هاتە ناو گوند و تەختیان کرد. ئەحمەد رەزا شـــەریف هەتا ســـێ ســـاڵ دوای ئەوە نەگەڕایەوە بۆ ناو گوندەکەیان. ئەحمەد رەزا شـــەریف دەڵێت:

«کە گەڕامەوە بۆ ناو گوند خێرا دەســـتم کرد بە گەڕان بە شـــوێن تەرمی کوڕەکەمدا، تەرمەکەم دۆزییەوە کە هێشـــتا لـــە ناو نەیجەکاندا کەوتبوو، کە بینیم یەکسەر ناسیمەوە».

خـــۆری عێراق زۆر تیژە و تەرمی مرۆڤی مردوو پاش ســـێ ســـاڵ ناناسرێتەوە، بۆیە من هەوڵمدا بە زمانێکی نەرم حاڵی بکەم کە گومانم لە راستبوونی قسەکانیدا هەیە، بەڵام وەرگێڕەکەم زۆر راشکاوانە پێیوت باوەڕ بە قســـەکانی ناکەم. ئەو کاتە کە قســـەمان دەکرد لە حەوشـــەی ماڵێکی هەڕگینی پیاوێک بە ناوی ئیبراهیم عەبدولڕەحمان دانیشتبووین. ٢٠ یـــان ٣٠ کەس لە دەورمـــان کۆببونەوە کە هەندێکیـــان کوڕ بوون. هەندێکیان ئەوەیان پێناخۆش بوو کە من گومانم لە راستبوونی قسەکانی ئەحمەد دەربڕیبوو، بەڵام ئەحمەد رەزا شەریف ئارامی کردنەوە و وتی:

«راستە، کوڕەکەم هیچ گۆشت بە لاشەیەوە نەمابوو، تەنها ئێسک و پروسک بوو، بەڵام جلوبەرگەکەی هێشتا نەپتورکابوو، بە جلوبەرگەکەیدا ناسیمەوە، پشـــتوێن و کراســـێکی لەبەردابوو، لە گیرفانی کراسەکەیدا سویچی تراکتۆرەکەمانم دۆزییەوە، هەمیشە سویچەکەی دەخستە ناو ئەو گیرفانەی»

هەندێ لە خەڵکی گۆپتەپە هێشتا لەوە نیگەران بوون کە من گومانم لە ڕاستبوونی قسەکانیاندا هەبێت. ئیبراهیم، خاوەنی ئەو خانوە کە ئێمە لە حەوشەکەیدا دانیشـــتبووین، کۆمەڵێک لەو کوڕانەی کە بە دەورماندا کۆ ببوونەوە راســـپارد کارێک بکەن، کوڕەکان ڕۆیشـــتن بۆماڵەوە و بە دەستی پڕ لە پارچەی ئاسنینی بۆمبە کیمیاییەکان گەڕانەوە و ڕژاندیانە بەر پێی من. ئیبراهیم وتی:

«فەرمـــوو، ئەمانە ئاســـەواری خێر و بەرەکەتەکانی مام ســـەدام حوسەینە»

## هەڵەبجە دوای کیمیاباران

چیرۆکـــی هەڵەبجە ئەو شـــەوە کۆتایـــی پێنەهات کـــە فڕۆکەکانی عێراق گەڕانەوە بۆ بنکەکانیان. ئێرانیەکان ڕۆژنامەنوســـە بیانیەکانیان بانگهێشـــتی هەڵەبجە کرد بۆ ئەوەی وێنەی کارەســـاتەکە تۆمار بکەن. وێنەی قوربانیەکان کە کەوتبوونە سەر یەک و سپی ببوونەوە و لە هەموو چۆم و قوژبنێکی شـــاردا کەوتبـــوون، جیهانی تۆقاند. کیمیابارانکردنی هاووڵاتیانی خۆی لەلایەن ســـەدام حوسـێـنەوە پاش هۆلۆکاست یەکەم نمونە بوو کە تێیدا کەڵک لە ماددەی کیمیایی وەرگیرابێت بۆ کوشـــتنی ژن و منداڵ.

عەلی حەسەن ئەلمەجید، ئامۆزای سەدام کە لە کۆتایی هەشتاکاندا بەڕێوەبەری شـــاڵاوی قڕکردنی کوردەکان بوو، لە کاسیتێکدا کە دەنگی تۆمار کراوە (کە پاشـــان کەوتە دەستی کوردە ڕاپەڕیوەکان و ڕێکخراوی «چاودێری مافی مرۆڤ»)[٢٦٠] لە کۆبوونەویەکدا لەگەل بەرپرسانی حیزبی

بەعس لە بارەی کوردەکان وتی:

«هەموویان بە چەکـــی کیمیایی دەکوژم، کێ دەیەوێت هیچ بڵێت؟ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی؟ لێیان بم، لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و ئەوانەش بم کە گوێیان لێدەگرن»

هەوڵەکانی کۆنگرێس لە ١٩٨٨ بۆ سەپاندنی ئابلۆقە بە سەر عێراقدا لەلایەن ئیدارەی رەیگان و بوشەوە شکستی پێهێنرا. چیرۆکی بەسەرهاتی قوربانیەکانی ســـەدام حوســـەین کە نەمردبـــوون لەوانەیـــە بەتەواوی لەناوچووبایـــا ئەگەر راپۆرتی کەســـانیک وەک (جاناتان) رەندێڵ[٢٦١] و فیلمەکانی گەوین رۆبێرتز[٢٦٢]، فیلم دەرهێنەری بریتانیایی نەبوایا. گەوین رۆبێرتز پاش بیستنی هەواڵی تووشبوونی خەڵکی هەڵەبجە بە نەخۆشی شـــێرپەنجەو ناتەواو بەدنیاهاتنی منداڵەکان لە هەڵەبجە و شوێنەکانی دیکەی کوردســـتان، کۆمەڵێک فیلمی لە بارەی ئەو بابەتە دروستکرد و بلاوی کردەوە.

بەهەرحاڵ هیچ ولاتێکی رۆژئاوایی و تەنانەت نەتەوە یەکگرتوەکانیش بە شـــوێن مەسەلەکەدا نەچوو. ســـاڵی ١٩٩٨ گەوین ژنێکی بریتانیایی بە ناوی کریســـتیەن گوسدێن[٢٦٣] هێنا بۆ کوردستان. گوسدێن پزیشکی پســـپۆری نەخۆشـــیە زگماکیەکانـــەو پرۆفیســـۆری زانکۆی پزیشـــکی لیوپرپولە[٢٦٤]. گوســـدێن سێ حەفتە لە نەخۆشخانەکانی کوردستان بوو و شـــێلگیر بوو یارمەتی کوردەکان بدات. تا ئەو شـــوێنە کە من دەزانم گوسدێن تەنها زانستڤانێکی رۆژئاواییە کە دەستێکردبێت بە لێکۆڵینەوەی سیستماتیک لە بارەی ئەو شتانە کە لە باکوری عێراق روویداوە.

گوســـدێن پێمیوت باوکی ئەفەســـەرێکی پایەبـــەرزی هێزی هەوایی پاشایەتی بریتانیا بووەو لە کاتی منداڵێتیدا لە ئاڵمانیا لە نزیک بیرگین بیلسین[٢٦٥] ژیاوە. گوسدێن دەڵێت:

«ژیـــان لـــە نزیک ئۆردوگایەکی قەرەباڵغ لە ســـالانی ســـەرەتای ژیانمـــدا کاریگـــەری یەکجـــار زۆری لەســـەرم هەبوو. لە کوردســـتان

هێماکانی  قەڵاچۆکردنی جولەکەکان بەدەستی ئاڵمانیای (نازی)م بینی.
دەوڵەتـــی عێراق چەکی کیمیایی بۆ لەناوبردنی کوردەکان بەکارهێنابوو. کاریگەرییەکانی هۆلۆکاست هێشتا بەردەوامە، ژمارەی جولەکەکان ئێستا لە سـاڵی ١٩٣٩ کەمترە. ئەمە شتێکی سروشـتی نییە، ئەگەر ئێستا ٢٠٠ هـەزار کەس نێرینە لە کوردسـتان ببەیتـە دەرەوە، پێکهاتەی ڕێژەی دانیشـتوانی کوردسـتان تێکدەچێت، لە کاتێکدا کە بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکان نزیکەی ٢٠٠ هەزار کورد لە شاڵاوی قڕکردنی کوردەکاندا کیمیابـاران کراون یان کوژراون و بێسەروشـوێن کـراون کە زۆربەیان نێرینەن. ژمارەیەکی زۆر بێوەژنی کورد هەن کە منداڵیان نییە
ریچارد بۆتلیر(٢٦٦) کە دیپلۆماتێکی ئوسترالیاییەوە و سەرۆکی تیمی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ پشـکنینی چەکە کۆمەڵکوژەکان لە عێراق بووە لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکانی گوسدێن لە بارەی شاڵاوەکانی عێراق دژ بە کوردەکان لە ٤ ساڵ لەمەوپێش تا ئێستا بەدوای لێکۆڵینەوەکانیدا دەچێ و بەو ئەنجامە گەیشتووە کە هەموو لێکۆڵینەوەکانی ڕاستن.
خـدر هەمزە (٢٦٧) کە لایەنگری ڕژێمی عێراقە و پێشـتر بەرپرسـی بەرنامەی چەکە ناوکیەکانی سـەدام حوسەین بووە، سەرەتای ئەمساڵ پێمیـوت پێش لە کیمیابارانی هەڵەبجە، پزیشـکەکانی سـوپای عێراق نەخشەی شاری هەڵەبجەیان کێشاوە و پاش کیمیابارانەکە بە جلوبەرگی دژەکیمیایـی چوونەتە ناو شـار بۆ ئەوەی بزانـن کیمیاییەکە تا کوێ خەڵکی کوشتوە  خدر هەمزە وتی:
«هەڵەبجە شوێنێک بوو بۆ تاقیکردنەوەی کاریگەری چەکە کیمیاییەکان لە سەر شارێکدا. من زانیاری ڕاستەوخۆم لە سەر بارودۆخ و ڕووداوەکانی هەڵەبجە لە ڕۆژی کیمیابارانەکە لەلایەن سـوپای عێراقەوە پێدەگەیشت، دکتۆرەکان کاخەزیان پێبوو کە دەبوایا  وەڵامی ئەو پرسـیارانەیان تێدا بنووسایا کە کیمیاییەکە تا کوێ خەڵکی کوشتووە»
گوسدێن وتی:

«ناتوانــم دەرک بــەوە بکەم کە بۆ وڵاتانـــی رۆژئاوا کاتی خۆی نەیانویســـتوە لە کیمیابارانکردنی کوردســـتان بکۆڵنەوە، وادیارە ئێستا مەسەلەی بەرژەوەندی خودی رۆژئاوایە کە وایکردوە رۆژئاوا لە کاریگەرییە درێژخایەنەکانی چەکە کیمیایەکان لەســـەر خەڵکی ســـڤیل بکۆڵێتەوە. من خراپترین جۆری شـــێرپەنجەم لـــە نێو خەڵکی ئوروپادا بینیوە بەڵام باوەڕم پێبکە قەت ئەو جۆرە شـــێرپەنجانەم نەبینیوە کە لە کوردستان بینیومە».

بـــە گوێـــرەی لێکۆڵینەیەوەیەک کـــە تیمێکی پزیشـــکە کوردەکان بە سەرپەرەشـــتی گوســـدێن و پشـــتیوانی گروپێکی بچوکی ســـەر بە «ئینیستیتۆی کورد لە واشینگتۆن» ئەنجامیاندوە و ئێستاش بەردەوامە، لە ماوەی ١٧ مانگدا زیاتر لە ٢٠٠ شـــارۆچکە و گوند لە سەراســـەری کوردستان بە چەکی کیمیایی هێرشیان کراوەتەسەر کە ئەمەش زۆر لەو ژمارەیە زیاترە کە پێشـــتر بیری لێدەکرایەوە. کەس نازانێت بەڕاســـتی چەند کەس بوونەتە قوربانی ئەو هێرشـــانە، بەڵام ئەو پزیشکانە کە من لە کوردستان بینیمن پێیانوایە کە زیاتر لە ١٠ ٪ی دانیشتوانی باکووری عێراق (کە نزیکەی ٤ ملیۆن کەســـن) بەر چەکـــی کیمیایی کەوتوون. گوسدێن وتی «سەدام حوســـەین باکوری عێراقی کیمیاباران کرد، ئەو کاتە کە هەڵەبجەم بینی پرســـیارم لە خۆم کرد دەبێ چی بکرێت ؟ پاشان چی روو دەدات؟.»

## پزیشکەکانی هەڵەبجە

لە ســـلێمانی فـــواد بابانم[٢٦٨] بینی کە یەکێ لە پزیشـــکە بلیمەت و ناســـراوەکانی کوردســـتانە. بابان بەڵێنی پێدام لە کەشوهەوای سیاسی و زانســـتی تەمومژاوی هەڵەبجـــەدا رێنوێنیم بکات. بابـــان کە تەمەنی ٦٠ ســـاڵە پســـپۆڕی نەخۆشـــیەکانی دڵ و هەناوەو پیاوێکی زیرەک و خوێنگەرمەو ســـێ جار کەوتوەتە بەندیخانەی عێراق. بابان بەڕێوەبەری

«ئینیستیتۆی پزشـــکی هەڵەبجە»یە کە گوسدێن، مایکێل ئامیتای[٢٦٩] (بەڕێوەبەری ئینیستیتۆی کورد لە واشینگتۆن) و کۆمەڵێک لە پزیشکە کوردەکان دایانمەزراندووە. پزیشکەکان کارێکی بوێرانە دەکەن کە خۆیان تێوەگلاندوەتە ناو پرۆژەیەک کە ئەنجامەکانی دەتوانێت وەک بەڵگەیەک بەکاربێت بۆ دادگاییکردنی سەدام حوسەین لە دادگای تاوانەکانی جەنگ لـــە داهاتودا. بابان وتـــی: «زۆر گرنگە کە بزانیـــت چەکی کیمیایی و بیۆلۆژیکی چـــی کاریگەرییەکی کورتخایەن و درێژخایەنی هەیە. خەڵکی هەڵەبجە بەر چەکی کیمیایی و بیۆلۆژیکی کەوتوون و توشی چەندان جۆر شێرپەنجە و نەخۆشی زگماکی بوونە».

پسپۆڕان ڕایان وایە کە ئەو کیمیاییە کە دژی هەڵەبجە و شوێنەکانی دیکەی کوردســـتان بەکارهێنراوە، تێکەڵێک لە گازی موستارد و دەمار، لەوانە ســـارین (کە لە کاتی کیمیابارانکردنی دەوروبەری شاری تۆکیۆی ژاپـــۆن لە ســـەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی کەڵکـــی لێوەرگیراوە) و گازی VX بـــووە کـــە گازێکی نیمچە دەمارییە. ئـــەوە کە بووە جێگای سەرســـوڕمانی من ئەوە بوو کە بابان وتی لەوانەیە چەکی بیۆلۆژیکیش دژی هەڵەبجە و شـــوێنەکانی دیکە بەکارهاتبێت. بابان وتی یەکێ لەو گازانە کە بۆ بەرهەمهێنانی چەکـــی بیۆلۆژیکی کەڵکی لێوەردەگیردرێت ئەفلاتۆکســـینە کە دەبێتە هۆی پێکهاتنی نەخۆشـــی درێژخایەن لە ناو جگەری مرۆڤدا.

هاوکارێکی بابان کە پزیشـــکی نەشـــتەرگەرییە و لە نەخۆشخانەی دهۆک لە باکوری ڕۆژئاوای کوردســـتانی عێـــراق کار دەکات و ئەندامی تیمی «ئینیســـتیتۆی پزیشـــکی هەڵەبجە»یە زانیاری زیاتری لە بارەی ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی ئینیستیتۆکە لە ١٩٩٩ لە ناوچەی دهۆک دامێ. وتی سەرەتا پیمانوابوو کە تەنها پارێزگاریی (موحافەزە)ی دهۆک و دوو گوندی دیکە بەر کیمیایی کەوتوون، بەڵام بەو ئەنجامە گەیشتین کە ٢٩ گوندی دیکە بەر چەکی کیمیایی کەوتوون، ١١ ســـاڵ دوای هێرشەکان

بەو راستیە گەیشتین».

بابـــان وتی: «زیادبوونی ریــژەی منداڵدارنەبوون (کە ئەنجامی گازی کیمیاییە) کاریگەری زۆری لەســـەر کۆمەڵگای کورد بووە، زۆر پیاو بووە کە لە ژنەکەی جیابوەتەوە چونکە منداڵی نەبووە و ژنێکی دیکەی هێناوە بەلام ژنە تازەکەشـــی منداڵی نەبووە چونکە کێشەکە لە خودی پیاوەکە بوە نە لە ژنەکە. ئەنجامە ســـەرەتاییەکانی لێکۆڵینەوەکانی ئینیستیتۆی پزشکی هەڵەبجە دەریخستوە کە خەڵک تووشی چەندان نەخۆشی بوونە. بۆ نمونە ڕێژەی توشـــبوون بە نەخۆشـــی شێرپەنجەی کۆلۆن[٢٧٠] لە نێو خەڵکی چەمچەماڵمان لەگەڵ خەڵکـــی هەڵەبجە بەراوەرد کردو بینیمان کە ڕێژەی توشـــبوانی ئەو نەخۆشییە لە هەڵەبجە ٥ قاتی چەمچەماڵە. ڕێـــژەی لەبارچوونی منداڵ لە هەڵەبجە چواردە قاتی چەمچەماڵە، ڕێژەی منداڵدارنەبوونی ژن و پیاوی هەڵەبجە زۆر لە شـــوێنەکانی دیکە زیاترە، لە ئاستی ڕێژەی منداڵدارنەبوونی خەڵکی هیرۆشیمادایە»

کە گەیشتینە هەڵەبجە، دوکتۆرێک کە لە نەخۆشخانەی «شەهیدان» کاری دەکرد پێمیوت:

«لێرە گشتی نەخۆشـــە، وایلێهاتوە ئەگەر کەسێک نەخۆش نەبێت خەڵک پێسەیرە».

لە نێو نەخۆشـــخانەکە ژنێکمان بینی ناوی جەیـــران محمد[٢٧١] بوو، تەمەنی ٥٠ ساڵ بوو، بەلام ٧٠ ساڵان دیاربوو، تووشی نەخۆشی برینی ســـی بوو، نەخۆشیەکەشـــی ئەوەندە توند بوو کە دکتۆرەکان دەیانگوت تەنها ڕێگاچارەی ئەوەیە کە سییەکانی بگۆڕێت، ئەو نەشتەرگەرییەش لە کوردســـتان ناکرێت. بابان پێمیوت « سییەکانی جەیران پاش ماوەیەکی کورت لەکاردەکەوێت، وایلێدێت ئیدی بە ئەســـتەم هەناســـە بکێشـــێت، چاوەڕوانـــی مەرگ دەکات» دەنگی جەیران بە ئەســـتەم دەبیســـترا، پێمیوت:

«هەشـــت خزم و کەســـوکارم لـــە کیمیابارانەکەدا مـــردن، دوای

کیمیابارانەکـــە لە ڕووی دەروونییـــەوە ماوەیەکی زۆر تێکچووم، پێموابوو منداڵەکانم زیندوون».

کچێکی دیکـــەم بینی کە ناوی چیا حەماســـەت[٢٧٢] بوو، چیا کاتی کیمیابارانەکە تەمەنی ٨ ســـاڵ بووە، لەوکاتەوە هـــەر دوو چاوی کوێر بووە، بە دەنگێکی ساف دەیگوت:

«دایکم چەند ســـاڵ پێش بە هۆی شـــێرپەنجەی کۆلۆن مرد، براکەم توشی نەخۆشی نەفەستەنگی بووە. هیچ هیوایەک نییە چاوم ساخ بێتەوە. شووم کرد، بەڵام نەمدەتوانی ئەرکی هاوسەری بەجێبێنم، چونکە کوێرم، ئەوەبوو شووەکەم وازی لێهێنام».

بابـــان دەیگوت ڕێژەی ناتـــەواو بەدنیاهاتنی منـــداڵ لە هەڵەبجە لە شوێنەکانی دیکە زۆر زیاترە. دکتۆرەکانی دیکەش پێمیانوت ژمارەیەکی زۆر لە منداڵەکان بە نەخۆشـــی سەیروســـەمەرەوە لەدایک دەبن، وێنەی هەندێ لەو منداڵانەیان پێنیشاندام. چاوم بە سەرکار[٢٧٣] کەوت. سەرکار کوڕێکی شەرمنۆک و وریا بوو کە دەم و لێوێکی کەروێشکی بوو و پشتی شـــکابوو. ســـەرکار برایەکی هەبووە کە ئەویش بە هەمان نەخۆشیەوە لەدایک بووە، بەڵام خنکاوە و مردووە.

سەردانی ماڵی پیرەژنێکمان کرد. ژێرزەمینی ماڵەکەی پێنیشانداین، نسرم و تاریک بوو، وتی:

«هەموو ئەوانەی لەم ماڵەدا بوون لە کیمیابارانەکەدا مردن، نزیکەی ١٠٠ کەسێک لەم ژێرزەمینەدا خۆیان حەشاردابوو، هەموویان مردن».

پرسیارم لە دکتۆرەکە کرد ئەم خانووانە لە کیمیایی پاک کراونەتەوە، وتی هیچ شوێنێک لە کوردستان پاک نەکراوەتەوە.

## ئەلئەنفال

کیمیابارانی هەڵەبجە و گۆپتەپە و لەوانەیە ٢٠٠ شـارۆچکە و گوندی دیکـە تەنها بەشـێکی بچووک بوو لەو بەرنامەیە کـە عەلی کیمیایی، ئامۆزای سـەدام دژی کورد دایرشـتبوو. کوردەکان دەڵێن نزیکەی ٢٠٠ هەزار کەسـیان لێکوژراوە. رێکخـراوی «چاودێری مافی مرۆڤ» کە لە سـەرەتای ١٩٩٠کان کتێبێکی بە ناوی» تاوانی ژینۆسایدی عێراق» بڵاو کردوەتەوە، پاش لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ لە بارەی هێرشـەکانی عێراق رایگەیاند کە ٥٠ تا ١٠٠ هەزار کەس کوژراون. سـەدام ناوی شاڵاوەکەی نابوو ئەلئەنفال کە ناوی سورەتێکی قورئانە کە رێگە بە سوپای مسلمانان دەدات دەسـتکەوتەکانی ئەو شـوێنە کە داگیریان کردووە، بۆ خۆیان هەڵبگرن (غنایم).

شـاڵاوی ئەنفال وەک هۆلۆکاسـت خۆی کۆتایـی پێنەهات، بەڵکوو ئامرازەکانـی کۆتایی پێهات یانی ئەو شـتە کە سمانسـا پـاور[٢٧٤]، بەڕێوەبـەری «کۆمەڵەی مافی مرۆڤی کاڕ لە هاروارد»[٢٧٥] ناوی ناوە « ژینۆسایدی کەرەستەیی»[٢٧٦]. پاور لە کتێبەکەیدا بە ناوی «کێشەیەک لە دۆزەخەوە، لێکۆڵینەوەیەک لە بارەی وەڵامی ئەمریکا بە ژینۆسـاید» دەڵێت:

«هەندێ رژێم بۆ ئەوە دروسـت کراون کە هەرچی مرۆڤی سـەر بە رەگەزێکـی تایبەت هەیە بیکوژن. سـەدام بێ ئـەوەی هەموو کوردێک لەناو بەرێت، گەیشـتە ئامانجی خۆی، ئامانجی ئەوەبوو ورە و ئیرادەی کـوردەکان تێکبشـکێنێت و بیانگەیەنێتـە ئەو قەناعەتـە کە خولیای سەربەخۆیی، خەونێکی گەمژانەیە».

زۆربـەی ئەو کوردانە کە لـە ئەنفالدا کوژران بـە چەکی کیمیایی نەکوژران بەڵکوو بە شێوە کۆنەکەی لەناوبران یانی بە شەو کۆدەکرانەوە و بە کۆمەڵ دەکوژران و بە کۆمەڵ دەکران بە ژێر خاکەوە. تەرمی زۆربەی قوربانیانی ئەنفال کە زۆرتر نێرینە بوون قەت نەدۆزرایەوە.

رۆژێکیـان سـەردانی یەکێ لەو هـەزاران ژنە کـوردەم کرد کە بە

«بێوەژنەکانی ئەنفال» ناسـراون. ناوی ئەو ژنە سەلما عەزیز بابان[٢٧٧] بوو، ماڵی لە دەوروبەری چەمچەماڵ بوو، لە شـارۆچکەیەک کە بۆ ئەو کەسـانە دروسـتکراوە کە دەربەدەرکراون. ماڵەکەی روت و قوت بوو، هیچی تێدا نەبوو، تەنها فەرشـیکی کۆنەی تێدابوو. سەلما عەزیز بابان وتی:

« من خەڵکی کەرکووکم، ساڵی ١٩٨٧ گوندەکەمان بەدەستی سوپای عێراق خاپور کرا، خەڵکی گوند لەگەل هەزاران کوردی دیکە لە گوندێکی زۆرەملێدا نیشتەجێکران. شەوێکی نیسانی ١٩٨٨ سەربازەکان هاتنە ناو گوندەکەمان و کوڕ و پیاوەکانیان دەستبەسـەر کرد. شووەکەم و سێ کوڕمیان سواری لۆری کرد. دایکی دەستبەسەرکراوەکان لە سەربازەکان دەپاڕانەوە منداڵەکانیان بەردەن، هاوارمان دەکرد چیتان لێمان دەوێت، چیتان دەوێت؟ کوڕەکانم زۆر گوناح بوون، دەگریان، ویستم جلی گەرمیان بدەمێ بۆ ئەوەی لە سـەفەرەکەیاندا سـەرمایان نەبێت، باران دەباری، پێموتن قەمسـەڵە لەبەرکەن، لە سـەربازەکان پاڕامەوە رێگەم پێبدەن نانیان بدەمێ، نەیانهێشـت. لەبیرمە ئەفسەرێکی پایەبەرزی عێراقی بە ناوی باریق[٢٧٨] سەرپەرەشتی جیاکردنەوەی خەڵکەکەی دەکرد.»

لە کتیبی «تاوانی ژینوسـایدی عێراق»دا نووسـراوە کە بە گوێرەی راپۆرتێکـی «هیومەن رایتس واچ»، ئەو پیـاوە کە خەڵکەکەی لەیەک جیاکردوەتـەوە ژنێراڵ باریق عبدالله الحاج حونتا[٢٧٩] بووە. پاش ئەوەی کە سەربازەکان نێرینەکانیان لەگەل خۆیان برد، ژن و منداڵەکان سواری لۆری کران، برسی و تینوو بوون، ئەوەندە جێیان لە ناو لۆریەکەدا تەنگ بوو کە لە هەر راوەستانێکدا ناچاربوون بچنە سەر ئاودەس. بابان و سێ کچەکەی و کوڕە شـەش سـاڵانەکەیان برد بۆ بنکەی سەربازی تۆپزاوا و لەوێوە بۆ بەندیخانەی نوگرەسـەلمان (یانی چاڵی سەلمان). «هیومەن رایتس واچ» لە ١٩٩٥ نوقرەسەلمان وەها وەسف دەکات:

« بەندیخانەیەکی کۆنە کە لە سەردەمی پاشایەتی عێراق (و لەوانەشە پێشـتر لەوەش) دروسـتکراوە. ماوەیەک کەسـی تێدا نەبووە. عەرەبە

بیاننشـــینەکان مەڕوماڵاتیان تێدا بەخێو کـــردوە. دیوارەکانی بیرەوەری بەندکراوە سیاســـیەکانی بەسەرەوە نووسراوە. لە سەر دەرگای یەکێ لە ژوورەکانی، پاسەوانەکان نووسیویانە « خومەینی گوێ خوارد». لەسەر دەرگایەکی سەرەکی بەندیخانەکە نووسراوە: بەخێربێن بۆ دۆزەخ».

سەلما عەزیز بابان وتی:

« نیوەشەو گەیشتینە نوگرەسەلمان، خستینیانە ناو ژوورێکی گەورە. زیاتـــر لە دوو هەزار کـــەس دەبووین. ژن و منداڵ بووین، دەرگاکەیان لە ســـەرمان داخست، برسیمان بوو، هیچ نەبوو بیخۆین، تەنها بەلوعەیەکی تێدابوو کە ئاوەکەی زۆر بێتام بوو. مەرگ بە هۆی برســـێتی و نەخۆشی دەســـتیپێکرد، کەســـێک کە دەمرد پاســـەوانەکان داوایـــان دەکرد لە پەنجەرەی دەرگای ژوورەکەوە تەرمەکەی بدەین بە دەستیانەوە. نەدەکرا تەرمـــی مردوەکان لە ناو هۆڵەکەدا بمێننەوە. لە ڕۆژەکانی ســـەرەتا لە نوگرەســـەلمان ٣٠ کـــەس مرد، زیاتریش. کوڕە ٦ ســـاڵانەکەم کە ناوی ڕێبـــوار بوو نەخۆش کەوت، تووشـــی زگچوون بـــوو، زۆر نەخۆش بوو، زۆر دەگریا، ڕەنگی مەرگی لێنیشـــتبوو، دکتـــۆر و دەواودەرمان نەبوو، سەرەنجام لە باوەشمدا مرد. دەگریام و شین و ڕۆڕۆم دەکرد، کچەکانیشم دەگریـــان، تەرمـــی کوڕەکەمان لە پەنجەرەی دەرگاکەوە دا بە دەست پاســـەوانەکانەوە. تۆزێک پاش ئەوە هەڵسام، چوومەلای پەنجەرەکە بۆ ئەوەی بزانم ســـەربازەکان تەرمی کوڕەکەمیان شـــاردوەتەوە یان نا. ٢٠ ســـەگ لە دەرەوەی بەندیخانەکە بوون، یەکێکیان ڕەش و زەبەلاح بوو. ســـەربازەکان تەرمی مردوەکانیان لە دەرەوەرەبـــەری بەندیخانە فڕێدەدا. ســـەیری دەرەوەم کرد، دەســـت و پێی کوڕەکەم بە دەم ســـەگەکانەوە بینی، ســـەگەکان کوڕەکەمیان خوارد، لە هۆش خـــۆم چووم. کچەکانم ئاو و خواردنیان بۆ دۆزیمەوە، بەخێویان کردم تا توانیم لە ســـەر جێگا هەڵسمەوە. ئەو کاتە مانگی ڕەمەزان بوو، چەند مانگ دوای ئەوەش هەر لە نوگرەسەلمان بووین».

مانگی ئەیلوول کە شـــەڕی ئێران و عێراق کۆتاییپێهات، ســـەدام لێ

بوردنی گشتی بۆ کورد دەرکرد، ئەو کوردانە کە تاوانی ئەوەی خستبووە پاڵیـــان کە خیانەتی لێکردوون و یارمەتی ئێرانیان داوە. دوای ئەوە ئەو ژن و منـــداڵ و پیرەمێـــرد و پیرەژنانە کە لە نوگرەســـەلمان بوون ئازاد کـــران، بەڵام زۆربەیان نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە بۆ ماڵ چونکە ســـوپای عێراق گوندەکانیانی روخاندبوو، ٤ هەزار گوندی بە بۆڵدۆزێر روخاندبوو. گوندەکەی سەلما عەزیز یەکێ لەوانە بوو. سەلما لە کۆتاییدا لە دەوروبەری چەمچەماڵ نیشـــتەجێبوو. دوای بەربوونی، هەوڵیدا  بزانێ چارەنووسی شووەکەی و سێ کوڕە گەورەکەی بەچی بووە، بەڵام ئەو کەسانە کە لە ئەنفالدا  بێسەروشوێن کران قەت نەدۆزرانەوە، دەڵێن کوژراون و  پاشان لە بیابانەکانی ســـەر ســـنووری کوەیت لە گۆڕە بەکۆمەڵەکاندا کراون بە ژێر خاکەوە، بەڵام کەس نازانێت بەڕاستی چییان بەسەرهاتووە. گەلێک لە بێوەژنەکانی ئەنفال هێشتا چاوەڕوانن رۆژێک کوڕ و شوو و براکانیان لە بەندیخانەی سەدام رزگاریان بێت.

سەلما عەزیز بابان لە کۆتایی قسەکانیدا وتی:

« پێموایـــە شـــوو و کوڕەکانم زینـــدوون. ٢٤ کاتژمێر لە رۆژدا بیر لەوە دەکەمەوە کە لەوانەیە زیندوو بن. ئەگەر زیندوو بن ئەشـــکەنجەیان دەدەن، دەزانم. لەو کاتەوە کوڕەکانم بێسەروشـــوێنن  باش ناخەوم، بیر دەکەمـــەوە. ئەگەر مردوون با پێمانبڵێن، با بە ئارامی ســـەر بنێینەوە. ئەوەنـــدە خەفەتم خـــواردووە و بیرم کردوەتەوە کە مێشـــکەم خەریکە دەتەقێت. تا ئەو رۆژە کە دەمرم وێنەی ئەو ســـەگانم لە بیر ناچێت کە کوڕەکەمیان خوارد «.

پێش ئەوەی لە ماڵی سەلما عەزیز بابان بێینە دەرەوە، داوای لێکردم ناوی کوڕەکانی بنووسم: شێرزاد کە ئەگەر بمابایە تەمەنی ئێستا ٤٠ ساڵ بوو، رزگار کە ئەگەر بمایا تەمەنی ئێســـتا ٣١ ســـاڵ بوو و محەمەد کە ئەگەر بمایا ئێستا تەمەنی ٣٠ ساڵ بوو. داوای لێکردم کوڕەکانی بدۆزمەوە یان داوا لە سەرۆک بوش بکەم بیاندۆزێتەوە. لە کاتی خواحافیزیدا وتی: «یەکێکیان بەسە، تەنها ئەگەر یەکێکیشیان بگەڕێتەوە هەر باشە».

## تەعریب

گۆڕینی ناســـنامەی ئەتنیکی خەڵک یەکێ لەو ئامرازانەیە کە رژێمی بەغداد لە سیاســـەتی تەعریبدا بەکاریدەهێنێـــت کە ئامانجی ئەوەیە کە عەرەبەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق و تەنانەت بە گوێرەی ڕاپۆرتەکان فەلەستینیەکان بخاتە جێگای کوردەکانی ناوچە کوردنشینەکان بەتایبەت شـــاری خاوەن نەوتی کەرکووک. بە وتەی پیتێر گالبرێس، پرۆفیسۆر لە زانکۆی بەرگری نیشـــتمانی و راوێژکاری پایەبەرزی پێشـــووی کۆمیتەی پەیوەندییەکانـــی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران، «تەعریب شـــتێکی نوێ نییە». گالبریس ئاماژەی بە کردەوەکانی ســـەدام دژی کوردەکان، پێش لە شەڕی کەنداو کرد. وتی:

« ٢٠ ســـاڵە ئەو سیاســـەتە دژی کـــوردەکان جێبەجێ دەکرێت. لەوانەیە تەعریب توندتر کرابێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە شتێکی نوێ نییە. بە بڕوای من ئەوە بەشـــێک لە سیاســـەتێکی بەرفراوانترە کە ساڵەهای ساڵە جێبەجێ دەکرێت و ئامانجی ئەوەیە کە کوردەکان لە ناوچەکانیان دەربکرێن و گوندەکانی کوردستان کاول بکەن».

پیتێر گالبریس وتی:

«لـــە ١٩٨٧ بە چاوی خـــۆم بینیم کە گوندەکانی کوردســـتان بە گۆڕستانەکانشـــیانەوە کاول دەکرێـــن. هەرچی پەیوەندی بە شوناســـی کوردەوە هەبوو لەناودەبرا. ئەمە یەکێ لەو شتانە بوو کە پاڵی پێمەوەنا بـــەو ئەنجامە بگەم کە ئەمە سیاســـەتی ژینۆســـایدە، تاوانێک بوو کە ئامانجی لەناوبردنی تەواو یان بەشێک لە گروپێکی ئەتنیکی بوو»[٢٨٠].

ئاڵمانیەکان پەیوەندییەکی تایبەتیان بە سیاســـەتەکانی ســـەدامەوە هەبـــوو. کۆمپانیاکانی ئاڵمانیا لەو کۆمپانیانە بیانیانە بوون کە یارمەتی سەدامیان دا بۆ پێشخســـتنی بەرنامەی چەکە نائاسایەکانی و دەوڵەتی ئاڵمان بەردەوام وتویەتی لەو کارە بەداخە.

ئوگوســـت هانینگ[٢٨١]، ســـەرۆکی B.N.D (رێکخـــراوی هەواڵگری ئاڵمانیا) پێمیوت:

« ئاژانسـەکەمان دەوری سـەرەکی بینـی لە ئاشـکراکردنی ئەو کۆمپانیانە کە یارمەتی عێراقیان دا کارخانەی گازی کیمیایی لە سامیرا دروسـت بکات. ئاڵمانیەکانیش لە سەر بنەمای کۆمەڵێک هۆکاری زۆر روون، بەرپرسـیارێتی تایبەتیان لە بەرامبەر ئاسایشی ئیسرائیل هەیە، کەوابـوو زۆر پێیانخـۆش بوو بەرنامەی چەکـە کۆمەڵکوژەکانی عێراق ئاشکرا بکەن».

## کوردەکان نیگەرانی دووپاتبوونەوەی هێرشە کیمیاییەکانی سەدامن
## ئەنجومەنی پیران
## ٢ی ئاداری ٢٠٠٣

سناتۆر فریست: جەنابی سـەرۆکی ئەنجومەن، مانگی کانوونی دووەمی رابردوو لەگەڵ کۆمەڵێک لە پزیشـکانی کورد لە نوسـینگەکەم دیدارم کرد. دەمەوێت ئاماژە بە لێدوان و قسەکانی ئەم پزشکانە بکەم، چونکە قسەکانیان زۆر پەیوەندی بەم مەسەلە و باسانەوە هەیە کە لەم رۆژانەدا بـەردەوام دەخرێتەروو[٢٨٢]. پێش لـەوە دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم کە لـە ویلایەتی تنیسـی کە من نوێنەریمی، کۆمەڵێکـی زۆر کورد دەژین، بەتایبەت شاری نەشویل کە من خۆم خەڵکی ئەو شارەم.

من دەرفەتی ئەوەم بۆرەخسا لەگەڵ ئەو پزیشکە کوردانە دیدار بکەم و گـوێ لە نیگەرانیەکانیان بگرم و پشـتگیری لە «پرۆژەی بەشـداری تەندرسـتی لەگەڵ باکوری عێراق» بکەم کە «سـەنتەری نێونەتەوەیی میریدیەن»[٢٨٣] لە واشـینگتۆن بە یارمەتی وەزارەتی دەرەوە پشتیوانی لێـدەکات. ئەم پرۆژەیە پرۆگرامێکی زۆر باشـە، پرۆگرامێکی گەورەیە، ئامانجی ئەوەیە کە پزشکە کوردەکان لە باکوری عێراق رابهێنێت. پزیشکە کوردەکان نیگەرانیەکی تایبەتیان هەبوو. وتیان دەزانن رووخانی رژێمی سـەدام حوسـەین نزیکە، لەوە نیگەرانن کە عێراق بە چەکی کیمیایی و

بیۆلۆژیکی هێرشیان بکاتەسەر.

ئەم نیگەرانیە لەو هێرشانە سەرچاوە دەگرێت کە پێشتر کراوەتە سەر ئەم خەڵکە و ئەم پزشکانە بە چاوی خۆیان بینیویانە. وتیان ئەگەر هێرشێکی وا رووبدات ئێمە ئامادەیی ئەومانە تێدانییە وڵاتەکەمان لە باکوری عێراق بپارێزین. ئەو پزیشکانە لە هەرێمێک دەژین کە ٦ ملیۆن کەسە و ٢٤٠ بنکەی تەندرستی تێدایە، بەڵام کەرەستە و پێداویستی پزیشکییان کەمە. کەرەستە و پێداویستیەکانی پاراستنی خەڵک لە بەرامبەر چەکی کیمیایی و بیۆلۆژیکییان نییە. ناتوانن تەنانەت برینداراني هێرشێکی کیمیایی یا بیۆلۆژیکی تەداوی بکەن، دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەرەخساوە بۆ چۆنیەتی هەڵسەکەوتکردن لەگەڵ قوربانیانی هێرشی کیمیایی و بیۆلۆژیکی رابهێنرێن. بۆ ئەوە هاتبوون بۆ نووسینگەکەم داوای یارمەتیم لێبکەن. دکتۆر عەلی سندی[٢٨٤]، سەرۆکی وەفدەکە، داوای کەرەستە و پێداویستیە بنەرەتیەکانی دژەکیمیایی دەکرد، داوای دەواودەرمان و کەرەستە پێشکەوتوەکانی لە من (وەک پزیشکێک و وەک سەرۆکی فراکسیۆنی زۆرینەی ئەنجومەنی پیران) کرد. دۆکتۆر سندی وتی سیستمی ئاوی خواردنەوەی هەرێمی کوردستان کراوەیە بە رووی هەوادا و ئەگەر هێرشی کیمیایی رووبدات، ئاواکە هەمووی ژەهراوی دەبێت.

نیگەرانییەکانی ئەو پزیشکە کوردانە لە جێی خۆیدایە، چونکە پێشتر چەکی کیمیایی و چەکی کۆمەڵکوژیان بینیوە و لەگەڵی رووبەروو بوونەتەوە. هەروا کە سناتۆر جان کیل، نوێنەری ئاریزۆنا دەزانێت کوردەکان پێشتر بە چەکی کیمیایی هێرشیان کراوەتەسەر، بەتایبەت لە شاری هەڵەبجە. لە هەڵەبجە هەزاران کوردی بێ گوناە بە چەکی کۆمەڵکوژ کوژران. ئەو پزشکانە کە هاتبوون سەردانم بکەن خەڵکی ئەو ناوچەیە بوون، لەگەڵ قوربانیانی ئەو هێرشە تایبەتە رووبەروو بوونەتەوە، لە ئەنجامی ئەو ئەزمونە راستەوخۆیە باش دەزانن کە چەکی کیمیایی و کۆمەڵکوژ چیە و چی دەکات. لەوە دەترسن کە دیسان

هێرشـــی کیمیایی بکرێتە ســـەر کورد، لە من و لە ڕێگای منیشـــەوە لە دەوڵەتـــی ئەمریکا داوایان کرد یارمەتیـــان بدەین بۆ ئەوەی ئامادەکاری بکەن.

لە ســـناتۆری ویلایەتی ئاریزۆنا دەپرســـم کە ئایا سەرەڕای ئەزمونی ڕاستەوخۆی ئەم پزیشکە کوردانە لەگەڵ چەکی کیمیاییدا، لەگەڵ ئەوە هاوڕا نیە کە کوردەکان مافی خۆیانە وا بیر بکەنەوە کە ســـەدام چەکی کۆمەڵکوژی هەیە و دەیەوێت چەکی کیمیایی دژیان بەکار بهێنێت چونکە پێشتر کیمیابارانیان بینیوە؟

سناتۆر جان کیل:[٢٨٥] جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، دەمەوێت وەڵامی پرسیارەکانی سناتۆر فرێست بدەمەوە. قسەکردن لە بارەی ئەم مەسەلانە لەم کەشـــوهەوا ئارام و بێ مەترسیەی ئەنجومەنی پیراندا ئاسانە. بەڵام بەڕاستی بەسەرهاتی ئەو پزشکە کوردانە کاری تێکردم کە کیمیابارانیان بە چاوی خۆیان بینیوە. من ناڵێم کە ئەو دکتۆرانە مافی خۆیان نییە کە پێیانوابێت سەدام حوسەین جارێکی دیکە کیمیابارانیان دەکات، دەیەوێت کیمیابارانیان بکات و توانایی ئەوەشی هەیە کیمیابارانیان بکات. ناشڵێم کە ئێمە بەهەڵەدا دەچین ئەگەر بیر لەو ئەگەرانە بکەینەوە.

کاتێک سەیری ئەم وێنەیە دەکەم دەکەومە بیری ئەو قسانە کە کالین پاوڵ، وەزیری دەرەوە لەکاتی سەردانەکەی بۆ هەڵەبجە کردی و بە چاوی خۆی بینی چی لە هەڵەبجە ڕوویداوە و بەڵێنیدا ئەمریکا ناهێڵێت شـــتی وا جارێکی دیکە دووپات بێتەوە. ئەم قســـانە جێگای شـــانازییە بۆ من. کاتێک کە ئێمە دەزانین لەوانەیە شـــتێکی وا ڕووبدات وەک ئەو شتە کە پزیشـــکە کوردەکان ئاماژەیان پێکردووە، ئەرکی سەرشانمانە کە پێشی لێبگرین. من بەتەواوی لەگەڵ قسەکانی سناتۆر «فرێست» هاوڕام.

ســـناتۆر فرێست: سپاسی ســـناتۆر «جان کیل» دەکەم. جارێکی دیکە دووپاتی دەکەمەوە کە ئەو پزشـــکە کوردانە کە ســـەردانی منیان کرد چەکـــی کیمیاییان بە چاوی خۆیان بینیوە. وتیان پێویســـتمان بە یارمەتییە بـــۆ ئەوەی خۆمان و خەڵکەکەمان لەبەرامبەر چەکی کیمیایی

و بیۆلۆژیکی بپارێزین. ئایا ســـناتۆر کیل ئاگاداری ئەوەیە کە ئەوانەی کە ڕەخنە لە شەڕی ڕوخاندنی ســـەدام دەگرن دەڵێن کە هیچ کردەوەیەکی ســـەدام جێگای نیگەرانی نییە. لەڕاستیدا ئەگەر گوێ لە ڕەخنەکانیان بگریت ئەوەندە دەچنەپێش کە دەڵێن سەدام قەد هەڕەشە نەبووە.

ئایا ســـناتۆر کیل ئاگاداری وردەکاریەکانی یەکێ لە ترســـناکترین نمونەکانی کردەوە دڕندانەکانی سەدام حوسەینە کە کۆمەڵکوژی خەڵکی سڤیلی کورد لە شاری هەڵەبجە لە ١٩٨٨ بوو؟ ئەو کاتە ڕێک ٥٠ هەزار کـــورد لە هەڵەبجـــە دەژیان کە زۆر نزیکە لە ســـنووری ئێران. پێش لە کیمیابارانەکـــەش خەڵکی هەڵەبجە بە ماوەی ٨ ســـاڵ بوون بە قوربانی شـــەڕی ئێران و عێراق، بەڵام ئەوە بۆ ســـەدام حوســـەین بەس نەبوو، بۆیـــە لە ١٦ی ئـــاداری ١٩٨٨ ڕژێمی عێـــراق هەڵەبجەی تۆپباران کرد و خەڵکەکـــەی ناچار کرد لە ژێرزەمینی ماڵەکانیاندا خۆیان بشـــارنەوە. پاشان هێرشە ڕاستەقینە گەورەکە دەستیپێکرد، فڕۆکە و هلیکۆپتەرەکانی عێراق بە چەکی کیمیایی گەڕانـــەوە. چەکە کیمیاییەکانیش بە دیقەتەوە هەڵبژێردرابوون. لە گازی دەمار، VX و موســـتارد دروســـتکرابوو یانی هەموو ماددەیێکی کۆمەڵکوژی تێدا بەکارهێنرابوو بۆ ئەوەی دزە بکاتە ناو ماڵ و ژێرخانی ماڵەکان کە خەڵکی هەڵەبجە خۆیان تێدا حەشـــاردابوو. خەڵـــک رایکرد، بنەماڵەی خۆی کۆکـــردەوە بۆ ئەوەی لە مەرگ رزگاری بێت.

وێنەکانـــی هەڵەبجە ئاکامی کەڵکوەرگرتنی ســـەدام حوســـەین لە چەکی کۆمەڵکوژ باش نیشـــان دەدات. ســـناتۆر کلـــی تەنها یەکێ لە وێنەکانی نیشـــاندا. خەڵکی هەڵەبجە لە هەموو شوێنێک کەوتن و مردن، کاتێک منداڵێک نەیدەتوانی بچێ بە ڕێگادا، دایک و باوکی ئەوەندە ترس و تۆقان بەســـەریاندا زاڵ بوو کە منداڵەکەیان بەجێدەهێشت، ژمارەیەکی زۆر منداڵ لە پاڵ جادەکانـــدا بەجێمان و مردن، پیرەمێرد و پیرەژنیش بە هەمان شـــێوە، ڕایاندەکرد، بەڵام هەناســـەیان دەپچڕا و دەکەوتن و دەمردن.

پسـپۆڕان لە سـەر ئەوە هاوڕان کە ٥ هەزار هاوولاتی بێ گوناح لە ئەنجامـی کیمیابارانەکەدا کوژراون. ئەمەیە ئـەو چەکە کۆمەڵکوژە کە لە هەڵەبجە کەڵکی لێوەرگیرا. پزیشـکە کوردەکان لە نوسـینگەکەمدا جارێکی دیکە ئەم بەسـەرهاتانەیان بۆ گێڕامەوە، ئەوانەش کە نەمردن تووشـی برینی سی بوون، بۆ هەمیشـە کوێر بوون. ئاسەوارەکانی ئەم هێرشـە دڕندەیە تا ئەمڕۆش بەردەوامە و ئەو پزیشکە کوردانە بەردەوام لەگەڵ قوربانیانی ئەو هێرشە ڕووبەڕوو دەبنەوە. ماددەی کیمیایی چوەتە ناو ئاو و خواردنیان، تووشـی شـێرپەنجەی کردوون، تووشی نەخۆشی هەناسـەدان وەک fibrosis ی کردوون، نەزۆکی کردوون و منداڵەکانیان بە شێوایی لەدایک دەبن.

بەڵێ، ڕژێمی سـەدام حوسـەین چەکی کیمیایی بەسەر خەڵکی بێ گوناهی کورددا تاقـی کردوەتەوە، کوردەکانی هاوڵاتی خۆی، ئەزموونی دەستکەوتوە. پزشکە کوردەکان شتێکیان پێوتم کە قەد لە بیرم ناچێت، وتیان ڕژێمی عێراق لە ناو تاقیگەلێکدا کە ژورەکانی وەک میوانخانەیە، گازە جۆراوجۆرەکانی بە سەر خەڵکدا تاقی کردوەتەوە بۆ ئەوەی بزانێت هـەرکام لەو گازانە چی کاریگەریەکی لەسـەر مـرۆڤ دەبێت و کامیان کاریگـەری زۆرترە. هەر ژورێک تایبەت بووە بـە تاقیکردنەوەی گاز بە سـەر کەسـێکدا، ژورێک بۆ تاقیکردنەوەی گازی VX و ژورێک بۆ گازی موستارد. پاش کیمیابارانەکە سەربازانی عێراق گەڕانەوە بۆ هەڵەبجە بۆ ئەوەی بزانن کیمیاییەکە چەندە کاریگەر بووە، چۆن خەڵکی کوشتوە، و زۆربوونی ژمارەی کوژراوەکانیان بە نیشانەی سەرکەوتن زانیوە.

دەمەوێت پرسـیارێکی دیکە لە سناتۆر کیل بکەم، ئایا سناتۆر کلی هیـچ گومانی لەوەدا هەیە کە سـەدام لە یەکەمیـن دەرفەتدا کە بۆی بڕەخسـێت، درێژە بە پێشخسـتن و کەڵکوەرگرتن لـە چەکی کیمیایی دەدات؟.

سناتۆر کیل: جەنابی سـەرۆکی ئەنجومەن، دەمەوێت بە دوو شێوە وەڵامی سـناتۆر فرێسـت بدەمـەوە. یەکەم: من ٨ سـاڵ لە کۆمیتەی

هەواڵگــری ئەنجومەنی پیران خزمەتم کردووە. بە گوێرەی ئەو زانیارییە هەواڵگریانە کە بۆمان دەهات دڵنیابووم کە ســەدام چەکی کۆمەڵکوژی هەیە، ئەو چەکانەی پێشــتر بەکارهێناوە و رەنگە دیســان بەکاریبێنێت ئەگەر دەرفەتی بۆ برەخســێت. کەوابوو وەک ســناتۆرێک هیچ گومانم لــەوەدا نییە کە ئەو کوردانە کە باســمان کردن، بە تەواوی هەقیانە کە لەوە بترســن کە ئەم هێرشــانە دووپات بێتەوە. بۆم سەرنجڕاکیش بوو کە بزانم ئایا کەســی دیکەش هەیە لە ئەنجومەنــی پیران وەک من بیر بکاتەوە، زانیم کە بەڵێ کەسی دیکەش هەیە.

لــە ١٩٩٨ پێش لە بەدەســەڵات گەیشــتنی جۆرج بوش، ســەرۆک کۆمار کلینتۆنیش بە گوێرەی ئەو زانیاریانە کە لە ئاژانســە هەواڵگرییە جۆراوجۆرەکانەوە بۆی دەهات، بە هەمان ئەنجام گەیشــت کە ســەدام چەکی کۆمەڵکوژی هەیە و ئەگەر دەرفەتی بۆ برەخســێت بەکاریدێنێت. کلینتۆن قسەیەکی کرد کە کاری تێکردم. وتی «وڵاتانی دیکەش چەکی کۆمەڵکوژ و موشــەکی بالســتیکیان هەیە، بەڵام جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئەو وڵاتانە و ســەدامدا هەیە. ســەدام چەکی کۆمەڵکوژی چەند جار بەکارهێناوە، چەکی کیمیایی دژی ســوپای ئێران و خەڵکی ســڤیل بەکارهێناوە، موشەکی «سکاد»ی داوە لە خەڵکی ئیسرائیل، عەرەبستانی سعودی، بەحرەین و ئێران. تەنانەت چەکی کیمیاییشی دژی هاووڵاتیانی کوردی خۆی لە باکوری عێراق بەکارهێناوە». وەزیری بەرگری، «ویلیام کۆهن»یش لەگەڵ وەزیری دەرەوە، مادلین ئالبرایت قســەی کرد و وتی «سەدام حوسەین ئەمباری چەکە کۆمەڵکوژە کیمیایی و بیۆلۆژیکیەکانی پێشخستووە. سەدام ئەو چەکانەی پێشتر چەند جار دژی خەڵکی خۆی و ئێران بەکارهێناوە».

## ئەنجومەنی نوێنەران
## لێدوانەکانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە هەڵەبجە فریودانی خەڵکە
## ١٦ی ئەیلوولی ٢٠٠٣

کۆنگرێســـمەن دیلاهونـــت:[٢٨٦] جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومـــەن، نازانم یەکشـــەمەی رابـــردوو چاوپێکەوتنە رۆژنامەوانیەکەی جێگری ســـەرۆک کۆمارتان بینی؟. جێگری ســـەرۆک کۆمار ئەو لێدوانەی سەرۆک ئەرکانی ســـوپای ئەمریکا، ژنێراڵ شینیسکی[٢٨٧] دووپات کردەوە کە پێویستیان بە چەندســـەد هەزار سەرباز هەیە بۆ سەقامگیرکردنی عێراق. ئەمدوایانە شتێکم بینی کە بە بۆچوونی من کردەوەیەکی فریودرانەیە.

وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، کالین پاوڵ ئەم حەفتەی دواییە سەردانی هەڵەبجـــەی کرد کە تێیدا ٥ هەزار کوردی عێـــراق بەهۆی کیمیابارانی ســـەدام حوسەین گیانیان لەدەســـتدا. وەزیری دەرەوە جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئەم شـــارۆچکە کشتوکاڵییە بچوکە کە لە شاخە رەش و رووتەکانی باکوری عێراقدا هەڵکەوتوە، بەڵگە و نیشـــانەی ئەوەیە کە دەوڵەتی سەدام حوسەین چەکی کۆمەڵکوژی بووە و ئەمەش راستبوونی بڕیارەکەی ئەمریکا بۆ راگەیاندنی شەڕ دژی عێراق دردەخات.

کیمیابارانی هەڵەبجە لە ١٩٨٨ روویدا و هەروا بەسەرچوو. دەبوایا کاتی خۆی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی وەڵامی ئەوەی دابایەوە و دادگایەکی بۆ لێپرسینەوە لە تاوانەکانی سەدام پێکهێنابایا و بڕیاری دەستبەسەرکردنی سەدامی دەرکردابایا و پاشان دادگایی بکردایا. لە ١٩٨٨ رەیگان سەرۆک کۆماری ئەمریکا بوو و پاشـــان ســـەرۆک کۆماری ئەمریکا بوش بوو کە باوکی سەرۆک کۆماری ئێســـتای ئەمریکایە. وەزیری دەرەوەی ئێستای ئەمریکا ئەو کاتە راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی رەیگان بوو.

من زۆر لەو قســـەیەی ســـەرۆک کۆمار تورەم ، چونکـــە گەلێک لە کاربەدەســـتانی ئێستای ئەمریکا هەر ئەو کەســـانەن کە کاتی خۆی لە

ســـەدام حوسەین نزیک بوونەوە بۆ ئەوەی سەدام لە شەڕەکەیدا بە سەر ئێراندا زاڵ بێت. دۆناڵد رامســفێڵد، وەزیری بەرگری ئێســتای ئەمریکا ســاڵی ۱۹۸۲ وەک نوێنەری تایبەتی ئەمریکا ســەردانی عێراقی کرد و تەوقەی لەگەڵ ســەدام کرد. ئەمریکا پاشــان ناوی عێراقی لە لیســتی وڵاتانی پشــتیوانی تیرۆریزم دەرهێنا و ئەوەش دەرفەتی زۆری بۆ رژێمی عێراق رەخساند. لە ۱۹۸٤ پەیوەندیە دیپلۆماتیکەکانی ئەمریکا و عێراق بەتــەواوی دەســتپێکرد و لە ۱۹۸٦ باڵوێزخانــەی ئەمریکا لە بەغداد کرایەوە.

خەڵکــی ئەمریکا دەبێ ئەم راســتیانە بزانێت. لە ۱۹۸۸ ئەو تاوانە قێزەون و دزێوە دژی کوردەکانی عێراق لە شــاری هەڵەبجە ئەنجامدرا. ئێســتا پاش ۱۵ ســاڵ جەنابی وەزیری دەرەوە دەڵێت کە کیمیابارانی هەڵەبجە بەڵگەیە بۆ دروســتبوونی بڕیاری دەســتێوەردانی ئەمریکا لە عێراق. بەڵام چیرۆکەکە لێــرە کۆتایی پێنایەت، چونکە هەر ئەم جۆرج بوشــی باوکی سەرۆک کۆماری ئێستایە بوو کە شکستی بە هەوڵەکانی کۆنگرێس هێنا بۆ ئەوەی ئابڵۆقە بســەپێندرێت بەسەر عێراقدا بە هۆی ئەوەی ئەو تاوانەی دژی خەڵکەکەی خۆی ئەنجامدابوو.

خاڵێکــی گرنگ هەیە کە خەڵکی ئەمریــکا دەبێ بیزانن: بە گوێرەی لێکۆڵینەوەیەکی نوســینگەی لێکۆڵینەوەی کۆنگرێــس کە لێژنەیەکی بێلایەنە، پاش ئــەوەی راپۆرتەکان بڵاو بوەوە کە عێراق چەکی کیمیای دژی کــوردەکان بەکارهێناوە، لە ۹ی ئەیلوولی ۱۹۸۸ ئەنجومەنی پیران گەڵاڵە یاســایەکی تێپەڕاند بۆ ئەوەی ئابڵۆقەی ئابووری بەسەر عێراقدا بســەپێندرێت و ناردنی تەکنۆلۆژی بۆ عێراق سەختتر بکرێت. لە ۲۷ی ئەیلوول ئەنجومەنی نوێنەران ئەو گەڵاڵە یاسایەی بە ۳۸۸ دەنگی ئەرینی لــە بەرامبەر ۱٦ دەنگی نەرینی پەســەند کرد، بەڵام ئەنجومەنی پیران گەڵاڵەیاســاکەی قبوڵ نەکرد. گەڵاڵەیاساکە ناردنی کۆمەڵێک تەقەمەنی بۆ عێراق قەدەخە دەکرد و داوای لە سەرۆک کۆمار دەکرد هەناردەکردن و

هاوردەکردنی کاڵا بۆ عێراق سنووردار بکات و کۆتایی بە بەخشینی قەرزی کریدیت بە عێراق بهێنێت و دژی بەخشینی یارمەتی ئابوری نێونەتەوەیی بە عێراق رابوەستێت ئەگەر عێراق کۆتایی بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی نەهێنێت و رازی نەبێت کە پشـــکنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان سەردانی ئـــەو وڵاتە بکەن. بە هەمان شـــێوە کە لە تەمـــوزی ۱۹۹۰ تۆزیک پێش لە دەســـتپێکردنی شـــەڕی یەکەمی کەنداو ئیـــدارەی بوش هەوڵەکانی کۆنگرێسی پوچەڵ کردەوە و شکستی بە هەوڵەکانی ئەنجومەنی نوێنەران و پیـــران هێنا بۆ ئەوەی بەخشـــینی کریدیتی فرۆشـــتنی کاڵا، قەرزی کریدیت بە عێراق و بیمەکردنی کۆمپانیا عێراقییەکان لەلایەن دامودەزگا گەورە نێونەتەوەییەکان ســـنووردار بکرێت. بەڵام ئیدارەی بوش هەموو ئەو هەوڵانەی پوچەڵ کردەوە.

ئێمـــە دەمانزانی کە عێراق چەکی کیمیایـــی بەکاردێنێت. لە ۱۹۹۰ ئەوەمـــان دەزانی، بـــەڵام چیمان کرد؟ ئیدارەی ئەمریکا شکســـتی بە هەوڵەکانـــی کۆنگرێس هێنـــا. کەوابوو ســـەردانەکەی وەزیری دەرەوەی ئەمریـــکا بـــۆ هەڵەبجە و وتنی ئەوە کە کیمیابارانـــی هەڵەبجە یەکێ لە هۆکارەکانی دەستێوەردانی سەربازی ئەمریکا لە عێراق بووە، فریودانی خەڵکە.

## بۆ کیمیابارانی هەڵەبجە وەک هۆکارێک بۆ روخانی رژێمی سەدام بەکاردێنن؟

**ئەنجومەنی نوێنەران**

**١٧ی ئاداری ٢٠٠٤**

کۆنگرێســـمەن هاری رێید:[٢٨٨] جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن داوا دەکەم لە چوارچێـــوەی بریارنامەی ٥٦١ی ئەنجومەنـــی نوێنەراندا، بریارنامەی ٥٥٧ دەربـــارەی ئـــازادی خەڵکی عێراق و خزمەتی درەوشـــاوەی هێزە چەکدارەکانـــی ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانـــەکان بخرێتە بەرباس. ئەمە دەقی بریارنامەکەیە:

### بریارنامەی ٥٥٧ی ئەنجومەنی نوێنەران[٢٨٩]

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ســـەدام حوسەین و رژێمەکەی تاوانی دژی مرۆڤایەتیان ئەنجامداوە و بە شـــێوەیەکی چروپڕ مافی هاوڵاتیانی عێراق و وڵاتانی دیکەیان پێشێلکردووە.
- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رژێمی تیرۆریســـتی ســـەدام حوسەین هاوڵاتیانی عێراقی کوشتووە، ئەشـــکەنجە کردووە، دەسدرێژی کردوەتە سەریان و دەست و پێی بریون.
- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رژێمی سەدام حوسەین لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ چەکی کۆمەڵکوژی دژی هاوڵاتیانی کورد بەکارهێناوە و نزیکەی ٥ هەزار کەسی کوشتوە
- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ئەیلوولی ١٩٨٨ ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا بە تێکڕای دەنگ گەڵاڵەیاســـای (S٢٧٦٣)ی پەســـەند کرد بۆ ســـەپاندنی ئابڵۆقەی ئابووری بەسەر رژێمی ســـەدام حوسەیندا بەهۆی ئەوەی چەکی کیمیایی دژی هاوڵاتیانی کوردی خۆی بەکارهێنابوو، بەڵام ئەو گەڵاڵەیاســـایە شکســـتی هێنا بە هۆی ئەوەی ئیدارەی رەیگان دژی راوەستا و هەڕەشەی کرد کە ڤیتۆی دەکات.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ۲۷۰ گۆڕی بەکۆمەڵ لە عێراق دۆزراوەتەوە کە ئیسک و پروسکی ٤٠٠ هەزار قوربانی دەستی ڕژێمی سەدام حوسەینی تێدابووە.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ڕژێمی سەدام حوسەین بۆ ترساندن و تۆقاندنی خەڵک بەردەوام لە بەرچاوی بنەماڵەکانیان دەستدرێژی کردوەتە سەریان.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ڕژێمی سەدام حوسەین عەرەبە زۆنگاونشینەکانی سزاداوە لە ڕێگای وشککردنی زەوییە زۆنگاویەکانیان کە لە ئەنجامدا سەدان هەزار کەس ئاوارە بوون و کارەساتێکی ژینگەیی روویدا.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە یاسای ۱۹۹۸ی ئازادی عێراق ( یاسای گشتی ١٠٥-٣٣٨) کە بە ٣٦٠ دەنگی ئەرێنی و ٣٨ دەنگی نەرێنی لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانەوە پەسەند کرا، رایگەیاند کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەبێ پشتیوانی لە هەوڵەکان بۆ روخانی ڕژێمی سەدام حوسەین بکات.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ڕژێمی عێراق ١٦ بڕیارنامەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکانی جێبەجێ نەکرد و لە ٨ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ ئەنجومەنی ئاسایش بە تێکڕای دەنگ بڕیارنامەی ١٤٤١ی پەسەند کرد و رایگەیاند کە عێراق سەرپێچی لە جێبەجێکردنی ئەرک و بەرپرسارەتیەکانی بە گوێرەی بڕیارنامەکانی ئەنجومەنی ئاسایش، لەوانە بڕیارنامەی ٦٨٧ی ساڵی ١٩٩١ کردووە و ئێستاش دەیکات و بەتایبەت لەگەڵ پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان هاوکاری نەکردوە.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢ ئەنجومەنی نوێنەران ئیجازەنامەی بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق پەسەند کرد و لە ١٩ی ئاداری ٢٠٠٣ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئوپەراسیۆنی سەربازیی دژی عێراق ئەنجامدا.

کەوابوو:

١- ئەنجومەنــی نوێنەران ئەوە پشتڕاســت دەکاتــەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانــی ئەمریــکا و جیهان بە نەمانی ســەدام حوســەین و ڕژێمەکەی ئەمنتر بووە.

٢- ئەنجومەنــی نوێنەران ستایشــی خەڵکی عێــراق دەکات بە هۆی ئەوەی بوێرانە بەرەنگاری سەرکووتی توند و کردەوە دڕندانەکانی ڕژێمی سەدام حوسەین بوونەوە.

٣- ئەنجومەنی نوێنەران ستایشــی خەڵکــی عێراق دەکات بە بۆنەی پەسەندکردنی یاسای بنەڕەتی عێراق.

٤- ئەنجومەنــی نوێنەران ستایشــی هێزە چەکدارەکانــی ویلایەتە یەکگرتوەکانــی ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکان دەکات کە عێراقیان ئازاد کرد و سپاسی خزمەتە گەورە و درەوشاوەکەیان دەکات.

کۆنگرێســمەن هینچــی:[٢٩٠] جەنابــی ســەرۆکی ئەنجومــەن، ئەم بڕیارنامەکەیــە کە ئەمڕۆ لە بەردەســماندایا، دەیەوێت مێژوو ســەر لە نــوێ بنووســیتەوە. بڕیارنامەکە ئەوە بە فەرمی قبــووڵ دەکات کە لە ١٦ی ئــاداری ١٩٨٨ عێراق گازی کیمیایی موســتارد و گازی دەماری دیکەی دژی کوردەکان لــە هەڵەبجە بەکارهێناوە و لە ئەنجامدا نزیکەی ٥ هــەزار کەس کــوژراون. کیمیابارانی هەڵەبجــە کردەوەیەکی دڕندانە بوو کە گەلێک کەس، لەوانە وەزیرە شــەڕخوازەکانی کابینەی ســەرۆک کۆمــاری ئەمریکا وەک پاســاوێک بەکاریانهێنا بــۆ داگیرکردنی عێراق. بەڵام ئەگەر کیمیابارانکردنی کوردەکان هۆکاری شــەڕی عێراق لە ٢٠٠٣ بــوو، بۆ ئیدارەی ڕەیگان و بوشــی باوک پــاش کیمیابارانی هەڵەبجە یارمەتیەکانیان بە ڕژێمی سەدام زیاتر کرد و هاوکاریان کرد و پەیوەندییە بازرگانی و هەواڵگرییەکانیان لەگەڵ عێراق پەرەپێدا؟ پێش ئەوەی کە بە پەسەندکردنی ئەم بڕیارنامەیە، مێژوو سەرلەنوێ بنووسینەوە، گرنگە کە ئاماژە بە کۆمەڵێک ڕووداوی دڵتەزێن لەو پەیوەندیەدا بکەم.

وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، کالین پاوڵ[٢٩١] لە کانوونی یەکەمی ١٩٨٧ تا کانوونی دووەمی ١٩٨٩ راوێژکاری ئاسایشـــی نیشتمانی دۆناڵد رەیگان بوو و لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٣ ســـەرۆکی ستادی هێزە هاوبەشەکانی ئەمریکا بوو. پەوڵ ڤۆلڤۆویتز[٢٩٢]، جێگری وەزیری بەرگری ئێســـتای ئەمریکا لە ١٩٨٣ تا ١٩٩٣ جێگری وەزیری بەرگری ئەمریکا بۆ کاروباری سیاســـی بوو. کۆندولیزا رایس،[٢٩٣] راوێژکاری ئاسایشـــی نیشتمانی، لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٣ بەڕێوەبەری ئەنجومەنی ئاسایشـــی نیشتمانی ئەمریکا بوو. دیک چێنی[٢٩٤]، جێگری ســـەرۆک کۆماری ئێســـتای ئەمریکا، ســـاڵی ١٩٨٨ سەرۆکی فراکســـیۆنی زۆرینەی کۆماریخوازەکانی ئەنجومەنی نوێنەران و لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٣ وەزیری بەرگری ئەمریکا بوو.

ئەم بەڕێزانە کە پۆســـتی باڵایان هەبوو و دەســـەڵاتێکی زۆریشیان هەبوو بۆ وەدەنگ نەهاتن ئەوکاتە کە ئەم کیمیابارانە دڵتەزێنە روویدا؟ ئەمانەی خوارەوە کە بە کورتی باســـی دەکەم کۆمەڵێک لەو کارانەیە کە ئەم بەڕێزانە پاش کیمیابارانی هەڵەبجە ئەنجامیاندا:

لە ١٩٨٨ ئیدارەی رەیگان یەک بلیۆن دۆلاری وەک گارانتی قەرز دا بە عێراق. بە گوێرەی ئەو بەڵگەنامانە کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بڵاوی کردوونەتـــەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریـــکا پێش لە کۆمەڵکوژی هەڵەبجە و پاش ئەوەش زانیاری هەواڵگریی لەگەڵ رژێمی عێراق ئاڵوگۆڕ کردووە. لە ســـەرەتای تشرینی یەکەمی ١٩٨٩ سەرۆک بوش رێوشوێنی ئاسایشـــی نیشتمانی پەســـەند کرد بۆ پەرەپێدانی پەیوەندی سیاسی و بازرگانـــی لەگەڵ عێراق، لەوانە بەخشـــینی یەک بلیـــۆن دولار یارمەتی بە عێراق. لە ٣١ی تشـــرینی یەکەمـــی ١٩٨٩ جەیمس بەیکێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا خۆی لەگەڵ وەزیری کشتوکاڵ گفتوگۆی کرد بۆ ئەوەی یارمەتی مادی زیاتر بە عێراق بدەن. لە ١٩ی نیســـانی ١٩٩٠ ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی ئەمریکاش هەمان کاری بۆ عێراق کرد.

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان وشەی»

ئارام» و «ئارامتر»دا نییه. نالّێم عێراق ئارامه، نالّێم شەقامی سەرەکی شاری پنیسیلڤانیا له نیوەشەودا ئارامه. پرسیارەکه ئەوەیه که ئێستا که جەنابی سەدام حوسەین له بەندیخانەیه، عێراق ئارامتره یان ئەو کاته که له کۆشکەکەی دانیشتبوو و پیلانی بڕینی دەست و پێی خەڵکی عێراقی دادەڕژت و کوردەکانی زیندوو به چاڵ دەکرد؟

کۆنگرێسمەن بلونت:[٢٩٥] جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، ئەمڕۆ که ئێمه خەریکی تاوتوێکردنی ئەم بڕیارنامەیەین، من له سەر ئەو قەناعەتەم که بڕیاری رێبەرایەتی ئەمریکا بۆ لەسەردەســەڵات لابردنی سەدام حوسەین هەم له رووی ئەخلاقیەوە و هەم له رووی سیاســەتی ئیســتراتژیکییەوە کارێکی دروســت بوو. سەدام حوسەین جگه لەوە هیچ رێگایەکی دیکەی بۆمان نەهێشتبوەوە. سەدام ١٧ بڕیارنامەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککگرتوەکانی پێشیلکردبوو، بەڵام نەتەوە یەککگرتوەکان هیچی نەدەکرد. ســەدام هەوڵیدەدا خۆلیای خۆی بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ له کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بشارێتەوە.

له تشــرینی دووەمــی ١٩٩٩ وەزیــری دەرەوەی ئەمریکا، مادلین ئالبرایت وتی ســەدام بڕیاریداوە پارەی وڵاتەکەی سەرفی کڕینی چەکی کۆمەڵکوژ و درســتکردنی کۆشک و تەلار بۆ دۆست و هەڤاڵەکانی بکات. هیچ گومان لەوەدا نییه که ئەو قسەیەی دەیڤید کای له دانیشتنێکدا که ئەمدوایانه له کۆنگرێس بەرێوەچوو ڕاست بوو که وتی سەدام هەڕەشەیه. ئەگەر ئێوه باوەر به قســەی دەڤید کای ناکەن، فەرموون با پرسیار له کەســوکاری ئەو هەزاران کوردە بکەین که سەدام له ١٩٨٨ کیمیابارانی کردن یان پرســیار له یەکەم پشکنەرانی چەکه کۆمەڵکوژەکانی سەر به نەتەوە یەککگرتوەکان بکەین که پێش له ١٩٩٨ ئاشکرایان کرد که سەدام گازی ئانتراکس، موســتارد، VX، دەمــار و بۆمبی کیمیایی و میکروبی هەیه. تا ئەمڕۆش کەس نازانێت ئەم بۆمبانه له کوێن. پشتیوانیکردنی سەدام حوسەین له رێکخراوە جۆراوجۆرە تیروریستییەکان جێگای گومان

نییە. عێراق پشـــتیوانی لە تروریزم کردووە و توندوتیژی لە فەلەســـتین هانـــداوە چونکە ٢٥ هەزار دولاری داوە بە هەر بنەماڵەیەک کە هێرشـــی خۆکوژی دژی خەڵکی سڤیلی بێ گوناە ئەنجام بدات.

کۆنگرێســـمەن دیلاهونت: جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، بە بۆچوونی مـــن تەنهـــا خاڵێکی باش کە لـــەم بڕیارنامەیەدا هەیە ئـــەو خاڵەیە کە پەیوەندی بە مەســـەلەی چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراقەوە هەیە، چونکە هەرواکە کە هەمووومان دەزانین سەرۆک کۆمار، جێگری سەرۆک کۆمار و کاربەدەســـتانی دیکەی ئیدارەی بوش ئەو مەسەلەیانە وەک هۆکارێک بۆ رەوابوونی شەڕی عێراق لە ٢٠٠٣ بەکارهێنا. ئەڵبەتە پاشان دەرکەوت کە دەزگای هەواڵگریـــی ئەمریکا بەهەڵەدا چووە و ئەمباری چەکی ناوکی، کیمیایی و بیۆلۆژیکیمان لە عێراق نەدۆزییەوە.

دەمەوێـــت باســـی برگەیەکـــی بڕیارنامەکە بکەم کـــە دەڵێت: «بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ رژێمی سەدام حوسەین چەکـــی کۆمەڵکـــوژی دژی هاووڵاتیانی کورد بەکارهێنـــاوە و نزیکەی ٥ هەزار کەسی کوشـــتووە». ئەم برگەیە لە بارەی شارێکی عێراقە. ناوی ئەم شـــارە هەڵەبجەیە. راســـتە کە سەدام حوسەین ٥ هەزار ژن، پیاو و منداڵی کوردی لە هەڵەبجە بەکۆمەڵ کوشت. بڕیارنامەکەی بەردەستمان دەیەوێـــت بڵێت کە کۆمەڵکوژی هەڵەبجە تـــاوان دژی مرۆڤایەتییە (کە هەرواشـــە) و پاساوە بۆ داگیرکردنی عێراق پاش ١٥ ساڵ لە کیمیابارانی هەڵەبجە.

راســـتیەکی دڵتەزێن هەیە کە بۆ ئێمە جێگای شەرمەزارییە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە لە ١٩٨٨، ١٩٨٩ و ١٩٩٠ هیچمان لە پەیوەندی لەگەڵ تاوانی هەڵەبجەدا نەکرد.

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، کارەساتی هەڵەبجە لە ئاداری ١٩٨٨ روویدا و ئێمە کاتی خۆی هیچمان نەکرد، چونکە ســـەدام هاوپەیمانمان بوو. زۆرێک لەو کەســـانەی کە ئێستا لە ئیدارەی بوشدا کار دەکەن، ئەو

کاتە ئەندازیاری هاوپەیمانی ئەمریکا و سـەدام بوون. ئەو کاربەدەستانە بـاش دەیانزانی چی لــە هەڵەبجە روویداوە. وەزیری بەرگری ئێسـتای ئەمریکا، دۆناڵد رامسـفێڵد، نوێنەری تایبەتی ئەمریکا بوو کە سەردانی سـەدامی کرد. دیک چنی کە ئێستا جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکایە، وەزیـری دەرەوەی بوشـی باوک بـوو. کالین پاوڵ کە ئێسـتا وەزیری دەرەوەی ئەمریکایە ئەوکاتە هەم راوێژکاری ئاسایشـی نیشتمانی بوو و هەمیش سەرۆکی ستادی هێزە هاوبەشەکانی ئەمریکا بوو.

خوێندنـەوەی مێژووی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و سـەدام گرنگە بۆ ئەوەی ئەمڕۆ لە شـەڕی دژەتروردا هەڵەکانی ٨٠کان و ٩٠کان دووپات نەکەینـەوە. لە کاتی سـەرۆک کۆمـاری رەیگان و بوشـدا، ئەمریکا عێراقی لە ناو لیستی وڵاتانی پشـتیوانی تروریزم دەرهێنا، پەیوەندییە دیپلۆماتیکـە هەمەلایەنەکانی لەگەڵ عێراق دەسـتپێکردەوە، ملیاردها دولار قـەرزی کریدیتی دا بە سـەدام، تەکنۆلۆژی وایدا بە سـەدام کە دەیتوانی بـۆ بەرهەمهێنانی چەکی کۆمەڵکـوژ بەکاریبهێنێت. کەوابوو جێگەی سەرسـوڕمان نیە کە پاش جەنگی یەکەمـی کەنداو ئێمە بەو ئەنجامە گەیشـتین کە عێراق بەرنامەیەکی پێشـکەوتوی چەکی ناوکی هەیە، چونکە لەڕاسـتێدا خۆمان یارمەتیمان دابوو ئەو چەکانە دروست بکات. ئێمە ئامرازەکەمان دا بە دەستی کاربەدەستانی عێراق بۆ ئەوەی چەکی کۆمەڵکوژ بەرهەمبهێنن، رێگەشـمان بەوە دا کە وڵاتانی دیکەش چەکوچۆڵی ئەمریکایی بفرۆشـن بە سـەدام. ئێمـە تەنانەت کۆمەڵێک زانیاری زۆر هەستیاری هەواڵگریشمان دا بە سوپای سەدام کە لە رێگای سـەتەلایت لە ئاسـمانەوە وەدەستمان خستبوو. سـەرەڕای ئەوەی کە دەشـمانزانی سەدام چەکی کیمیایی دژی هێزەکانی ئێران بەکاردەهێنێت نەمانهێشت نەتەوە یەککگرتوەکان عێراق شەرمەزار بکات.

بە گوێرەی راپۆرتێکی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی کۆنگرێس، دەوڵەتی ئەمریکا نەتەنها پشـتیوانی لە سـەدام کرد، بەڵکوو ئیدارەی رەیگان و

بوش هەوڵەکانی کۆنگرێسیان پوچەڵ کردەوە بۆ ئەوەی ئابڵۆقە بسەپێنن بەســەر عێراقدا، چونکە چەکی کیمیایــی بەکارهێنابوو. ئیدارەی بوش دەسەڵاتی خۆی لە کۆنگرێس بەکارهێنا بۆ ئەوەی ئابڵۆقە نەسەپێندرێت بەسەر عێراقدا.

جەنابی ســەرۆکی ئەنجومەن، دەترســم ئێســتا هەمــان هەڵەکانی جۆرج بوشــی باوک، کالین پاوڵ، دیک چنی و پەوڵ وۆلفۆڤیتز دووپات بکەینەوە. دەترسم ئێستاش لە شەڕی دژەتروردا هەمان جۆر هاوپەیمانی درێــو لەگــەڵ کۆمەڵێک لە وڵاتــان ئەنجام بدەین. بــۆ نمونە لە وڵاتی ئوزبەکەستان پشــتیوانی لە دیکتاتۆریک دەکەین کە بە وتەی وەزارەتی دەرەوەی خۆمان ســەرۆکی رژیمێکی ســەرکوتکەرە کە مافی مرۆڤی بە هەموو شــێوەیەک پێشیلکردوەو ٥ هەزار بەندکراوی سیاسی هەیە[٢٩٦]. دوایین نمونەی کردەوەکانی ســەرۆک کۆماری ئوزبەکستان ئەوە بوو کە رژێمەکەی ماوەیەک لەمەوپێش بەندکراوێکی سیاسی لە نیو ئاودا کوڵاند و ئەشــکەنجەی کرد. ئەم کردەوانە، کردەوەکانی ســەدام حوسەینمان وەبیردێنێتەوە.

لە وڵاتی تورکمانســتان بووینەتــە هاوپەیمانی زۆردارێکی دیکەی ســتالینی کە بە ناوی «تورکمانباش» کەســایەتیەکی ئەفســانەیی بۆ خۆی درســت کردوە کە تەنها شان لە شانی ســەدام حوسەین دەدات. سەرۆک کۆماری تورکمانســتان ناوی مانگی کانوونی دووەمی کردوە بە «تورکمانبــاش» کە نازناوی خۆیەتی و ناوی مانگی نیســانی کردوە بە «دایک» بۆ ریزگرتن لە دایکی خۆی[٢٩٧].

ئەمرۆ لە شەڕی دژەتروردا بوینەتە هاوپەیمانی ئەم دەوڵەتانە، دروست بە هەمان شــێوە کە لە کۆتایی ١٩٨٠کاندا هاوپەیمانی ســەدام بووین. ئەڵبەتە باشیش دەزانین کە ئەنجامی ئەم هاوپەیمانیە چی دەبێت.

ســەرۆک کۆماری ئەمریکا و جێگرەکەی بەردەوام پێداگری لەســەر ئەوە دەکەن کە ئەمە شەڕی دژەترور و پەرەپێدانی دیموکراسییە. ئەی

ئوزبەکەستان و تورکمانستان؟ بۆ لەوێ هیچ  ناکەین؟ بۆ خۆمان کردوە بـــە هاوپەیمانی کۆمەڵێک دیکتاتۆر و زۆردار کـــە لە داهاتوودا دەتوانن ببن بە ســـەدام حوسەینێکی راستەقینەی دیکە. با نەبین بە هاوپەیمانی سەرۆکە ناڕەوا نوێکان. ئەگەر بۆ شەڕی دژە ترور راستگۆین با نەبین بە هاوپەیمانی سەرۆکە ناڕەواکان.

با وانەکانی مێژوو بهێنینەوە بیری خۆمان، بەتایبەت دەمەوێت وەبیری جێگری ســـەرۆک کۆمار (کە ئێســـتا بەردەوام ئاماژە بەو راستیە دەکات کە سەدام حوســـەین چەکی کیمیایی دژی هاوڵاتیانی خۆی بەکارهێناوە) بهێنمەوە کە خۆی بەشێک بوو لە ئیدارەی ئەوکاتی ئەمریکا کە ئاگاداری کیمیابارانـــی هەڵەبجە بـــوو و هیچی نەکرد بۆ ســـارێژکردنەوەی خەم و پـــەژارەی خەڵکی جیهان و ئەنجومەنی پیران و نوێنەرانی ئەمریکا. چی روویدا؟ ئایا سەدامان تەشویق کرد؟ ئەمە پرسیارێکە کە قەد وەڵامەکەی نازانین بەڵام با وانەکانی هەڵەبجە لەبیر نەکەین ئەگەر دەم لە دیموکراسی و ئـــازادی دەدەین. با وانەکانی هەڵەبجە جێبەجێ بکەین، ئەگەر دەم لە مافی مـــرۆڤ دەدەین، با  خەڵکی هەڵەبجە بپارێزیـــن. ئەگەر لە بارەی شـــەڕی دژەترور راستگۆین با نەبین بە هاوپەیمانی سەرۆکی ناڕەوای ئەو وڵاتانە کە خەڵکی خۆیان سەرکوت دەکەن. با رابردوو لە بیر نەکەین.

کۆنگرێسمەن کریس ڤان هۆڵێن:[٢٩٨] ئەمە بڕیارنامەیەکی فریودەرانەیە نەتەنها لە بەر  ئە و شـــتەی کە دەیڵێت، بەڵکو لەبەر ئەو شـــتەی کە نایشـــیڵێت. جێگای داخە کە  هاوکارە کۆماریخوازەکانمان جارێکی دیکە بابەتێک بەکاردێنن کە سەرجەم خەڵکی ئەمریکا- کە بە تێکڕا  پشتیوانی لە ســـەربازەکانمان لە عێراق دەکەن- دەخاتە ناو راوەستانێکی سیاسی ئاشکرا کە هەوڵ دەدات مێژوو بە شێوەیەکی دووبەرەکینانەوە سەرلەنوێ بنووسێتەوە. خەڵکی ئەمریکا دەبێ بزانن کە رێبەرایەتی کۆماریخواز لەم ئەنجومەنەدا نەیهێشتوە کە هیچکام لە ئەندامانی ئەنجوومەن پێشنیارێک بۆ پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ لەم بڕیارنامەیەدا بخەنەڕوو.

کەموکوڕی سـەرەکی ئـەم بڕیارنامەیە ئەوەیە کە تەنها بەشـێکی بچووک لە بەسەرهاتی عێراقمان بۆ دەگێڕێتەوە. بڕیارنامەکە لە هەوڵێکی ئاشـکرادا بۆ گۆڕینی بابەتەکە، هیچ ئاماژەیەکی بەو پاساوە سەرەکییە نەکردووە کە سـەرۆک بوش بۆ شـەڕی عێراق دەیهێنایەوە واتا بوونی ئەمبـاری چەکی کۆمەڵکوژ لە عێراق. لە باتـی ئەوە بڕیارنامەکە هەوڵ دەدات تەنها لە سـەر بنەمای مرۆڤدۆسـتانە پاسـاو بۆ بڕیاری شەڕی عێـراق بهێنێتەوە. بڕیارنامەکە لەپاڵ کۆمەڵێک شـتی دیکەدا ئاماژە بە کەڵکوەرگرتنی (رژێمی عێراق) لە چەکی کیمیایی دژی هاووڵاتیانی کوردی عێراق لە ١٩٨٨ دەکات.

پێویسـت ناکات کەس باسی پێشیلکرانی مافی کوردەکان بەدەستی سەدام حوسەین بۆ من بکات. لە ١٩٨٨ لە کۆتایی شەڕی ئێران و عێراق من وەک ئەندامی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لەگەڵ هاوکارم، «پیتیر گالبریس»[٢٩٩] سەردانی سنووری عێراق و تورکیەمان کرد. ئەو کاتە هەزاران کورد لە عێراق هەڵاتبوون و پەنایان بۆ تورکیە هێنابوو. ئێمە لەگەڵ سەدان کەس لەو ئاوارانە گفتوگۆمان کرد و بەڵگەمان لەسەر کیمیابارانکردنی خەڵکی کورد کۆکردەوە.

راپۆرتەکەی ئێمە بووە بنەمایەک بۆ ئەوەی ئەنجومەنی پیران گەڵاڵە یاسـایەک بۆ سەپاندنی ئابلۆقەی ئابووری بەسەر عێراقدا پەسەند بکات بەهۆی ئەوەی چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکارهێنابوو. گەڵاڵە یاساکە لـە لایەن ئەنجومەنی پیرانەوە پەسـەند کرا، بەڵام ئیدارەی رەیگان (کە گەلێ لە کاربەدەسـتە سـەرەکییەکانی ئێسـتا لە ئیدارەی بوشدا کار دەکەن) دژی ئەو گەڵاڵە یاسـایە راوەستا و نەیهێشت گەمارۆکانی گەڵاڵە یاسـاکە دژی عێراق جێبەجێ بکرێت. باشـە چۆن ئێوە ئەو کاتە دژی سەپاندنی ئابلۆقەی ئابووری بەسەر عێراقدا بوون (بە هۆی ئەوەی چەکی کیمیایی دژی خەڵکی مەدەنی بەکارهێنابوو) بەڵام ئەمڕۆ باتان داوەتەوە و دەڵێن بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی خەڵکی مەدەنی عێراق هۆکاری

شەڕی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دژی عێراق لە ۲۰۰۳ بوو.

جگە لـــەوەش ئەگەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن ســـەدام حوسەین دژی هاوڵاتیانی خۆی، هۆکاری ئەو شەڕە بوو، ئێمە دەبوایا لە کاتی شەڕی کەنداوی فارس لە ۱۹۹۱ کۆتاییمان بە کاری سەدام حوسەین هێنابا، چونکە عێراق لە دوای ۱۹۸۸ چەکی کیمیایی بەکارنەهێناوە واتا لەو کاتەوە کە من و هاوکارم پیتێر گالبرێس لە کۆتایی شەڕی ئێران و عێراق سەردانی سنووری تورکیە و عێراقمان کرد. بەڵام سێ ساڵ دوای ئەوە لە ۱۹۹۱ ئێمە نەتەنها سەدامان لەسەر دەسەڵات لانەبرد بەڵکوو لە کۆتایی شـــەڕدا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا خۆی بە شتی دیکەوە خەریک کردبوو لە کاتێکدا کە سەدام شیعەکانی لە باشوور و کوردەکانی لە باکووری ســـەرکوت دەکرد. ئەم بەســـەرهاتە دووڕوویی ئەم هەوڵە نیشـــان دەدات بۆ سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژوو بۆ ئەوەی هۆکارەکانی شەڕی عێراق لە ۲۰۰۳ چەواشە بکرێت.

راســـتیەکەی ئەوەیە کە ئیـــدارەی بوش بە خەڵکـــی ئەمریکای وت ناچارین شـــەڕ دژی عێراق رابگەیەنین، چونکە ســـەدام حوسەین ئێستا ئەنباری چەکی کۆمەڵکوژی هەیە و مەترســـیەکی مسۆگەرە بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانـــی ئەمریکا. کاتێک کە پشـــکنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان داوای کاتـــی زیاتریان کرد بۆ ئەوەی یەکلایـــی بکەنەوە کە ئایا عێراق چەکـــی کۆمەڵکوژی هەیە یا نا، ئیدارەی بوش ئەو داوایەی رەت کردەوە و شـــەڕی دژی عێراق راگەیاند. ئێســـتا دەزانین کە بە گوێرەی راپۆرتی ســـەرۆکی پشـــکنەرانی چەکی نەتەوە یەکگرتـــوەکان، دەیڤید کای[۳۰۰] تـــا ئەمڕۆ هیـــچ ئەمبارێکی چەکی کیمیایـــی، بیۆلۆژیکی یان ناوکی لە عێراق نەدۆزراوەتەوە. ئەم بڕیارنامەیە هیچ ئاماژەیەک بەوە ناکات کە لە ئەنجامـــی خراپکەڵکوەرگرتنی ئیدارەی بوش لە زانیارییە هەواڵگریەکان، چی خەســـارێکی جدی لە ئیعتبار و ئاسایشـــی ئەمریکا لە سەراسەری جیهاندا کەوتووە.

ڕێبەرایەتی کۆماریخواز ئەوەندە کە پشــتیوانی لە سەربازەکانمان لە عێراق دەکات، پێیخۆشە ئەوەندەش پشتیوانی لە بڕیاری سەرۆک کۆمار بۆ ڕاگەیاندنی شەڕ دژی عێراق بکات. بەڵام ئەو کەسانە کە منیان وەک نوێنــەری خۆیان لە ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبژاردووە و خەڵکی ئەمریکا شــایانی زیاتر لەو بژاردە هەڵەیەن کە لەم بڕیارنامەیەدا نیشان دراوە. من یاری بەوە ناکەم کە پشــتیوانی لە بیروبۆچونەکانی ســەرۆک کۆمار ســەبارەت بە عێراق بکەم بۆ ئەوەی پشتیوانی خۆم لە سەربازەکانمان دەربڕم. من درێژە بە پشتیوانیکردن لە سەربازەکانمان دەدەم و سپاسی خزمەتە گەورە و درەوشاوەکەیان دەکەم. من ئەمدواییانە سەردانی عێراقم کرد و شــانازی ئەوەم پێبەخشرا چاوم بە گەلێ لە هێزە چەکدارەکانمان بکەوێت. من ئەمەکناســیی خەڵکی ئەمریکام بەوان ڕاگەیاند بە بۆنەی ئــەو قوربانیدانە و ئەو خزمەتەی کە پێشکەشــی وڵاتەکەمانی دەکەن. بۆ سەربازەکانمان زۆر شــتێکی خراپە کە ڕێبەرایەتی کۆماریخواز لێرە ئەوان لەپێناو بەرژەوەندی سیاسی خۆیدا بەکاربێنێت.

لە جێگای ئەوە، من بڕیارنامەیەکم ئامادە کردووە کە تێیدا بەشــێک لەو شــتانەم نیشــانداوە کە ڕێبەرایەتی کۆماریخواز پێیخۆشە لە بیری خەڵکــی ئەمریکا بچێــت. بڕیارنامەکەی من یەک وشــەی بڕیارنامەکەی ئەنجومەنی نوێنەرانی نەگۆڕیوە، بەڵام بەهەرحاڵ وێنەی ئەو بەسەرهاتە ڕاســتەقینەیە بە تەواوی نیشــان دەدات کە لە پشــتی بڕیاری شەڕی عێراقدا بوو. کۆماریخوازەکان بۆ دەیانەوێت ئەم ڕاستیانە بشارنەوە؟ بۆ ناهێڵن خەڵکی ئەمریکا هەموو بەسەرهاتەکە بزانێت؟

***

## دانیشتنی دووەمی خولی ١٠٨ی کۆنگرێسی ئەمریکا

کۆنگرێســـمەن کریس ڤان هۆلێن بڕیارنامەیەکی لە بارەی ئازادی خەڵکی عێراق و خزمەتی درەوشاوەی هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکان و سەرنەکەوتن لە دۆزینەوەی چەکی کۆمەڵکوژ لە عێراق پێشنیار کردوە.

دەقی بڕیارنامەکە:

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە ســـەدام حوســـەین و رژێمەکەی تـــاوان دژی مرۆڤایەتیان ئەنجامداوە و بە شـــێوەیەکی چڕوپڕ مافی هاوولاتیانی عێراق و ولاتانی دیکەیان پێشێل کردووە.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رژێمی تروریستی سەدام حوسەین هاوولاتیانی عێراقی کوشـــتووە، ئەشـــکەنجە کردووە، دەســـتدرێژی کردووەتە سەریان و دەست و پێی بڕیون.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رژێمی ســـەدام حوسەین لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ چەکی کۆمەڵکوژی دژی هاوولاتیانی کورد بەکارهێناوە و نزیکەی ٥ هەزار کەسی کوشتووە

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە لـــە ئەیلوولی ١٩٨٨ ئەنجومەنی پیرانـــی ئەمریـــکا بە تێکـــڕای دەنگ گەلاڵەیاســـای (S٢٧٦٣) ی پەسەند کرد بۆ ســـەپاندنی گەمارۆی ئابووری بەسەر رژێمی سەدام حوســـەیندا بەهۆی ئەوەی چەکی کیمیایی دژی هاوولاتیانی کوردی خۆی بەکارهێنابوو بەلام ئەو گەلالەیاســـایە شکســـتی هێنا بە هۆی ئەوەی ئیدارەی رەیگان دژی راوەســـتا و هەڕەشـــەی کرد کە ڤیتۆی دەکات.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کـــە ٢٧٠ گۆڕی بەکۆمەڵ لە عێراق دۆزراوەتەوە کە ئێسک و پڕوسکی ٤٠٠ هەزار قوربانی دەستی رژێمی سەدام حوسەینی تێدابووە.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رژێمی سەدام حوسەین بۆ ترساندن و تۆقاندنی خەڵک بەردەوام لە بەرچاوی بنەماڵەکانیان دەستدرێژی کردووەتە سەریان.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە رژێمی ســـەدام حوســـەین عەرەبە رۆنگاونشینەکانی سزاداوە لە رێگای وشککردنی زەویە رۆنگاویەکانیان کە لە ئەنجامدا ســـەدان هەزار کەس ئاوارە بوون و کارەساتێکی ژینگەیی روویدا.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ۱۹۹۱ ئیدارەی بوش بریاریدا نەچێتە ناو بەغداد و پاشان وەزیری بەرگری، دیک چینی[٣٠١] رایگەیاند:

« ئەگەر برۆیشـــتینایە ناو بەغـــداد، روون نەبوو دەبێ چی بکەین، روون نەبـــوو چی دەوڵەتێک بخەینە جێگای دەوڵەتی ئێســـتای عێراق، دەوڵەتەکە شیعە بێ یان سوننە یان کورد؟ دەوڵەتێک بێ کە نزیک بێ لە بەعس یان نزیک بێ لە بنارۆخوازە ئیسلامیەکان لە عێراق ؟ ئەو دەوڵەتە کە سوپای ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە عێراق دایدەمەزراند چەندە ئیعتباری هەبوو لە کاتێکدا کە ســـوپای ئەمریکا لە عێراق بوو؟ سوپای ئەمریـــکا دەبوایا چەندە لـــە عێراق بمابایەوە بۆ ئـــەوەی ئەو خەڵکەی بپاراستایا کە حکومەتە دەستکردەکەی ئەمریکایان پێ باش بوو و ئەگەر ســـوپای ئەمریکا لەناکاو عێراقی بەجێهێشتبایا ئەو دەوڵەتە چی بەسەر دەهات؟» .

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە یاسای ۱۹۹۸ی ئازادی عێراق ( یاسای گشتی ۱۰۵-۳۳۸) کە بە ۳٦۰ دەنگی ئەرێنی و ۳۸ دەنگی نەرێنی لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانەوە پەسەند کرا رایگەیاند کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەبێ پشتیوانی لە هەوڵەکان بۆ روخانی رژێمی سەدام حوسەین بکات.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە لـــە ۸ی ئەیلوولی ۲۰۰۲ کالین پاوڵ، وەزیری دەرەوە رایگەیاند کە هیچ شـــکو گومانێک لەوەدا نییە کە سەدام حوسەین ئەمباری چەکی کۆمەڵکوژی هەیە.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە لە ۸ی ئەیلوولی ۲۰۰۲ دیک چینی، جێگری سەرۆک کۆمار وتی ئێمە لەوە دڵنیان کە سەدام بۆ وەدستتخستنی

پێداویستیەکانی پیتاندنی ئورانیۆم هەوڵ دەدات بۆ ئەوەی چەکی ناوکی بەرهەمبهێنێت.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کە لە ٨ی ئەیلوولی ٢٠٠٢ پاول، وەزیری دەرەوەی ئەمریـــکا وتی ئێمە دڵنیاین کە ســـەدام حوســـەین ئەمباری کۆمەڵێـــک چەکی بیۆلۆژیکی هەیە و لەوانەیە درێژە بە هەوڵەکانی بدات بۆ ئەوەی پەرە بەو چەکانە بدات.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢ سەرۆک بوش وتی رژێمی عێراق مەترسییەکی کتوپڕە.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئـــەوەی کە لـــە ١٠ی تشـــرینی یەکەمی ٢٠٠٢ ئەنجومەنی نوێنـــەران ئیجازەنامەی بەکارهێنانی هێزی ســـەربازی دژی عێراق پەســـەند کرد و لـــە ١٩ی ئاداری ٢٠٠٣ ویلایەتـــە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئۆپەراسیۆنی سەربازی دژی عێراق ئەنجامدا.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رژێمی عێراق ١٦.بڕیارنامەی ئەنجومەنی ئاسایشـــی نەتـــەوە یەکگرتوەکانی جێبەجێ نەکرد و لە ٨ی تشـــرینی دووەمی ٢٠٠٢ ئەنجومەنی ئاســـایش بە تێکڕای دەنگ بڕیارنامەی ١٤٤١ی پەســـەند کرد و رایگەیاند کە عێراق ســـەرپێچی لە جێبەجێکردنی ئەرک و بەرپرســـارەتییەکانی بە گوێرەی بڕیارنامەکانی ئەنجومەنی ئاســـایش، لەوانە بڕیارنامەی ٦٨٧ی ســـاڵی ١٩٩١ کردووە و ئێســـتاش دەیکات و بەتایبەت لەگەڵ پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان هاوکاری نەکردووە.

- بەلەبەرچاوگرتنـــی ئەوەی کـــە لە ٢٨ی کانوونـــی دووەمی ٢٠٠٣ ســـەرۆک بوش وتی دەوڵەتی بریتانیا بەوەی زانیوە کە سەدام حوسەین ئەمدوایانـــە هەوڵیداوە رێژەیەکی بەرچاو یورانیۆم لە ئەفریقا بدۆزێتەوە. ســـەرچاوە هەواڵگرییەکانی ئێمە پێمانیان وتووە کە ســـەدام هەوڵێداوە جۆرێک تیوپـــی ئالومینیۆم بکڕێت کە بـــۆ بەرهەمهێنانی چەکی ناوکی گونجاوە.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ٥ی شوباتی ٢٠٠٣ وەزیری دەرەوە،

کالین پاوڵ وتی «هەڵسەنگاندنە سەرەتاییەکانی ئێمە نیشان دەدات کە عێــراق ئەمــڕۆ لە نیوان ١٠٠ تا ٥٠٠ تــەن گازی کیمیایی هەیە کە بۆ پڕکردنی ١٦ هەزار راکیتی جەنگی کیفایەت دەکات. ســەدام حوسەین تەنانــەت بە ١٠٠ تــەن گازی کیمیایی دەتوانێــت ١٠٠ مایل زەوی (یانی ناوچەیەک پێنج قاتی خاکی ویلایەتی مەنهەتەنی ئەمریکا) بسوتێنێت.

- بەلەبەرچاوگرتنــی ئــەوەی کــە لــە ٧ی ئــاداری ٢٠٠٣ محەمەد ئەلبەرادەعی، بەڕێوەبەری گشــتی IAEA (ئاژانســی نێونەتەوەیی وزەی ناوکی) لە راپۆرتێکدا بۆ ئەنجومەنی ئاسایشــی نەتــەوە یەکگرتوەکان رایگەیاند: «هیچ ئاسەوارێک لە چالاکی ناوکی لەو شوێنانە کە لە عێراق پشــکنراون نەدۆزراوەتەوە و هیچ شــتێک لە ئارادا نییە کە نیشان بدات عێراق لە ساڵی ١٩٩٠وە بۆ هاوردەکردنییەورانیۆم هەوڵیدابێت».

- بەلەبەرچاوگرتنــی ئــەوەی کــە لــە ٧ی ئــاداری ٢٠٠٣ محەمەد ئەلبەرادەعی، بەڕێوەبەری گشــتی IAEA وتــی ئەو بەڵگانە کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پێشکەشی IAEA کردووە بۆ ئەوەی نیشان دات کە عێراق یورانیۆمی لە وڵاتی نیجر کڕیوە، راست نییە و ساختەیە. محەمەد ئەلبەرادەعــی بە ئەنجومەنی ئاسایشــی نەتــەوە یەکگرتوەکانی وت کە IAEA بە راوێژ لەگەڵ پسپۆڕانی دەرەوە بەو ئەنجامە گەیشتووە کە ئەم بەڵگانە (کــە بووە بە بنەمای راپۆرتەکانی پەیوەندیدار بە ئاڵوگۆڕکردنی ئەمدوایانەی ئورانیۆم لە نێوان عێراق و نیجردا) راست نین. کەوابوو بەو ئەنجامە گەیشتین کە بانگەشەکانی پەیوەندیدار بە ئاڵوگۆڕی ئورانیۆم لە نێوان عێراق و نیجر راست نین.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە بە گوێرەی ســیانزەیەمین راپۆرتی سێ مانگانەی UNMOVIC (کۆمیسیۆنی چاودێری، لێکۆڵینەوە و پشکنینی نەتــەوە یەکگرتوەکان) لە نێوان ٢٧ی تشــرینی دووەمی ٢٠٠٢ و ١٨ی ئاداری ٢٠٠٣، UNMOVIC ٧٣١ جار عێراقی پشکنیوە و هیچ نیشانەیەکی لە بەردەوامبوون یا دەستپێکردنەوەی چالاکیەکانی چەکی کۆمەڵکوژ یان

چەکە قەدەخەکراوەکانی دیکەی لە عێراق نەبینیوە.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ئاداری ۲۰۰۳ پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتــوەکان داوای کاتی زیاتریان کرد بۆ ئەوەی یەکلایی بکەنەوە کە ئایا عێراق چەکی کۆمەڵکوژی هەیە یان نا؟.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئیدارەی بوش ئەو داواکاریەی نەتەوە یەکگرتوەکانی رەت کردەوە.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ١٦ی ئاداری ۲۰۰۳ دیک چینی، جێگــری ســـەرۆک کۆماری ئەمریــکا وتی:» ئێمە دەزانین کە ســـەدام ئەوپەڕی هەوڵی خۆی داوە چەکی ناوکی وەدەست بخات و پێمانوایە کە لە راستیدا دەستی بە بەرهەمهێنانی چەکی ناوکی کردووە».

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ١٦ی ئاداری ۲۰۰۳ سەرۆک کۆمار بوش رایگەیاند کە دیکتاتۆری عێراق و چەکە کۆمەڵکوژەکانی مەترسین بۆ ئاسایشی گەلانی ئازاد.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ۲۵ی ئاداری ۲۰۰۳ دوناڵد رامسفێلد، وەزیری بەرگری وتی ئەو مەترســییە کە چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراق دروستی کردوە، لەناو دەبردرێت.

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ۲ی تشــرینی یەکەمی ۲۰۰۳ دەیڤید کای، ســـەرۆکی پشکنەرانی چەکی کۆمەڵکوژ وتی «زانیارییەکان نیشان دەدات کە توانایــە بەرفراواناکەی عێراق بۆ پەرەپێدان، بەرهەمهێنان و تەیارکردنی چەکەکان بە گازی کیمیایی لە کاتی «ئۆپەراسیۆنی گەردەلولی بیابــان» [۳۰۲] و «رێوی بیابـــان» [۳۰۳] و هەروەها لە ئەنجامی ١٣ســـاڵ گەمارۆی نەتەوە یەکگرتوەکان و پشــکنینەکانی نەتەوە یەکگرتوەکاندا کەمی کــردووە ئەگەر بەتەواوی لەناویــش نەچووبێت. هەوڵەکانی ئێمە بــۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی بەرنامـــەی ناوکی عێراق ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبووە و ئێمە زانیاری باوەڕپێکراومان دەربارەی ئەمباری چەکە کیمیایەکانی عێراق پاش ساڵی ۱۹۹۱ نیە».

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ٢ی تشـــرینی یەکەمی ٢٠٠٣ دەیڤید کای وتـــی» تا ئەمڕۆ هیـــچ بەڵگەیەکی رونمان نییە کە نیشـــان بدات عێـــراق پاش ١٩٩٨ هەنگاوی گرنگی بۆ درســـتکردنی چەکی ناوکی یان کەرەستەکانی بەرهەمهێنانی چەکی ناوکی هەڵگرتبێت».

- بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە تا ئەمڕۆ، سەرەڕای گەڕانی بەرفراوانی نەتـــەوە یەکگرتوەکان، هیچ چەکێکی کیمیایـــی، بیۆلۆژیکی، ناوکی یان چەکە کۆمەڵکوژەکانی دیکە لە عێراق نەدۆزراوەتەوە.

کەوابوو:

١- ئەنجومەنـــی نوێنەران ئەوە پشتڕاســـت دەکاتـــەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و جیهان بە نەمانی سەدا حوسەین و رژیمەکەی ئەمنتر بووە. بەهەرحاڵ پرســـیاری ســـەرەکی بۆ خەڵکی ئەمریکا ئەوە نییە کە ئایا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بێ ســـەدام باشترە یان نا، بەڵکو ئەوەیە کە ئایا بارودۆخی ئەمریکا پاش شـــەڕی عێراق بۆ لابردنی سەدام حوسەین باشتر بووە یان نا؟

٢- ئەنجومەنی نوێنەران دەزانێت کە سەرەڕای لەسەردەسەڵات لابرانی ســـەدام حوسەین، هێشـــتا زووە بەو ئەنجامە بگەین کە شەڕی ئەمریکا لە عێراق بارودۆخی ئاسایشـــی ئەمریکای باشـــتر کردووە. لەراســـتیدا بارودۆخەکە نیشـــان دەدات کە سیاســـەتەکەی سەرۆک بوش سەبارەت بە عێراق، بارودۆخی ئاسایشـــی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای باشتر نەکردووە.

٣- ئەنجومەنـــی نوێنـــەران، زانیارییەکانی دەیڤید کاتی، ســـەرۆکی پێشـــووی پشـــکنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان دەربـــارەی نەدۆزرانەوەی چەکی کۆمەڵکوژ لە عێراق پشتڕاست دەکاتەوە.

٤- ئەنجومەنـــی نوێنەران پشتڕاســـتی دەکاتەوە کە هیچ بەڵگەیەک نەدۆزراوەتەوە کە راستبوونی بانگەشەکانی سەرۆک بوش، دیک چینی، جێگری ســـەرۆک کۆمار، کالین پاوڵ، وەزیری دەرەوە، دۆناڵد رامسفێلد،

وەزیری بەرگری و کوندولیزا رایس، راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی لە ٨ی ئەیلوولی ٢٠٠٢ تا ئێستا (کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێکرا) نیشان بدات.

٥- ئەنجومەنی نوێنەران ستایشـــی خەڵکی عێــراق دەکات بە هۆی ئەوەی بوێرانە بەرەنگاری سەرکووتی توند و کردەوە دڕندانەکانی رژێمی سەدام حوسەین بوونەوە.

٦- ئەنجومەنـــی نوێنەران ستایشـــی خەڵکی عێراق دەکات بە بۆنەی پەسەندکردنی یاسای بنەڕەتی عێراق.

٧- ئەنجومەنـــی نوێنەران ستایشـــی هێــزە چەکدارەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانـــی ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکان دەکات کە عێراقیان ئازاد کرد و سپاسی خزمەتە گەورە و دەرەوشاوەکەیان دەکات.

٨- ئەنجومەنـــی نوێنەران هاوخەمی خۆی لەگەڵ بنەماڵەی ئەو هێزە ئەمریکیانە دەردەبڕێت کە لە عێراق کوژراون.

## ئەگەری دووپاتبوونەوەی کۆمەڵکوژی کوردەکان پاش دەرچوونی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق

**ئەنجومەنی نوێنەران**

**٢١ی نیسانی ٢٠٠٤**

کۆنگرێســـمەن جیـــم مەکدێرمـــۆت:[٢٠٤] جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، قوربانیبوونی سەربازانی ئەمریکایی لە عێراق راستییەکی تاڵە و ئەنجامی شەڕێکە کە ســـەرۆک کۆمار هەڵیگیرســـاند و جەنابت ( وەک من) دژی ئەو شـــەڕە بووی. هـــاوکات لەگەڵ ئەوەی کە دەبێ ســـەرنج بە کوژران و برینداربوونـــی هێزەکانمـــان لـــە عێراق بدەین، دەبێ ســـەرنجیش بە قوربانیبوونی کوردەکانی عێراق لە شەڕدا بدەین کە لە ئەمریکا سەرنجی پێنەدراوە. لە راستیدا ئەم شەڕی دواییە، شەڕی دووەمی کەنداو نەبوو، بەڵکوو شەڕی سێیەمی کەنداوە لە بیرەوەری ئێمەدا.

پاش شەڕی یەکەمی کەنداو[٣٠٥]، ئەمریکا لە کەنداو کشایەوە و دەستی سەدامی ئاوەڵا کرد.بۆ ئەوەی دەسەڵاتەکەی بەهێزتر بکات. رژێمی سەدام کاری بەزماننەهاتووی زۆری ئەنجامدا، خەڵکی بە بارمەتە گرت، خەڵکی کوشت، هەزاران کەسی کوشت، ئەم روداوانە لەوانە دووپات بێتەوە.

پاش شەڕی یەکەمی کەنداو، ئێمە هەرێمی دژەفڕینمان لە عێراق دروستکرد، بەڵام گاردی کۆماری سەدامیان چەک نەکرد و هیلیکۆپتەرەکانیمان نەخستەخوارەوە، چونکە رووی چەکەکانی سەدام لە سەربازانی ئەمریکا نەبوو، بەڵکوو رووی لە خەڵکی عێراق بوو. لە ئەنجامدا درندەیی و کۆمەڵکوژییەکی بێ وێنە روویدا. لانیکەم ٨ هەزار کورد بەدەستی سەدام و داروودەستەکەی بەکۆمەڵ کوژران پاش ئەوەی ئەمریکا لە عێراق کشایەوە و داوای لە خەڵکی عێراق کرد دژی سەدام راپەڕن.

کوردەکان هاواریان کردو داوای یارمەتییان کرد، بەڵام کەس بەهانایانەوە نەچوو. شەڕ تەواو بوو، پاشان جۆرج بوشی ژمارە یەک[٣٠٦] سەرکەوتنی لەشەڕدا راگەیاند. ئێمە سەرمان لەو چیرۆکانە سڕمابوو (کە گەلێکیان راست نەبوون) کە باسی ئەوەیان دەکرد چۆن تەکنۆلۆژی ئەمریکا گیانی خەڵکی رزگار کردووە و ژمارەی کوژراو و برینداەکانی کەم کردوەتەوە و زلهێزبوونی ئەمریکای راگرتووە. سەتەلایتەکان وێنەی هەموو شتێکی نیشاندەدا جگە لە وێنەی بەکەمۆڵکوژرانی ئەم خەڵکی کوردە کە ئەویندارى ئاشتییە.

کوردەکان دەوروبەری ٢٠٪ی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن، کولتوورو زمانی تایبەت بە خۆیان هەیە و هەرچەند کە مسڵمانن بەڵام عەرەب نین. کوردەکان هەر لە کۆنەوە لە ناوچەیەکی شاخاوی لە دەوروبەری کەرکووک لە باکوری عێراق ژیاون. ئەم ناوچەیە ٧٪ی سەرچاوەکانی نەوتی جیهانی تێدایە. ئەو سەروەتە گەورە نەوتەی کە لە دەوروبەری کەرکووک هەیە بووە هۆکارێک بۆ ئەوەی سەدام و گروپە ئەتنیکیەکانی

دیکە کوردەکان دەربکەن. سەدام هەموو دەرفەتێکی بەکارهێنا بۆ ئەوەی کوردەکان سەرکوت بکات و لەناویان بەرێت، بەڵام ئەمریکا زۆر ئاگاداری ئەو نەهامەتیانە نییە کە سەدام هێنای بەسەر ئەم خەڵکەدا.

لەکاتێکدا کە سەرۆک بوش قەد چەکی کۆمەڵکوژی لە عێراق نەدۆزیوەتەوە، کوردەکان پێماندەڵێن کە سەرۆک کۆماری ئەمریکا بەڵگە و نیشانەکانی کۆمەڵکوژی دۆزیوەتەوە [٣٠٧]. کوردەکان لەوە دەترسن کە ئەم کۆمەڵکوژییە دووپات بێتەوە و ئێمەش دەبێ لە ئەگەرێکی وا بترسین. کوردەکان لەوە دەترسن (ئێمەش دەبێ لێی بترسین) کە ئەگەر هێزەکانی ئەمریکا ٣٠ی حوزەیران لە عێراق بکشێنەوە، کۆمەڵکوژی کوردەکان دەستپێبکاتەوە.

ئێمە نەدەبوایا کوردەکانمان پاش شەڕی یەکەمی کەنداو بەتەنیا هێشتبایەوە و نابێ پاش ٣٠ی حوزەیران بەتەنیایان بێڵینەوە. ٣٠ی حوزەیران تەنها بۆ بەرزەفڕییە سیاسییەکانی سەرۆک کۆمار باشە. بینیمان کە پاش دوایەمین پاشەکشەی ئەمریکا لە عێراق چی روویدا. ئێمە ناتوانین دوبارە کارێکی وا بکەین و رێگا بۆ ئەوە خۆش بکەین کە تاوانگەلی بەزماننەهاتوو دژی کوردەکان روو بداتەوە.

کوردەکان شایانی ئازادین، شایانی ئەوەن بپارێزرێن، ئەو خوێنڕشتنە کە رۆژانە لە عێراق دەیبینین نیشان دەدات کە وڵاتی عێراق ناسەقامگیرە و هۆشدارییەکە بۆ قەومانی خوێنڕشتنێکی گەورە ئەگەر ئەمریکا بەرپرسیارەتیەکەی لەبەرامبەر عێراق و سەرجەم خەڵکی عێراق جێبەجێ نەکات.

ئێمە دەبێ لە عێراق بمێنینەوە، نابێ پاش ٣٠ی حوزەیران لە عێراق بێینەدەرەوە. دەبێ لە عێراق بمێنینەوە تا ئەوکاتە کە کوردەکان لە ئارامی و ئاسایشدا بن، تا ئەو کاتە کە خودی عێراق ببێ بە شوێنێکی ئەمن. ئێمە قەرزاریاری عێراقین. بە راگەیاندنی شەڕ، ئێمە بەرپرسیارێتی داهاتووی عێراقمان وەئەستۆ گرت.

ئێمــــه ناتوانین به ڕێگای خۆماندا بڕۆین و عێراق لەناو ئەو ئاژاوەیەدا بهێلینەوە کە خۆمان دروستمان کردووە لە سەرەتای شەڕی عێراق ئێمە هۆشـــداریماندا بە سەرۆک کۆمار کە ســـەرکەوتنی سەربازی لەو شەڕەدا ئاســـانە، چونکە لە رووی سەربازییەوە بەهێزین، بەڵام سەقامگیرکردن و سەپاندنی ئاشتی لە عێراق ئاسان نییە، بەڵام سەرۆک کۆمار هیچ پلانێکی بۆ ئەوە نەبوو، هەوڵەکانی وەزارەتی دەرەوەی بۆ ئەو مەبەستە پشتگوێ خست، هۆشداریەکانی هەموو کەسی پشتگوێ خست. ژنراڵ شینسکی[٣٠٨] وتی ئەو پلانە ٣٠٠ هەزار ســـەربازی دەوێت بەڵام داروودەستەی سەرۆک کۆمـــار وتیان بێدەنگبەو لە مەیدان بەدەریان کرد، چونکە راســـتیەکەی وت.

ئێســـتا ئێمە خەریکین هەمان هەڵەی پێشـــوو دووپات دەکەینەوە، چونکە ســـەرۆک کۆمار دەیەوێت رابگەیەنێـــت کە «ئێمە ئەرکی خۆمان جێبەجێکرد، دیموکراسی چەسپا» ئەوە روداوەکەی «ڤیەتنام»م وەبیر دێنێتەوە کاتێک کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرکەوتنی لەشەڕدا راگەیاند و ئەمریکییەکان خۆیان لە بانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ڤیەتنام رزگار کرد[٣٠٩] ئێمە نابێ رێگا بدەین ئەوە دووپات بێتەوە.

## پاش کیمیابارانی هەڵەبجە
## ئەمریکا زیاتر یارمەتی رژێمی عێراقی دا

**ئەنجومەنی نوێنەران**

**١٣ی تەموزی ٢٠٠٤**

کۆنگرێسمەن هینچی: جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، گونجاندنی ئەم چاکسازییە لە گەڵاڵەیاساکەدا[٣١٠] گرنگە، چونکە هەروا کە لە رابردوودا، بەتایبەت کاتی ئیدارەی رەیگان و بوشی باوکدا بینیمان ئیدارەی ئەمریکا بەتایبەت کریدیتی کۆمپانیاکانی بەکارهێناوە بۆ مەبەستەکانی خۆی.

بۆ نمونە پاش کیمیابارانی کوردەکان لە هەڵەبجە لە ١٩٨٨ ئیدارەی ئەمریکا عێراقی لە لیستی وڵاتانی پشتیوانی تروریزم دەرهێنا و بەشێوەی جۆراوجۆر یارمەتی عێراقیدا کە بەرچاوترین نمونەی بەخشینی کریدیت لەلایەن کومپانیا ئەمریکیەکان بوو بە عێراق. نزیکەی ٤ بلیۆن دولار لە رێگای کومپانیای CCC،ەوە درا بە عێراق سەرەرای ئەوەی کە کومیسیۆنی کشتوکاڵی کۆنگرێس بە هۆکاری جۆراوجۆر دژی ئەوە راوەستا. لەگەڵ ئەوەشدا جێگری سەرۆک کۆماری ئەو کاتی ئەمریکا و کاربەدەستانی دیکەی کۆشکی سپی دەستێوەردانیان کرد و سەرەنجام پارەکە نێردرا بۆ عێراق، بەڵام نازانین خەرجی چی کرا. یارمەتی ئابووری درا بە عێراق، چەکوچۆڵ نێردرا بۆ عێراق، بەڵام ئێستا کاربەدەستانی ئەمریکا، لەوانە سەرۆک کۆمار و وەزیرەکانی، کیمیابارانی هەڵەبجە بەکاردێنن و دەڵێن لەبەر ئەوە عێراقیان داگیر کردووە کە سەدام کارەساتێکی وای خوڵقاندوە.

سەدام حوسەین کوردەکانی هاوولاتی خۆی لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ کیمیاباران کرد. بەڵێ بە شێوەیەکی شەیتانی کیمیابارانی کردن و ٥ هەزار کەس یان زیاتر کوژران. ئەو کاتە وەڵامی دەوڵەتی ئەمریکا چی بوو؟ ئەوە بوو کە زیاتر پشتیوانی لە عێراق کرد، زانیاری هەواڵگری لەگەڵ عێراق ئاڵوگۆڕ کرد، کریدیتی کومپانیاکانی بەخشی بە عێراق،

چــەک و تەقەمەنـــی و چەکی کیمیایی زیاتری دا بـــە عێراق. ئەوە بوو وەڵامـــی ئەمریکا بە کیمیابارانی کوردەکان، گەلێک لەوانەی کە ئێســـتا بە چاوی پیرۆزەوە ســـەیری هێرشـــی ئەمریکا بۆ ســـەر عێراق دەکەن هەر هەمان ئەو کەســـانن کە کاتی کیمیابارانـــی کوردەکان لە دەوڵەتی ئەمریکادا خاوەن پۆست بوون.

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، ئەو چاکســـازییە کە هاوکارم خاتون کاپتـــور[٣١١] بۆ ئەم بڕیارنامەیە پێشـــنیاری کردوە ســـادەیە، بەڵام زۆر پێویســـتە. لە ١٩٨٠کاندا ئیدارەی رەیگان و جۆرج باشـــی باوک بلیۆنها دۆلاریـــان لە چوارچێوەی کریدیتەکانی کۆمپانیـــای CCC دا بە عێراق. ئـــەم پارەیە پاش ئەوە درا بە عێراق کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پشتڕاســـتی کردەوە کە سەدام حوسەین چەکی کیمیایی دژی کوردەکان و هێزەکانـــی ئێران بەکارهێناوە. بۆ نمونە لە تشـــرینی دووەمی ١٩٨٣ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا پشتڕاستی کردەوە کە عێراق هەموو رۆژێک چەکـــی کۆمەڵکـــوژ دژی هێزەکانی ئێران بەکاردێنێـــت. لەهەمان کاتدا ئەمریکا ٤١٣ ملیۆن دولاری وەک قەرزی کشتوکاڵ دا بە عێراق.

لـــە ١٩٨٤ ســـەرەڕای ئەوەی کـــە عێراق درێژەی بـــە بەکارهێنانی چەکـــی کیمیایـــی دەدا، ئیـــدارەی رەیگان ٥١٣ ملیـــۆن دولاری وەک قەرزی کشـــتوکاڵی دا بە عێراق. ئەم قەرزانە وای لە سەدام کرد چەکی زیاتر بکڕێـــت و خۆی دژی خەڵکی ئێران بەهێزتر بکات. کاربەدەســـتە پایەبەرزەکانی ئەمریکا ســـەرەڕای دژایەتیکردنی کاربەدەستانی خوارەوە ئەو قەرزانەیان دەدا بە عێراق. بۆ نمونە لە ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٩ جەیمز بەیکێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا خۆی لەگەڵ وەزیری کشتوکاڵ قســـەی کرد و قەناعەتی پێهێنا رازیبێت بە بەخشینی یەک بلیۆن دۆلار وەک کریدیتـــی خواردەمەنی بۆ عێراق. ئەو بـــڕە پارەیە درا بە عێراق. روونە کە ئەم کردەوانە نایاسایی بوو و نەدەبوایا رێگەی پێدرابایا.

کاتێک کە کوردەکان کیمیاباران کران کالین پاوڵ ( وەزیری دەرەوەی

ئێســـتای ئەمریکا) راوێژکاری ئاسایشی نیشـــتمانی دۆناڵد رەیگان بوو. پـــەوڵ ڤۆلڤۆویتز، جێگری وەزیری بەرگری ئێســـتای ئەمریکا لە ۱۹۸۳ تـــا ۱۹۹۳ جێگری وەزیری بەرگری ئەمریکا بوو بۆ کاروباری سیاســـی. کۆندولیزا رایس کە ئێســـتا راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانیە لە ۱۹۸۹ تا ۱۹۹۳ بەڕێوەبەری ئەنجومەنی ئاسایشـــی نیشتمانی ئەمریکا بوو. دیک چنی، جێگری ســـەرۆک کۆماری ئێستای ئەمریکا ساڵی ۱۹۸۸ سەرۆکی فراکســـیۆنی زۆرینەی کۆماریخوازەکانی ئەنجومەنی نوێنەران و لە ۱۹۸۹ تا ۱۹۹۳ وەزیری بەرگری ئەمریکا بوو. تەنانەت تام دیلای(۳۱۲) کە ئێستا ســـەرۆکی فراکسیۆنی زۆرینەی کۆنگرێســـە، لە ئەیلوولی ۱۹۸۸ دەنگی نەدا بە گەڵاڵە یاســـاکەی ئەنجومەنی پیران بۆ سەپاندنی ئابڵۆقە بەسەر عێراقدا کە پاش کیمیابارانی هەڵەبجە ئامادەکرابوو. تا ئەو شـــوێنە کە ئێمە ئاگادارین هیچکام لەم کاربەدەســـتانە دژی ئەو یارمەتیە بەرفراوانە نەبوون کە ئیدارەی رەیگان و بوشـــی بـــاوک پاش کیمیابارانی هەڵەبجە دایان بە عێراق.

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، داواکارم ئەو چاکســـازییە کە هاوکارم خاتون کاپتور بۆ ئەم بڕیارنامەیە پێشـــنیاری کردووە پەسەند بکرێت بۆ ئەوەی ئەو هەڵانە دووپات نەبێتەوە کە لە کاتی ئیدارەی رەیگان و بوشی باوکدا روویدا.

## یادی قوربانییه کوردەکانی هێرشی ١٦ی ئاداری ١٩٨٨

**ئەنجومەنی نوێنەران**

**١٦ی ئاداری ٢٠٠٥**

کۆنگرێسمەن لانتۆس:[٣١٣] جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، داوا لە هاوکارانم دەکەم یادی ئەو رووداوە ترسناکانە وەبیربهێننەوە کە لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ لە هەڵەبجە لە عێراق قەوما. ئەمڕۆ هەڤدەیەمین ساڵیادی هێرشی کیمیایی سەدام حوسەین بۆ سەر هاوڵاتیانی خۆیەتی کە لە کاتی شەڕی نێوان هێزە کوردەکان (کە دژی سەرکوتی سەدام خەباتیان دەکرد) و سوپای عێراقدا روویدا. ئەم هێرشە بەشێک بوو لە زنجیرە هێرشە سیستماتیکەکانی سەدام کە ئامانجی ژینوسایدی کوردەکانی عێراق بوو و بە شاڵاوی ئەنفال ناسراوە.

سەدام حوسەین بۆ سەرکوتکردنی خەباتی کورد بێ جیاوازی چەکی کیمیایی دژی پێشمەرگە و خەڵکی مەدەنی کورد بەکارهێنا. هێرشەکەی هەڵەبجە یەکێ لەو ٤٠ هێرشە کیمیاییە بوو کە سەدام حوسەین دژی خەڵکی کورد ئەنجامیدا. لەراستیدا کوردەکانی هەڵەبجە و شارۆچکەکانی دەوروبەری بوون بە گەورەترین خەڵکی مەدەنی کە تا ئێستا کەوتونەتە بەر چەکگەلی کیمیایی لەوانە گازی سارین، VX، تابوون و موستارد. لە ئەنجامی شاڵاوی دڕێو و بەرفراوانی ئەنفال سەدان گوندی کوردنشین بەتەواوی خاپور کران و ٢٠ هەزار کورد کوژران.

کارەساتی هەڵەبجە دەبێ ببێ بە وانەیەک بۆ ئەوانەی کە نیگەرانن لە داهاتوودا چەکگەلی کیمیایی و بیۆلۆژیکی بەکارببردرێت. جیهان بینی کە ژن و پیاو و منداڵی بێگوناه بە دەستی رژێمێکی دڕندە ئازاریان چەشت و کوژران و بە ماوەی ١٤ ساڵ سەدام حوسەینی دیکتاتۆر بێ ئەوەی بە سزای تاوانەکانی بگات سەدان هەزار خەڵکی بێگوناحی عێراقی کوشت، چەکی کیمیایی قەدەخەکراوی دژی کوردەکانی عێراق بەکارهێنا

و بـــێ ئەژمار مافی مرۆڤی پێشـــێل کـــرد. لە ماوەی ئەو ١٤ ســـاڵەدا ژمارەی قوربانیانی ســـەدام بە کورد و غەیرە کوردەوە، بە شـــێوەیەکی سەرســـوڕهێنەر زیادی کرد هەروەها کە دۆزینەوەی گۆڕە بەکۆمەڵەکان ئەو ڕاستییە نیشان دەدات.

جەنابی ســـەرۆکی ئەنجومەن، ئێستا مێژوو تۆڵەی قوربانیانی سەدام حوســـەین دەکاتەوە (هەرچەند کە ئەو تۆڵەســـەندنەوەیە درەنگ کەوت و وەکوو پێویســـت نییە) و بەمزوانە ســـەدام حوســـەین لەگەڵ سزای تاوانەکانی ڕووبـــەڕوو دەبێتەوە. داوا دەکـــەم هاوکارانم هاودەنگ لەگەڵ من دژی ســـەرکوت و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و بیۆلۆژیکی وەجواب بێن. ئەوە ئێستا باشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی ڕێز بگرین لە ئێش و ئازاری خەڵکی هەڵەبجە و ســـەرجەم قوربانیانی شـــاڵاوی دژەمرۆڤی ئەنفال و ئەوانەی کە بە دەستی سەدام حوسین لەناوچوون.

## لەساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجەدا هێزەکانی ئەمریکا داهاتوویەکی باشتر بۆ عێراق بنیاتدەنێن

### ئەنجومەنی نوێنەران

### ١٧ی ئاداری ٢٠٠٥

کۆنگرێســـمەن دانا ڕۆهراباچێر:[٣١٤] جەنابی سەرۆکی ئەنجومەن، لە ٦ی ئاداری ١٩٨٨ ســـەدام حوسەین بەشێوەیەکی دڕندانە هێرشی کردە ســـەر هەڵەبجە لە کوردستانی عێراق. کاتێک کە بۆمبارانەکە تەواو بوو زیاتـــر لە ٥ هـــەزار کەس کوژران و زیاتر لە ٨ هەزار کەســـی دیکەش بریندار بوون. بریندارەکان خەڵکی مەدەنی بوون. لەو ڕۆژەدا بنەماڵەکان پێکـــەوە مردن و منداڵەکان هەتیو بـــوون. گەلی کورد ئەو ڕۆژەی قەت لەبیر ناچێت.

دوای ئـــەوەی کە گازی کیمیایی تا نیـــوەڕۆی ئەو ڕۆژە لەناوچوو،

دوکەڵێکی کوشـــندە نزیک لـــە زەوی چووە ناو ژێرخانی ئەو ماڵانەی کە خەڵک خۆیان تێدا حەشاردابوو. پێستی خەڵک سووتا، هەندێکیان خێرا کوێر بوون، هەندێک خۆیان خســـتە نێو تەرمی ئەندامانی بنەماڵەکانیان بۆ ئەوەی تووشـــی گاز نەبن، ئەوانەی توانیان هەڵێن، هەڵاتن و کاتێک کە ئێش و ئازار ســـەراپای لەشـــیانی داگرت و هەستیان بە لاوازی کرد، ئێدی نەیانتوانی هەڵێن.

ئەمڕۆ من یادی ئەو ژن و منداڵ و پیاوانە بەرز رادەگرم کە بەدەستی ســـەدام حوسەینی مرۆڤکوژی بێڕەحم گیانیان لەدەستدا. ئەوانەی کە لە کۆمەڵکوژی هەڵەبجەدا گیانیان لەدەســـتدا ٥هەزار کەس لەو ٢٠٠ هەزار کوردە بوون کە لە کاتی شـــاڵاوی ژینوســـایدی رژێمی سەدام حوسەین کوژران یا بێسەروشـــوێن کران. ســـەدان هـــەزار هاووڵاتی دیکەی عێراق کوژران و بێسەروشوێن کران.

جەنابـــی ســـەرۆکی ئەنجومەن، هـــاوکات لەگەڵ ئـــەوەی کە هێزە چەکدارەکانی ئێمە بـــۆ بنیاتنانی داهاتوویەکی دیموکراتیک بۆ خەڵکی عێراق خەبات دەکەن، دەبێ کارەساتی دڵتەزێنی هەڵەبجە وەبیربێنینەوە و ئەوە بزانین کە ئەو دیکتاتۆرییە دۆزەخییە کە خەڵکی عێراقی کۆتوبەند کردبوو بەشـــێک لە مێژووی عێراقە نە بەشـــێک لە داهاتووی عێراق. با پێکـــەوە ئێش و ئـــازار و نەهامەتیەکانی ســـەرجەم هاووڵاتیانی عێراق، بەتایبەت کـــوردەکان لە هەڵەبجە وەوبیربێنینەوە و شـــانازی بە هێزە چەکدارەکانمان بکەین کە داهاتویەکی باشتر لە عێراق بنیاتدەنێن.

## رژێمی عێراق کوردە فەیلییەکان و بارزانییەکانی بەکۆمەڵ کوشتووە
## ئەنجومەنی پیران
## ١٩ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٥

سـناتۆر ئالارد: [٣١٥] جەنابی سـەرۆکی ئەنجومەن، دەمەوێت پیرۆزبایی لە گەلـی عێراق بکـەم بە بۆنەی نووسـینەوەی لاپەڕەیەکی دیکەی مێژووی وڵاتەکەیـان. پاش ئەوەی کـە هێزە هاوپەیمانەکان ڕژێمی سـەرکوتکاری سەدامیان ڕووخاند، گەلێ کەس پێیانوابو وکە ساڵانیکی زۆر دەخایەنێت کە خەڵکی عێراق دەمودەزگای دەوڵەتەکەیان وەدەسـت بگرن بەڵام بەهەڵەدا چوون. لە ٢٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٤ دەسەڵاتی عێراق ڕادەست بە عێراقیەکان کرا و عێراقیەکان بوون بە دەسەڵاتداری وڵاتەکەیان.

لـە ٢٠ی حوزەیرانـی ٢٠٠٥ ملیۆنان کەس لە خەڵکـی عێراق، لەوانە ژنەکان لەو کەشـوهەوا نالەبارەی ئاسایشـی عێراقدا ژیانی خۆیان خستە ناو مەترسـییەوە بۆ ئەوەی نوێنەرانی کاتیی پارلمان هەڵبژێرن بۆ ئەوەی دەسـتورێکی نوێ دابنێن. کۆتایی حەفتەی ڕابردوو، ملیۆنان عێراقی لە ٦ هەزار بنکەی دەنگدان لە سەراسەری عێراق، دەنگیاندا.

کاتێک چاو بە مێژووی سـەدام حوسەیندا دەخشێنم کە ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژی دادگاییکردنی بوو، بە خۆشـبینیەوە دەڕوانمە توانایی خەڵکی عێراق بۆ ئەوەی سـەدام بە شێوەیەکی دروسـت و دادپەروەرانە دادگایی بکرێت. خەڵکـی عێراق مێژوویەکەیان تێپەڕاندووە کە پڕ بووە لە کاری نامرۆڤانەی دیکتاتۆرێکی دڵڕەق بە ناوی سـەدام حوسـەین کـە بێ هیچ هۆکارێک هەزاران هەزار خەڵکی کوشـتووە، تەنهـا گوناهی ئەو خەڵکە ئەوە بوو کە نەیاری سەدام حوسین بوون.

با چاوێک بە مێژووی کۆندا بخشێنین. سەدام نزیکەی ٣٠ ساڵ لەمەوپێش بەدەسەڵاتگەیشت و لەم ٣٠ ساڵەدا نەهامەتی زۆری بەسەر خەڵکی عێراقدا هێنـا. لە ١٩٨٠ کـوردە فەیلیەکانی ئازاردا و سـەرکوتی کرت. لە ١٩٨٣

بارزانیــەکان و ئەندامانی KDP (پارتی دیموکراتی کوردســتان)ی بەکۆمەڵ کوشت. لە ١٩٨٨ شاڵاوی ئەنفالی ئەنجامدا و ١٨٢ هەزار کەسی بێسەروشوێن کرد. لە ١٩٨٨ رژێمی سەدام بە چەکی کیمیایی هێرشی کردە سەر زیاتر لە ٤٠ گوندی وڵاتی خۆی. لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ رژێمی عێراق شارۆچکەی هەڵەبجەی بە گازی ســارین و VX کیمیاباران کرد کە لە ئەنجامدا زیاتر لە ٥ هەزار کەس کوژران و هەزاران کەسی دیکەش بریندار بوون.

گەلێــک لە بریندارەکانی هەڵەبجە تووشــی نەخۆشــیگەلێکی ئاڵۆز و درێژخایــەن بوون و هەزاران کەســیان مرد. گەلێک لــە خەڵکی هەڵەبجە منداڵەکانیان بە شێواوی لەدایک دەبن. لە ١٩٩١ کاتی راپەرینی شیعەکان لە باشوور، رژێمی سەدام بە شێوەیەکی درندانە دەیان هەزار سەربازو سڤیلی کوشــت. لە ١٩٩١ پاش راگەیاندنی ئۆتونومی کورد، گەلێک لەو کوردانەی کە لە ناوچەی ســەوز[٣١٦] دەژیان کوژران و لە ناوچەی کەرکووک خرانە ناو گــۆرە بەکۆمەڵــەکان. لە ١٩٩١ کاتی راپەرین لە نەجــەف جارێکی دیکە درندەیی رژێمی بەعســمان بینی. پاش ســەرکوتکردنی راپەرین، نەیارانی رژێم بەکۆمەڵ دەستبەســەر کــران، خرانە بەندیخانە و ئەشــکەنجەکران. عەرەبە زۆنگاونشــینەکان کە هەزاران ســاڵ بوو لە زێــدی خۆیان دەژیان لەلایــەن رژیمەوە ناچار کران زێدی خۆیــان بەجێبێڵن چونکە ژینگەکەیان لەلایەن رژیمەوە وشــک کرا. هەموو عێراقیەکانی نەیاری ســەدام، بەشیعە، سوننە، کریســتیان، کورد، تورکمان و... سەرکوتکراون، ئەشکەنجە کراون و لەسێدارەدراون.

## خەڵکی هەڵەبجە هێشتا قوربانی ئاسەوارەکانی چەکی کیمیایین

### ئەنجومەنی پیران

### ١٤ی ئاداری ٢٠٠٦

سـناتۆر بیل فریست:[٣١٧] جەنابی سـەرۆکی ئەنجومەن، بە کورتی دەمەوێت لە بارەی بابەتێکی دیکە قسە بکەم کە پەیوەندی بە ساڵیادی رووداوێکەوە هەیە کە لە ١٦ی ئادار قەوماوە.

لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ واتا ١٨ سـاڵ لەمەوپێش سـەدام حوسەین یەکێ لە دڕندانەترین و بێ جیاوازترین هێرشەکانی دژی هاووڵاتیانی خۆی ئەنجامدا. لەو رۆژەدا ٨ فڕۆکەی عێراق بە چەکی کیمیایی هێرشیانکردە سەر شـارۆچکەی هەڵەبجە لە باکووری عێراق. بە وتەی فەرماندە (پشمەرگە) کوردەکان کە ئەو کاتە لە ناوچەیە بوونە، فڕۆکەکان پێش ئەوەی ئەرکە نگریسەکەیان تەواو بکەن چەند جار بە سەر ئاسمانی ناوچەدا جەولەیان کردووە. فڕۆکەکان بە ماوەی ٤٥ خولەک چەکی کیمیاییان بەکارهێناوە، لەوانە گازی موسـتارد و گازی دەمار. ١٥ خولەک پاش رۆیشـتنی ئەو فڕۆکانـە، گروپێک فڕۆکەی دیکە هاتـوون و درێژەیان بە بومبارانکردن داوە. ئەم فڕۆکانە هێرشەکانیان بۆ سەر شاری هەڵەبجە و ئەو رێگانەی کە بۆ دەرەوەی شار دەچوون، چڕ کردبووەوە.

من دەرفەتی ئەوەم بۆڕەخسا کە دوو ساڵ لەمەوپێش لەگەڵ کۆمەڵێک لە پزیشـکە کوردەکان دیدار بکەم. ئەم پزیشـکانە بە وردی باسی ئەو شـتانەیان بۆ کردم کە دوابەدوای هێرشـەکانی هەڵەبجە بینیبوویان و لەگەڵی رووبەڕوو ببوونەوە. گەلێ لە قوربانییەکان لە ناو گازی موستارد و گازی دەماریی شـلدا خویسـابوونەوە و ئەوانی دیکە هەڵمی گازیان هەڵمژیبوو. پزشـکە کوردەکان ئەو راسـتیەیان بۆم باسـکرد کە گازی مودسـتارد و دەمار بە شێوەی جیاجیا بەکارهاتووە بۆ ئەوەی هێزەکانی سـەدام حوسـەین بزانن کە کام لەم گازانە زۆرتر کوشندەیە و کامیان ئازاری زیاترە.

پاش کۆمەڵکوژییەکە سـەدام سـەربازەکانی بە جلی دژە کیمیایی نـاردووە بۆ هەڵەبجە بۆ ئەوەی بزانن کیمیایەکە چەندە کاریگەر بووە و کام گاز کاریگەری زیاتری لەسـەر خەڵک بووە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا دیسـان بەکاری بێننەوە. سەربازەکان شارەکەیان بەسەر چەند ناوچەدا دابـەش کردووە بۆ ئـەوەی بزانن چەند کەس لـەم خەڵکە بێ گوناحە کوژراون و لە کوێ کوژراون و چەند کەسـیان بریندار بووە. زیاتر لە ٥ هەزار کەس کوژران و و ١٠ هەزار کەسـی دیکەش بریندار بوون. دیتنی وێنەی ئەو لاشـە بێ گیانانە کە کەوتبونە سـەر یەک و ئەو دایکانە کە هێشـتا توند منداڵەکانیان لەباوەش گرتبوو ئەوەندە ترسناکە کە مرۆڤ لە خەو رادەچلەکێنێت.

ئێستا پاش ١٨ ساڵ خەڵکی هەڵەبجە هێشتا بەدەست ئاسەوارەکانی کیمیاییەوە دەناڵێنن. پزیشـکەکان باسـی کۆمەڵێک نەخۆشـی لە نێو خەڵکـی هەڵەبجەیان بۆ کردم وەک شـێرپەنجە، نوقسـانی زگماکی، لەبارچوونی منداڵ و بەدنیاهاتنی منداڵی مردوو.

مۆتەکەی کیمیاباران بۆ خەڵکی هەڵەبجە هێشتا کۆتایی پێنەهاتوە. هەڵەبجە تەنها شوێنێک نەبوو کە سەدام حوسەین چەکی کۆمەڵکوژی تێدا بەکارهێنا. سـەدام ئەم چەکە کۆمەڵکوژانەی بۆ کاولکردنی زنجیرەیەک شارۆچکە و گوندی کوردنشین بەکارهێنا. ئەم هێرشە نگریسانە بەشێک بـوو لـەو شـاڵاوەی کە یەک سـاڵی خایاند و بووە هـۆی مەرگ و بێسەروشوێنبوونی زیاتر لە ١٨٢ هەزار کوردی عێراق.

وەک نوێنەری شـاری تنیسی لە ئەنجومەنی پیران ئەم هێرشانە زۆر پەیوەنـدی بە منەوە هەیە، چونکە گەلـێ لەکوردەکان کۆچیان کردووە بۆ تنیسـی، بەتایبەت ناوچەی ناوەڕاسـتی تنیسی. گەلێ لە کوردەکان لە شـاری نەشـویل(٣١٨) دەژین. لەراسـتیدا کاتی خۆی رۆژێک کە لە فڕۆکەخانەی نەشویل بووم، ٢٠ یان ٣٠ کورد لێم نزیک بوونەوە و پیانوتم سوپاسـی ویلایەتە یەکگرتوەکان دەکەن کە وەک پەنابەر وەریگرتوون و

بەتايبەت سوپاسـى ويلايەتى تنيسى دەكەن كە بەم باشيە وەريگرتوون و دەتوانن بە ئازادى و خۆشـبەختى بژين. هەندێ لەو خەڵكەى كە من ئێسـتا نوێنەريانم دۆسـت و كەسـوكاريان هەيە كە بە دەستى سەدام حوسـەين سەركوتكراون، كوژراون و ئەشكەنجە كراون. سەدام حوسەين بە ماوەى دەيان ساڵ كوردەكانى عێراقى سەركووت كرد.

لـە دەيـەى ١٩٩٠دا ويلايەتـە يەكگرتووەكانى ئەمريـكا يارمەتى كوردەكانـى عێراقى دا بگـەن بە جۆرێك ئۆتونومى. پارسـاڵ ئێمە يارمەتـى كوردەكانمان دا بگەن بە مافى دەنگدان بۆ ياسـاى بنەڕەتى عێراق و دەوڵەتى نوێيى عێراق. كوردەكانى باكوورى عێراق چەندان ساڵ باش ئاگايان لەو شـتە بوو كە ئەمريكييەكان بە هێواشى پەيان پێبرد. سەدام حوسـەين و چەكە كيمياييەكانى نەتەنها مەترسى بوو بۆ خەڵكى عێراق بەڵكوو بۆ ناوچە، دۆست و هاوپەيمانەكانيشمان مەترسى بوو.

سەدام حوسەين و دارودەستەكەى ئێستا لە پشتى تولەكانى زيندانەوە دادگايى بكرێـن. بەپێچەوانەى قوربانييەكانى رژێمەكەى، سـەدام و دارودەسـتەكەى دەرفەتى ئەوەيان پێدراوە داكۆكى لە خۆيان بكەن. خەڵكى عێراق خوازيارى دادپەروەرين و ئازايانە سيسـتمێكى نوێ لەسـەر بنەماى سـەروەرى ياسا و ئازادى دادەمەزرێنن. خەڵكى عێراق رێگايەكى سـەخت و دژواريان بڕيوە بەڵام زۆر كار دەكەن بۆ ئەوەى ناكۆكييەكە سياسـيەكانيان چارەسەر بكەن و دەوڵەتيكى يەكێتى نيشتمانى دابمەزرێنن.

ساڵى ٢٠٠٥ ساڵى پێشـكەوتن بوو، خەڵكى عێراق سێ هەڵبژاردنى نيشـتمانييان بەڕێوەبرد، ياساى هەميشـەيى عێراقيان پەسەند كرد و بەهەزاران لاوى عێراق بە پەيوەستبوون بە ريزەكانى هێزەكانى ئاسايشى عێـراق، بوێرييەكى گەورەيان لە خۆيان نيشـاندا بـۆ ئەوەى رووبەڕووى دياردەى قێزەونى تيرۆريزمى توندوتيژانە ببنەوە. هێرش بۆ سەر مزگەوتى زێڕيـن[٣١٩] كە چەند حەوتوو لەمەوپێش روويـدا هەوڵێكى بيبەزەيانە و

ناجوامێرانه بوو بۆ هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ لە عێراق. ڕێبەرە سیاسی، ئایینی و ئیتنیکیەکانی عێراق دەبێ پێکەوە کار بکەن بۆ ئەوەی پێش لە تەشەنەکردنی توندوتیژی بگرن. ئەوان دەزان کە هەموو هاوولاتییەکی عێراقی دەبێ پێگەی خۆی لە نێو دیموکراسی نوێ عێراقدا ببینێتەوە و عێراقێکی ئازدی دیموکرات و خۆشبژێو بە قازانجی هەموو عێراقییەکە.

ئەرکی ئێستای ڕێبەرانی عێراق ئەوەیە کە بە خێرایی دەوڵەتی یەکێتی نیشتمانی پێکبێنن بۆ ئەوەی ڕێبەرانی خەڵکی جۆراوجۆری عێراق دەرفەتی ئەوەیان بۆ برەخسێت بە شێوەی ئاشتیخوازانە بەرژەوەندی خەڵکەکەیان دابین بکەن. من دڵنیام کە خەڵکی عێراق کار دەکەن بۆ ئەوەی سەرجەم گروپە ئەتنیکی و ئایینیەکانی عێراق بکەونە ناو ئەم ڕەوتە دیموکراتیکە لەراستیدا خەڵکی عێراق جگە لەوە هیچ ڕێگاچارەیەکی دیکەیان نیە

ڕێبەرانی سیاسی عێراق دەبێ پێکەوە کۆ ببنەوە و درێژە بە کارکردن لەپێناو یەکێتی نیشتمانیدا بدەن بۆ ئەوەی خەڵکی عێراق بتوانن لەو ئازادیەدا بژین کە شایانینی و کارەساتگەلێک وەک هەڵەبجە ببێت بە بەشێک لە مێژوو. شەڕی عێراق کۆتایی پێنەهاتووە. هەموو ڕۆژێک تاوانبارە دلڕەقەکان هەوڵ دەدەن ئەو پێشکەوتنانە لەبار ببەن کە هاتووەتەدی بەڵام سەرکەوتوو نابن. عێراق کەوتووەتە سەر ڕێگایەکی مێژوویی.

لەم هەفتەیەدا کە چاو بە رابردوودا دەخشێنینەوە چاومان لە داهاتووشە. بە بوێری و شێلگیری بەردەوامی خەڵکی عێراق، عێراق دەبێت بە مەشخەڵی ئازادی و خۆشبەختی لە دڵی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

ئەبوو عەلی، حەسەن عەلی ئەلعامری بێت. وەرگێڕ

143-TEL AFAR
144-HARRISON
145-Redman
146-Burleigh

١٤٧- مەبەســـتی گەڵاڵە یاسای ٥٣٣٧ی ئەنجومەنی نوێنەرانە کە بۆ سەپاندنی ئابلۆقەی ئابووری بەسەر عێراقدا پەسەند کرا. وەرگێڕ

١٤٨- مەبەستی کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانە. وەرگێڕ

١٤٩- Federal Aviation Administration ، FAA) بە ئیدارەی فرۆکەوانی فدراڵی ئەمریکا دەوترێت. وەرگێڕ.

150-James P. Rubin
151-JAMES P. RUBIN
152-Richard Boucher
153-from Bosnia, to Rwanda and Kosovo

١٥٤- ئیلی وەیسەل(Elie Wiesel) نووسەر و چالاکێکی سیاسی جولەکەی ئەمریکایە کە خەڵاتی نۆبیلی ئەدەبیاتی ســـاڵی ١٩٨٦ی پێبەخشراوە. وەیسەل بەردەوام داکۆکی لە مافی کەمینەکان(بە تایبەت کورد ) لە بەرامبەر دەوڵەتە سەرکوتکارەکان کردووە و یەکێ لەو کەســـایەتییە کاریگەرانە بوو کە ئیدارەی بۆشـــی تەشویق کرد رژێمی سەدام بڕوخێنێت. وەرگێڕ

١٥٥- تام لانتۆس لە ســـاڵی ١٩٨١ تا کاتی مردنی لە شـــوباتی ٢٠٠٨ نوێنەری باکووری ســـان ماتێۆ و باشـــووری رۆژهەڵاتی سان فرانسیســـکۆ بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە ســـەر لیســـتی پارتی دیموکرات. لانتۆس دۆستی کورد بوو و یەکەمیـــن کەس بوو کە کیمیابارانی هەڵەبجەی لـــە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا خستەڕوو. وەرگێڕ

١٥٦- ئاماژە بەوەیە کە لە شـــاری جانستۆنی ئەمریکا، لە ١٨ی تشرینی ١٩٧٨ بـــە هاندانی جەیمز جۆنـــز نزیکەی ٩١٣ کەس بە خواردنی حەبی ســـیانید خۆیان بە شێوەی بەکۆمەڵ لە ناو کنیسەیەکدا کوشت. ٢٠٠ کەس لە قوربانیەکان منداڵ بوون و یەکێکـــی دیکەیان لینۆ رایان، ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا بوو. جەیمز جۆنز تەریقەتێکی ئایینی تایبەتی لەو شـــارە دامەزراندبوو و کۆمەڵێکی زۆر خەڵکی بە دەوری خۆیدا کۆ کردبووەوە. رووداوەکەی جانیســـتۆن گەورەترین رووداوی خوکوژی جیهان بوو. وەرگێڕ

١٥٧- چێســـتێر ئەتکینـــز لە ١٩٨٥ تـــا ١٩٩٣ نوێنەری ماساچۆســـێت بوو لە

ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. ئەتکینز هەروەها لە ١٩٧٧ تا ١٩٩١ سەرۆکی پارتی دیموکرات لە هەرێمی ماساچۆسێت بوو. وەرگێڕ

١٥٨- ئاماژە بەو چوار ئەسـب سـوارەیە کە لە کتێبی «موکاشفاتی یوحنا»ی ئینجیلـدا ئاماژەی پێکـراوە کە بریتین لە شـەڕ، تاعون، قاتوقـڕی و دنیاگیری. مەبەستی ئەتکینز لێرە ئەوەیە کە شاری هەڵەبجە هەموو ئەو چوار کارەساتەی پێکەوە بەسەرهاتووە. وەرگێڕ

١٥٩- جان ئیدوارد پۆرتێر لە ١٩٨٠ تا ٢٠٠١ نوێنەری ئیلۆنۆیز بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سـەر لیسـتی پارتی کۆماری. پۆرتێر یەکێ لە دۆستە هەرە نزیکەکانـی کورد بوو و یەکێ لەو ئەندامانـە چالاکانەی ئەنجومەنی نوێنەران بوو کـە بەردەوام بارودۆخی نالەباری کوردی عێـراق و تورکیەی لە ئەنجومەنی نوێنەران دەخستەڕوو. ڕێکخراوی تۆڕی زانیاری کورد لە ئەمریکا یەکەمین خەڵاتی ئەحمەدی خانی لە ساڵی ٢٠٠٠ بەخشیوە بە جان ئیدوارد پۆرتێر. ناوبراو یەکەم جار لە ڕێگای ژنەکەیەوە، کاترین ئیدوارد پۆرتێر بە کێشـەی کورد ئاشـنا بوو. کاترین یەکێ لە دۆستە چالاکەکانی نەتەوەی کوردە کە بەردەوام هەوڵیداوە کێشەی کورد لە ڕوانگەی مافـی مرۆڤەوە لە ئەمریکا و بەتایبەت کۆنگرێسـی ئەمریکا زەق بکاتەوە. کاترین پۆرتێر ئێستا سەرۆکی ئەنجومەنی مافی مرۆڤ، ڕاوێژکاری کاروباری مافی مرۆڤی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا و هاوکات ڕاوێژکاری کاروباری سوریە، ئێران و عێراق لە نووسینگەی سناتۆر مارک کیرکە. وەرگێڕ

١٦٠- ئاماژە بەوەیە کە لە ١٧ی گوڵانی ١٩٨٧ فرۆکەیەکی عێراق هێرشیکردە سـەر گەورە کەشـتی سـەربازی USS Stark (FFG-٣١)ی ئەمریکا لە کەنداو و لە ئەنجامدا ٣٧ سـەربازی ئەمریکا کوژران و ٢١ سـەربازی دیکەش بریندداربوون. کاربەدەستانی عێراق داوای لێبوردنیان لە ئەمریکا کرد و ڕایانگەیاند ئەو هێرشە بەهەڵە ئەنجامدراوە و فرۆکەوانە عێراقیەکە وایزانیوە کە ئەوە کەشتی ئێرانە. وەرگێڕ

161-James A. Baker

١٦٢- جیم باتز (JIM BATES) ساڵی ١٩٨٣ تا ١٩٩١ نوێنەری هەرێمی ٤٤ی کالیفۆرنیا بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سـەر لیسـتی پارتی دیموکرات. جیم باتز یەکەم ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران بوو کە مەسەلەی ڕاگواستنەوەی کوردی خستە بەردەم وەزیری دەرەوەی ئەمریکا . وەرگێڕ

١٦٣- جۆرج جان میشـیل لە ساڵی ١٩٨٠ تا ١٩٩٥ نوێنەری ناوچەی ماین بوو لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە سـەر لیستی پارتی دیموکرات. میشیل لە ١٩٩٥

تـــا ۲۰۰۱ نوێنەری تایبەتی ئەمریکا بوو بۆ گفتوگانی ئاشـــتی ئیرلەندی باکوور و لـــە ۲۰۰۹ تا ۲۰۱۱ نوێنەری تایبەتی باراک ئوباما بووە بۆ گفتوگۆکانی ئاشـــتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. وەرگێڕ

١٦٤- سناتۆر مارک هاڤتفیڵد لە ١٩٦٧ تا ١٩٩٧ نوێنەری ناوچەی ئوریگۆن بوو لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە ســـەر لیستی پارتی کۆماری و لە ١٩٥٩ تا ١٩٦٧ پارێزگاری ئوریگۆن بوو. سناتۆر هاڤتفیڵد ساڵی ٢٠١١ کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

١٦٥- مەبەســـتی ململانێکانی ئەندامانی هەر دوو حیزبی کۆماری و دیموکراتە لە ئەنجومەنی پیراندا. وەرگێڕ

١٦٦- مەبەســـتی ئەوەیە کە لە کاتی شەڕی ئێران و عێراقدا، سەربازانی ئێرانی، بەتایبەت بەســـیجییە مێرمنداڵەکان خۆیان دەخستەناو مەیدانی مینی عێراق بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ پێشـــڕەوی هێزەکانی ئێران بکەنەوە. ســـەربازەکانی ئێران لە ژێر کاریگەری پرۆپاگەندای گەیشتن بە کەربەلا و قودس ئەو فیداکاریانە دەکرد. وەرگێڕ

١٦٧- کلایبۆرن دۆبۆرد پێڵ یەکێ کە ســـناتۆرە ناســـراو و دەستڕۆیشتووەکانی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا و یەکێ لە کەســـایەتیە هـــەرە کاریگەرەکانی مێژووی ئەمریکا و دۆســـتی کورد بوو. پێل شـــەش خولی یەک لە دوای یەک لە ١٩٦١ تا ١٩٩٧ نوێنەری ڕۆد ئیســـلەند بوو لە ســـەر لیســـتی پارتی دیموکرات لە ئەنجومەنی پیران و لە ١٩٧٨ تا ١٩٨١ ســـەرۆکی کۆمیتەی یاســـاکان و ئیدارە و لە ١٩٨٧ تا ١٩٩٥ سەرۆکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران بوو. پێل یەکەم ســـناتۆر بوو کە هەوڵیدا لە ڕێگای بڕیارنامـــەوە پەیوەندیە بازرگانیەکانی ئەمریکا و عێراق ســـنووردار بکات بە هۆی کیمیابارانکردنی کوردەکان. هەروەها سناتۆر پێل بوو کە کارناســـانی بۆ پیتێر گالبرێس کرد بۆ ئەوەی سەردانی ئاوارە کوردەکانی بادینان بکات کە ڕوویان لە کوردســـتانی تورکیە کردبوو. سناتۆر پێڵ ساڵی ٢٠٠٩ کۆچی دواییکرد. وەرگێڕ

١٦٨- دۆناڵـــد پیێس ٨ خولی یەک لە دوای یەک لە ١٩٦٩ تا ١٩٩٣ نوێنەری هەرێمی ١٣ی ئوهایۆ بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە ســـەر لیســـتی پارتی دیموکرات. کۆنگرێسمەن پیێس ساڵی ٢٠٠٢ کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

169-mustard phosgens and chlorine gas

170-IKE SKELTON

١٧١- کریســـتۆفیر ســـامۆئیل کیت بۆند لە ١٩٨٧ تا ٢٠١١ نوێنەری هەرێمی میســـوری بووە لە ئەنجومەنی پیران لە سەر لیســـتی پارتی کۆماری و لە ١٩٧٣ تا ١٩٧٧ و لە ١٩٨١ تا ١٩٨٥ پارێزگاری میسۆری بووە. وەرگێڕ

١٧٢- ئیدی ئەمین دادا(Idi Amin Dada) فەرماندەیەکی سەربازی بوو کە دوای کودتایەکی سەربازی لە ساڵی ١٩٧١ بوو بە سەرۆک کۆماری ئوگاندا و لە ساڵانی سەرۆک کۆماری ناوبراودا(١٩٧١ تا ١٩٧٩) نزیکەی ٢٥٠ هەزار کەس لەو وڵاتە گیانیان لە دەستدا. ئیدی ئەمین ئابی ٢٠٠٣ لە عەرەبستانی سعودی مرد. وەرگێڕ

١٧٣- پۆلپۆت(Pol Pot) رێبەری کۆمونیست-مائۆئیستی خمرە سورەکانی وڵاتی کامبۆج بوو کە ساڵی ١٩٧٦ تا ١٩٧٩ سەرۆک وەزیرانی کامبۆجی دیموکراتیک بوو و لە ئەنجامی سیاسەتە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانیدا نزیکەی دوو ملیۆن و نیو کەس واتا ٢١٪ی خەڵکی کامبۆج گیانیان لە دەستدا. لە ١٥ی نیسانی ١٩٩٨ خمرە سورەکان رایانگەیاند پۆلپۆت رادەستی دادگایەکی نێونەتەوەیی دەکەن، بەڵام رۆژی دواتر پۆلپۆت مرد و دەنگۆی ئەوە بڵاو بوەوە کە خۆی کوشتووە. وەرگێڕ

174-Jim Hoagland

175-William Safire

176-Balisan, Heeron and Simaqooli

177-Arai, Sero and Zarwa

178-Sheikhwassan

١٧٩- سناتۆر ئیدوارد ویلیام پرۆکسمایێر لە ساڵی ١٩٦٧ تا ١٩٨٩ نوێنەری ناوچەی ویسکۆنسێن بوو لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. پرۆکسمایێر هەر لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولەوە دۆستی کورد بوو و چەند جار مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە شۆڕشی ئەیلوولی لە ئەنجومەنی پیران خستەڕوو و لە ئەمریکاش لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی دیداری کرد. سناتۆر پرۆکسمایێر ساڵی ٢٠٠٥ کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

180-Rhode Island

١٨١- مەبەستی هەوڵەکان بۆ کۆتاییپێهاتنی شەڕی ئێران و عێراقە. وەرگێڕ

١٨٢- جۆزێف ئالیکساندێر هێلمز پێنج خولی یەک لە دوای یەک لە ١٩٧٣ تا ٢٠٠٣ نوێنەری کارۆلینای باکوور بوو لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی کۆماری. هێلمز یەکێ لە سناتۆرە هەرە دەستڕۆیشتووەکانی ئەمریکا بوو و لە ١٩٨١ تا ١٩٨٧ سەرۆکی کۆمیتەی کشتوکاڵ و لە ١٩٩٥ تا ٢٠٠١ سەرۆکی کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران بوو. سناتۆر هێلمز ساڵی ٢٠٠٨ کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

183-church Dot

184-Baptist

185-Alexandria
186-Caryle Murphy

١٨٧- بینجامین ئارتور گیلمان لە ١٩٧٣ تا ٢٠٠٣ لە سەر لیستی پارتی کۆماری، نوێنەری نیۆیۆرک بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا. گیلمان لە ١٩٩٥ تا ٢٠٠١ سەرۆکی کۆمیتەی پەیوەندییە نێونەتەوەیەکانی ئەنجومەنی نوێنەران و یەکێک لە ئەندامە چالاک و دەسترۆیشتووەکانی ئەنجومەنی نوێنەران بوو. وەرگێڕ

١٨٨- سناتۆر جان سیدنی مەککەین لە ساڵی ١٩٨٧ تا ئێستا نوێنەری ئاریزۆنایە لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی کۆماری. مەککەین لە ١٩٨٣ تا ١٩٨٧ نوێنەری ئاریزۆنا بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران و لە ١٩٩٧ تا ٢٠٠١ سەرۆکی کۆمیتەی بازرگانی، زانست و گوازتنەوەی ئەنجومەنی پیران بوو. مەککەین لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ساڵی ٢٠٠٨ لەلایەن کۆمارییەکانەوە کاندید کرا بەڵام لە بەرامبەر باراک ئۆبامادا شکستیهێنا. مەککەین ئاشنای بارودۆخی کوردە و بەتایبەت لە کاتی شەڕی ناوخۆدا ئەو مەسەلەیەی لە ئەنجومەنی نوێنەراندا خستەڕوو. مەکەین وەک قارەمانێکی نیشتمانی لە ئەمریکا سەیر دەکرێت چونکە لە کاتی شەڕی ڤیەتنام لە ١٩٦٧ فڕۆکەکەی تەقەی لێکرا و کەوتە خوارەوە و خۆیشی بە برینداری لە لایەن ڤیەتکۆنگەکانەوە بەدیل گیرا و ئەشکەنجە کرا و سەرەنجام ساڵی ١٩٧٣ ئازاد کرا. وەرگێڕ

١٨٩- مەبەستی لە کامبۆج، کۆمەڵکوژییەکەی پۆلپۆتە کە پێشتر باس کرا. مەبەستی لە ئەهامەتییەکانی خەڵکی لوبنان ئەوەیە کە خەڵک بوونەتە قوربانی کێشەی ئیسرائیل و فەلەستین و شەڕی نێوان حیزبوڵلای لوبنان و بزووتنەوەی حەماس لەگەڵ ئیسرائیل. مەبەستی لە کردەوە دڵڕەقانەکانی بروندی ئەوەیە کە دوابەدوای کودتای سەربازی پییێر بۆیۆڤا لە وڵاتی بروندی لە ١٩٨٧ و سیاسەتە سیاسیەکانی ناوبرا، ناکۆکیەکانی نێوان دوو عەشیرەتی توتسی (کە کەمینەی دەسەڵاتدار بوون) و عەشیرەتی هۆتۆ (کە زۆرینە بوون) پەرەیسەند و پێکدادانی خوێناویی ئەو دوو عەشیرەتەی لێکەوتەوە کە لە ئەنجامدا نزیکەی ١٥٠ هەزار کەس کوژران و دەیان هەزار کەس ئاوارە بوون. ناکۆکیەکانی ئەو دوو عەشیرەتە دیسان لە ١٩٩٣ بە هۆی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی ئەو وڵاتە سەریهەڵدایەوە و قۆناخی شەڕی ناوخۆی بروندی دەستپێکرد کە تا ساڵی ٢٠٠٥ بەردەوام بوو. لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆی بروندی نزیکەی ٣٠٠ هەزار کەس گیانیان لەدەستدا. وەرگێڕ

١٩٠- لە هەشتاکان کورد شەڕی ناوخۆی نەکردووە، قەت کردەوەی تیرۆریستی

ئەنجامنەداوە و هیچ خەڵکێکی سڤیلی دیکەشی نەکوشتووە. وادیارە زانیاری هەڵە بە جان مەککەین دراوە. وەرگێڕ

١٩١- ئاماژە بەوەیە کە لە کۆتایی شەڕی ئێران و عێراق نزیکەی ٣ هەزار کەس لە زیندانیانی سیاسی لە ئاب و ئەیلوولی ١٩٨٨ لە بەندیخانەکانی ئێران لەسێدارەدران. ئەو زیندانیانە سەر بە سەرجەم گروپ و حیزبە سیاسیەکانی نەیاری کۆماری ئیسلامی (بە کوردیشـــەوە) بوون، بەڵام زۆربەیان سەر بە رێکخراوی موجاهدینی خەلقی ئێران بوون. تەرمی ژمارەیەکی زۆر لەو زندانیانە بە شـــێوەی بەکۆمەڵ لە گۆڕستانی خاوەران لە رۆژهەڵاتی تاران کران بە ژێر خاکەوە. وەرگێڕ

١٩٢- ئامـــاژە بەوەیـــە کە لە کاتـــی جەنگی جیهانی دووەم لە میانەی شـــەڕی ژاپۆن و چین لە کۆتایی ســـاڵی ١٩٤٣ ژاپۆن چەکی کیمیایی دژی خەڵکی شاری چانگدای چین بەکارهێنا و لە ئەنجامدا نزیکەی ٣٠٠ هەزار کەس گیانیان لە دەستدا. لە کاتـــی جەنگی دووەمی جیهانیدا ژاپۆن چەند جـــار چەکی کیمیایی دژی چین بەکارهێنا. وەرگێڕ

١٩٣- لە میانەی داگیرکرانی وڵاتی ئیتیۆپی لەلایەن ئیتالیاوە لە ١٩٣٥ هێزەکانی ئیتالیا بە فەرمانی موسولینی بە فڕۆکە مەزرا و ناوچە کشتوکاڵیەکانی ئەو وڵاتەیان کیمیاباران کرد و لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک گیانیان لەدەستدا و بەشێک لەو وڵاتە توشی وشکەساڵی بوو. وەرگێڕ

١٩٤- لە میانەی شـــەڕی ناوخۆی ئیسپانیا لە ٢٦ی نیسانی ١٩٣٧ فڕۆکەکانی ئاڵمانیا و ئیتالیا هێرشیان کردەسەر شاری گویرنیکای ئیسپانیا و لە ئەنجامدا نزیکەی هەزار کەس لە دانیشتوانی ئەو شارە کوژران. وەرگێڕ

١٩٥- ئاماژە بەوەیە کە دوابەدوای واژۆبوونی پەیمانامەی مونیخ لە ١٩٣٨، نیڤیل چیمبیرلین، ســـەرۆک وەزیرانی بریتانیا بەوە رازی بوو کە چکسلۆڤاکی ببخشرێت بە ئاڵمانیای بن رێبەرایەتی هیتلەر. وەرگێڕ

١٩٦- ئالبێرت ئارنۆڵد گۆر ساڵی ١٩٨٥ تا ١٩٩ نوێنەری تنێسی بوو لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. لە ساڵی ١٩٧٧ تا ١٩٨٥ نوێنەری تنیســـی بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران و لە ١٩٩٣ تا ٢٠٠١ جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکا بوو. ئال گۆر لە هەڵبژارنەکانی ســـەرۆک کۆماری ساڵی ٢٠٠٠ لە لایەن دیموکراتەکانەوە کاندید کرا بەڵام هەڵبژارنەکەی بە جۆرج بوش دۆڕاند. وەرگێڕ

١٩٧- بزووتنـــەوەی بێلایەن (nonaligned movement) لە ســـاڵی ١٩٦١ بە ئامانجی یەکگرتنی ئەو وڵاتانەی کە سەر بە هیچکام لە بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا

نەبوون دامەزرا و یەکەم کۆنفرانســـی لە شـــاری بلگراد لە یوگسلافی بەڕێوەچوو. ئەو بزووتنەوەیە زیاتر بەرەولای دژایەتیکردنی ئەمریکا دەشـــکایەوە و چالاکیەکانی پاش رووخانی بلۆکی رۆژهەلات لە ١٩٩٠ رووی لە کزی کرد. ئێستا ١١٨ وڵات ئەندامی ئەو بزووتنەوەیەن. وەرگێڕ

١٩٨- مەبەستی هەر دوو حیزبی کۆماری و دیموکراتی ئەمریکایە. وەرگێڕ

١٩٩- پاڵێوراوەکانی هەڵبژاردنی سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە ١٩٨٨ بریتیبوون لە جۆرج بوشی باوک (سەر بە حیزبی کۆماری) و مایکێل دۆکاکیس(سەر بە حیزبی دیموکرات) و سەرەنجام جۆرج بوش هەڵبژاردنەکەی بردەوە. وەرگێڕ

٢٠٠- ســـتینی هامیلتۆن هۆیێر لە سالی ١٩٨١ تا ئێستا نوێنەری هەرێمی ٥ی مریلەندە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. هۆیێر لە ٢٠٠٧ تا ٢٠١١ ئەندامی لیژنەی ســـەرۆکایەتی زۆرینەی ئەنجومەنی نوێنەران بوو و لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٥ ســـەرۆکی کۆمیتەی کاروباری ولاتانی ناوچەی قەفقاز بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران. وەرگێڕ

٢٠١- دانت فاســـێل لە ١٩٥٥ تا ١٩٩٣ نوێنەری هەرێمی ٤، ١٢ و ١٥ی فلۆریدا بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە ســـەر لیســـتی پارتی دیموکرات و لە ١٩٨٤ تا ١٩٩٣ ســـەرۆکی کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجومەنی نوێنەران بوو. فاســـێل لە ٢٩ی تشـــرینی یەکەمی ١٩٩٨ میدالیای ئازادی سەرۆک کۆماری ئەمریکای لەلایەن بیل کلینتۆنەوە پێبەخشـــرا و لە ٢٨ی تشـــرینی دووەمی ١٩٩٨ کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

٢٠١- دینیز ویبیســـتێر دیکۆنسینی لە ســـالی ١٩٧٧ تا ١٩٩٥ نوێنەری ئاریزۆنا بوو لە ئەنجومەنی پیران لە ســـەر لیستی پارتی دیموکرات. سناتۆر دیکۆنسینی لە ١٩٨٨ تا ١٩٩٣ ســـەرۆکی کۆمیسیۆنی هلیسینکی و لە ١٩٩٣ تا ١٩٩٥ سەرۆکی کۆمیتەی هەوالگری ئەنجومەنی پیران بوو. لە ١٧ی گولانی ١٩٩٣ کومیســـیۆنی هلیســـینکی بە سەرۆکایەتی دیکۆنسینی، دۆکتۆر بەرهەم سالح، دۆکتۆر نەجمەدین کەریـــم، ئەحمەد تورک و لەیلا زانای بانگهێشـــتی کۆنگرێس کرد بۆ تاوتوێکردنی بارودۆخی کورد لە عێراق و تورکیە. ســـناتۆر دیکۆنســـینی یەکێ لەو سناتۆرانە بوو کە دەوڵەتی تورکیە بانگەشـــەی ئەوەی دەکرد لەگەڵ ئامانجی کوردەکان هاوخەمە و لەگەڵ پ ک ک پەیوەندی هەیە. وەرگێڕ

٢٠٢- فرانک رالێ لوتێنبێرگ سالی ١٩٨٢ تا ٢٠٠١ نوێنەری نیوجێرسی بوو لە ئەنجومەنی پیران لە سەر لیستی پارتی دیموکرات و دیسان لە ٢٠٠٣ هەڵبژێردرایەوە و

ئێستا بەتەمەنترنین ئەندامی ئەنجومەنی پیرانە. وەرگێڕ

٢٠٣- کام هەل و ئازادی؟ ئەو کاتە ئەنانەت ٢٠ ملیۆن کوردی هاووڵاتی خودی تورکیە لە سەرجەم مافەکانیان بێبەش کرابوون و لە رووی کولتووری، ئابووری و سیاسییەوە بە توندترین شێوە سەرکوت دەکران. وەرگێڕ

٢٠٤- رۆبێرت جۆزیف دۆل ساڵی ١٩٦١ تا ١٩٦٩ نوێنەری کانزاس بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران و لە ١٩٦٩ تا ١٩٩٦ نوێنەری کانزاس بوو لە ئەنجومەنی پیران لەسەر لیستی پارتی کۆماری . لە ١٩٨٧ تا ١٩٩٥ رێبەری کەمینەی ئەنجومەنی پیران و لە لە ١٩٩٥ تا ١٩٩٦ رێبەری زۆرینەی کۆماریخوازەکانی ئەنجومەنی پیران بوو. لە ١٩٧١ تا ١٩٧٣ سەرۆکی کۆمیتەی کۆماریخوازەکان و لە ١٩٨١ تا ١٩٨٥ سەرۆکی کۆمیتەی ئابووری ئەنجومەنی پیران بوو. جۆزیف دۆل لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە ١٩٩٦ کاندیدی پارتی کۆماری بوو بەڵام هەڵبژاردنەکەی بە بیل کلینتۆن دۆڕاند. وەرگێڕ

٢٠٥- بەرنامەی ٦٠ خولەک(program 60 Minutes) بەرنامەیەکی سەرکەوتووی کاناڵی CBSی ئەمریکایە کە لە ساڵی ١٩٦٨ تا ئێستا بڵاو دەکرێتەوە و یەکێ لە پربینەرترین بەرنامە تەلەفزیۆنیەکانە لە سەراسەری ئەمریکادا. وەرگێڕ

٢٠٦- کوردستان لە سەردەمی سەدامدا راپۆرتێکی تێروتەسەلی ٤٩ لاپەڕەیی بوو کە ستافی ئەنجومەنی پیران لە لە تشرینی دووەمی ١٩٩١ بۆ کۆمیتەی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیرانی ئامادە کرد. لەو راپۆرتەدا سەرجەم کردەوەکانی سەدام دژی کورد لەوانە کیمیاباران، کاولکردنی گوندەکان و راگوازتنەوەی خەڵک باس کرابوو. ئەوە یەکەمجار بوو کە کۆنگرێسی ئەمریکا راپۆرتی لە بارەی کردەوەکانی سەدام حوسەین دژی خەڵکی کوردستان ئامادە دەکرد. وەرگێڕ

٢٠٧- شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش دوابەدوای کۆڕەوی خەڵکی کوردستان و پەسەندکرانی بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان لە ٥ی نیسانی ١٩٩١ دەستیپێکرد و لە دوو شاڵاو پێکهاتبوو: شاڵاوی یەکەم لە ٦ی نیسانی ١٩٩١ دەستیپێکرد بە ئامانجی پاراستنی هەرێمی کوردنشین(جگە لە کەرکووک) لە هێرشی فڕۆکەکانی عێراق. شاڵاوی دووەم لە ٢٤ی تەموزی ١٩٩١ دەستیپێکرد و لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٩١ کۆتاییپێهات و ئەرکی تەنها گەیاندنی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بە ئاوارە کوردەکان بوو. پاش کۆتاییپێهاتنی شاڵاوی دابینکردنی ئاسایش، هێزە هاوپەیمانەکان بە سەرکردایەتی ئەمریکا لە بنکەی ئینجیرلیکی تورکیاوە درێژەیان بە پاراستنی هەرێمی دژەفڕینی کوردستان دا تا کاتی رووخانی

ڕژێمی سەدام لە ئاداری ٢٠٠٣. وەرگێڕ

٢٠٨- مەبەستی عومەری خاوەرە کە لە بەر دەرگای ماڵەکەیدا لە کاتی کیمیابارانەکەدا گیانی لەدەستدا. وەرگێڕ

٢٠٩- لە میانەی شەڕی بۆسنیا، سوپای کۆماری سیرپسکای سربەکان بە فەرماندەیی ژنێراڵ راتکۆ میلادیک لە تەموزی ١٩٩٥ لە دەوروبەری شاری سربرینیکای بۆسنیا نزیکەی ٨هەزار کەس لە دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی (کە زیاتر پیاو و لاو بوون) کوشت. سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان ئەو کۆمەڵکوژیەی بە توندترین تاوان دژی مرۆڤایەتی لە ئورووپا پاش جەنگی دووەمی جیهانی لەقەڵەمدا. وەرگێڕ

210-Herbert Claiborne Pell

٢١١- خاتون دیان گۆڵدمەن بیرمان فینیستێن لە ساڵی ١٩٩٢ تا ئێستا نوێنەری کالیفۆرنیایە لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. فینیستێن لە ١٩٧٨ تا ١٩٨٨ شارەداری سانفرانسیسکۆ بوو، لە ساڵی ٢٠٠٩ تا ئێستا سەرۆکی کۆمیتەی هەڵبژێردراوی هەواڵگری ئەنجومەنی پیرانە و لە ٢٠٠٧ تا ٢٠٠٩ سەرۆکی کۆمیتەی یاساکان و ئیدارەی ئەنجومەنی پیران بووە. وەرگێڕ

٢١٢- جەیمز پاتریک مۆران لە ساڵی ١٩٩١ تا ئێستا نوێنەری هەرێمی ٨ی ڤیرجینیایە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لەسەر لیستی پارتی دیموکرات. مۆران لە ١٩٨٥ تا ١٩٩٠ سەرۆکی شارەوانی ئەلیکساندیریا ڤیرجینیا بووە. وەرگێڕ

٢١٣- کریستۆفیر هینری ئێسمیت لە ساڵی ١٩٨١ تا ئێستا نوێنەری هەرێمی ٤ی نیوجێرسییە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. کۆنگرێسمەن ئێسمیت یەکێ لەو ئەندامانەی ئەنجومەنی نوێنەرانە کە بەردەوام داکۆکی لە مافی گەلی کورد، بەتایبەت کوردی تورکیە کردووە. وەرگێڕ

٢١٤- ئاڵسی لامار هاستینگز لە ساڵی ١٩٩٣ تا ئێستا نوێنەری هەرێمی ٢٣ی فلۆریدایە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکادا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. وەرگێڕ

٢١٥- راستە عێراق خۆی ئەو چەکانەی بەرهەمهێنابوو، بەڵام مەوادی کیمیایی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن کۆمپانیا ئەمریکایی و ئاڵمانیەکانەوە دەفرۆشرا بە عێراق. وەرگێڕ

٢١٦- نیوتۆن گینگریچ سیاسەتمەدار و نووسەرێکی بەناوبانگی ئەمریکایە. ساڵی ١٩٧٩ تا ساڵی ١٩٩٩ نوێنەری هەرێمی ٦ی جۆرجیا بووە لە ئەنجومەنی

نوێنەرانی ئەمریکا لەسـەر پارتی کۆماری. لە ١٩٩٥ تا ١٩٩٩ سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەرانـی ئەمریکا بووە و لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٥ سـەرۆکی فراکسـیۆنی کەمینەی ئەنجومەنـی نوێنەران بووە. گینگریچ یەکێ لەو کەسـانە بـوو کە پارتی کۆماری دەیەویست بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ٢٠١٢ کاندیدی بکات. وەرگێڕ

217-Christine Gosden

٢١٨- گەوین رۆبێرتز سـاڵی ٢٠٠٦یش فیلمێکی بە ناوی «ڕێگای جەحانم» لە بارەی ئەنفالی بارزانیەکان بەرهەمهێنا. گەوین رۆبێرتز لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا هەواڵنێری رۆژنامەی «فینانشـیاڵ تایمز» ی بەریتانی بوو و هەواڵەکانی شۆڕشی ئەیلوولـی بڵاو دەکردەوە. پـاش کیمیابارانی هەڵەبجەش هەوڵـی زۆریدا لە ڕێگای فیلمەکانیەوە سـەرنجی رۆژئاوا بەرەولای ناکامەکانی کارەساتی هەڵەبجە رابکێشێت. وەرگێڕ

٢١٩- ئارلین سـپێکتێر لە سـاڵی ١٩٨١ تا ٢٠١١ نوێنەری پنیسیلڤانیا بوو لە ئەنجومەنی پیران لە سـەر لیسـتی پارتی کۆماری، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٩ بەولاوە بوو بە ئەندامی پارتی دیموکرات بەڵام لە ساڵی ٢٠١٠ هەڵبژاردنەکەی بە «پات تۆمی» دۆڕاند. سـپێکتێر لە ١٩٩٥ تا ١٩٩٧ سەرۆکی کۆمیتەی هەڵبژێردراوی هەواڵگری ئەنجومەنی پیران بوو. وەرگێڕ

٢٢٠- بیرۆن لێسـلی دۆرگان ساڵی ١٩٩٢ تا ٢٠١١ نوێنەری هەرێمی ئەتلارجی داکۆتای باکوور بوو لە ئەنجومەنی پیران لە سـەر لیستی پارتی دیموکرات. سناتۆر دۆرگان لە ٢٠٠٧ تا ٢٠١١ سـەرۆکی کۆمیتەی کاروباری ئیندیانەکان و سەرۆکی کۆمیتەی پارتی دیموکرات بوو لە ئەنجومەنی پیران. وەرگێڕ

221-Dodd

222-Jim Leach

٢٢٣- لە ساڵی ١٩٩٤ جونان هابیبا ریمانا، سەرۆک کۆماری رواندا لە رووداوی کەوتنەخوارەوەی فرۆکە گیانی لەدەسـتدا. عەشـیرەتی هۆتۆ عەشـریتی توتسی بە بەرپرسیاری ئەو رووداوە لە قەڵەمدا و زنجیرەیەک پێکداداانی خوێناوی لە نێوان ئەو دوو ئەو عەشیرەتەدا روویدا و لە ماوی ١٠٠ رۆژدا نزیکەی ٨٠٠ هەزار تا ملیۆنێک کەسی سـەر بە عەشیرەتی توتسی بەدەست عەشیرەتی هۆتۆ کوژران. هەروەها نزیکەی ٢٥٠ هەزار تا ٥٠٠ هەزار ژن و کچی سـەر بە عەشیرەتی توتسی لە لایەن پیاوانی سەر بە عەشیرەتی هۆتو کە زۆربەیان هەڵگری ڤیروسی ئەیدز بوون دەستدرێژیان کرایەسەر و لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر لەو ژن و کچانە تووشی نەخۆشی ئەیدز بوون. کۆمەڵکوژی رواندا لەبەرچـاوی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی، بەتایبەت هێزە ئاشـتیپارێزەکانی نەتەوە

یەکگرتوەکان ئەنجامدرا، بەڵام ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بە بیانووی پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆیی وڵاتان، پێشی لە کۆمەڵکوژییەکە نەگرت. دوابەدوای شکستهێنانی هۆتۆکان لەهێزە چەکدارەکانی توتسی و هەندێ لە وڵاتانی دیکەی ئەفریقایی، کۆمەڵکوژییەوە راوەستا و پاشان دادگایەک بۆ دادگاییکردنی بەرپرسیارانی کۆمەڵکوژیەکە بەرێوەچوو. وەرگێڕ

٢٢٤- گوندی بیرجینی(Birjinni) دەکەوێتە ناوچەی بادینان و یەکێ لەو دەیان گوندە بوو کە لە قۆناخی هەشتەمی ئەنفالدا، ئەنفال کرا. هێزەکانی رژێمی بەعس کە لە ٣٨ لیوای پیادە و ٢ لیوای زرێپۆش و ٣ کەتیبەی تۆپ و ١٧١ فەوجی جاش(کە سەر بە فەرماندەی جەحافلی دیفاعی وەتەنی ٥ بوون) لە بەرەبەیانی رۆژی ٢٥ی ئابی ١٩٨٨ پەلاماری گوند و دەشت و دۆڵەکانی ناوچەی بادینانیاندا. لەو هێرشە بەربلاوەدا رژێمی بەعس گوندەکانی ناوچەی کیمیابارانکرد و لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشینەکان کوژران. وەرگێڕ.

٢٢٥- جۆ(جۆزێف) بایدێن سالی ١٩٧٣ تا ٢٠٠٩ نوێنەری دیلاوێر بوو لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. لە ٢٠٠٧ تا ٢٠٠٩ سەرۆکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنێ نوێنەران بوو و لە سالی ٢٠٠٩ تا ئێستا جێگری باراک ئوباما، سەرۆک کۆماری ئەمریکایە. بایدێن هەر لە کۆنەوە ئاگاداری بارودۆخی کورد بووە و پاش رووخانی رژێمی بەعس چەند جار سەردانی هەرێمی کوردستانی کردووە. وەرگێڕ

226-STENY H. HOYER

٢٢٧- دیارە کە لە هەڵسەنگاندنی ژمارەی قوربانیانی ئەنفالدا لێرە زیادەرۆیی کراوە چونکە بە گوێرەی ئامارەکانی وەزارەتی ئەنفال و کاروباری شەهیدانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ژمارەی قوربانیانی ئەنفال نزیکەی ١٨٢ هەزار کەسە. وەرگێڕ

٢٢٨- رۆدنی گرامز لە سالی ١٩٩٣ تا ١٩٩٥ نوێنەری هەرێمی ٦ی مینیسوتا بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران و لە ١٩٩٥ تا ٢٠٠١ نوێنەری ئەو هەرێمە بوو لە ئەنجومەنی پیران لە سەر لیستی پارتی کۆماری. وەرگێڕ

٢٢٩- چێستێر ترینت لۆت لە سالی ١٩٧٩ تا ١٩٨٩ نوێنەری هەرێمی ٥ی میسیسیپی بوو ئەنجومەنی نوێنەران و لە ١٩٨٩ تا ٢٠٠٧ نوێنەری میسیسیپی بوو لە ئەنجومەنی پیران لەسەر لیستی پارتی کۆماری. سناتۆر لۆت سالی ٢٠٠١ رێبەری زۆرینەی کۆمارییەکان و پاش ئەوە رێبەری کەمینەی کۆمارییەکان بوو لە ئەنجومەنی پیران. وەرگێڕ

230-David Scheffer

231-International Monitor Institute in Los Angeles
232-Slobodan Milosevic

٢٣٣- عودەی سـەدام حوسـەین لەدایکبووی ١٩٦٥ لە تکریت، کوڕی گەورەی سـەدام بوو، بەرپرسـی ڕۆژنامەی بابل و تەلەڤزیۆنی ئەلشـەباب بوو. بە کاری بێ ئەخلاقی و کوشتنی خەڵکی بێ تاوان، تەنانەت پاسەوانەکانی باوکی بەناوبانگ بوو. عودەی زاوای عیزەت دەوری بوو بەڵام، پاشان لە کچەکەی دەوری جیا بوەوە. عودەی لە ٢٣ی تەموزی ٢٠٠٣ لە ئەنجامی هێرشـی هێزە تایبەتەکانی ئەمریکا لە موسـڵ لەگەڵ قوسەی برای کوژرا. وەرگێڕ

٢٣٤- قوسەی سەدام حوسەین، کوڕی بچوکی سەدام حوسەین، لەدایکبووی ١٩٦٦ لە بەغداد، سـاڵی ٢٠٠٠ لە لایەن سـەدام حوسەینەوە وەک سەرۆک کۆماری عێراق پاش سـەدام دیاری کرا. قوسەی فەرماندەی گاردی کۆماری عیراق و ئیسخباراتی ناوخۆی عێراق بوو و دەستی باڵای هەبوو لە کوشتاری شیعەکان و کورددا. قوسەی لە ٢٣ی تەموزی ٢٠٠٣ لە ئەنجامی هێرشی هێزە تایبەتەکانی ئەمریکا لە موسڵ لەگەڵ عودەی برای و کوڕێکی خۆی کوژرا. قوسەی سێ کوڕی هەبوو کە یەکێکیان بە ناوی مسـتەفا لەگەڵ خۆیدا لە موسڵ کوژرا و چارەنووسی دوو کوڕەکەی دیکەی هێشتا نادیارە. وەرگێڕ

٢٣٥- محمد هەمزە ئەلزوبەیدی، لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا سەرۆک وەزیران و جێگری سەرۆک وەزیران بوو. لە ١٩٨٨ تا ٢٠٠٠ فەرماندەی هەرێمی ناوەندی فرات بوو و شیعەکانی بە توندی سەرکوت کرد. ئەلزوبەیدی لە ٢١ی نیسانی ٢٠٠٣ لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە دەسـتگیر کـرا و ٥ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ لە تەمەنی ٦٧ ساڵیدا لە نەخۆشخانەی سەربازی هێزەکانی ئەمریکا لە بەغداد مرد. وەرگێڕ

٢٣٦- بەرزان ئیبراهیم ئەلتکریتی زڕبرای سەدام حوسەین و سەرۆکی موخابەراتی عێراق بوو. لە هاوینی ٢٠٠٣ لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە دەستبەسـەر کرا و لەلایەن دادگای بـاڵای تاوانەکانـی عێراقەوە حوکمی لەسـێدارەدانی بۆدەرچوو و لە ١٥ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٧ لەسێدارەدرا. وەرگێڕ

٢٣٧- وەتبان ئیبراهیم ئەلتکریتی، زڕبرای سەدام حوسەین ، وەزیری ناوخۆی عێراق بوو. لە ١٣ی نیسانی ٢٠٠٣ دەستگیر کرا و لەلایەن دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرچووە بەڵام تا ئێستا لەسێدارە نەدراوە. وەرگێڕ

٢٣٨- سـەباوی ئیبراهیم ئەلتکریتی، زڕبرای سەدام حوسەین بوو. کاتی شەڕی کەنداو سەرۆکی موخابەرات بوو و لە ١٩٩١ تا ١٩٩٦ سەرۆکی ئیستخباراتی ناوخۆی

عێـــراق بوو. پـــاش روخانی رژێمی بەعس رایکرد بۆ ســـوریا، بەڵام دەوڵەتی ســـوریە تەسلیمی کردەوە بە دەوڵەتی عێراق و لەلایەن دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرچووە، بەڵام تا ئێستا لەسێدارە نەدراوە. وەرگێڕ

٢٣٩- عەزیز ســـاڵح نوعمان لە کاتی داگیرکرانی کوەیت، حاکمی کوەیت بوو و پێش لەوە پارێزگاری کەربەلا و نەجەف بوو. لە ٢٣ی گوڵانی ٢٠٠٣ لە بەغداد لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە دەستگیر کرا. وەرگێڕ

240-SHADEGG
241-Jeffrey Goldberg
242-THE GREAT TERROR
243-New Yorker

٢٤٤- ئەم وتارە زۆر تێروتەسەلە بەڵام من تەنها ئەو بەشەم وەرگێڕا کە پەیوەندی بە هەڵەبجە و ئەنفالەوە هەیە. وەرگێڕ

٢٤٥- لەوانەیە مەبەســـتی راپەرینەکـــەی ١٣ی گوڵانی خەڵکی هەڵەبجە بێت. لـــە ١٣ی گوڵانی ١٩٨٧ خەڵکی هەڵەبجە بۆ دەربڕینی نارەزایەتی دژی سیاســـەتی کاولکردنی گوندە کوردنشینەکان بە دەستی رژێمی بەعس مانیانگرت، دوکانەکانیان داخست، لە ناوەندی شار کۆبونەوە و دژی رژێمی بەعس دروشمیاندا. هلیکۆپتەرەکانی عێراق هێرشیانکردە ســـەر خەڵکەکە و گەڕەکی کانی ئاشقان و پیرمحمدیان بومباران کـــرد و لە ئەنجامـــدا دەیان کەس کـــوژران و بریندار بوون. پاشـــنیوەڕۆی ئەو رۆژە هێزەکانی سوپای عێراق هەڵیانکوتایە سەر گەڕەکی کانی ئاشقان و داوایان لە خەڵک کرد ماڵەکانیان چۆڵ بکەن و پاشـــان هەندێ لـــە ماڵەکانیان بە دینامیت تەقاندەوە و گەڕەکەکەیان خاپوور کرد. وەرگێڕ

246-Nasreen Abdel Qadir Muhammad
247-Bakhtiar Abdul Aziz
258-Awat Omer
249-Nouri Hama Ali
,250-Muhammad Ahmed Fattah
251-Bahar Jamal
252-Hamida Mahmoud
253-Dashneh
254-atropine
255-Asme
256-Arazoo

٢٥٧- لە وتارەکەدا Goktapa (گۆکتەپە) نووســـراوە، بەڵام گۆپتەپە راســـتە. گۆپتەپە ســـەر بە شارۆچکەی ئاغجەلەر، ســـەر بە قەزای چەمچەماڵ کە بەردەوام

مەلبەنــدی خزمەتکردن بە هێزی پێشــمەرگە بوو، هەربۆیە لــە ٣ی گوڵانی ١٩٨٨ لە قۆناخی ٤ی ئەنفالدا لە پاڵ گوندی عەســکەر کیمیاباران و پاشــان ئەنفال کرا. وەرگێڕ

258-Ahmed Raza Sharif

259-Human Rights Watch

٢٦٠- جاناتان رەندێل رۆژنامەنووس و نووسەرێکی چالاکی ئەمریکایی و دۆستی کوردە کە لە ســەردەمی شۆڕشــی ئەیلوولەوە تا سەرەتای ســاڵی ٢٠٠٠ راپۆرتی لە رۆژنامەی «واشینگتۆن پۆست»دا لە بارەی کورد بڵاو دەکردەوە. رەندێل ساڵی ١٩٩٧ کتێبێکی بڵاو کردەوە بە ناوی» بەم ریســواییە، کام لێبوردن؟» کە تێیدا تیشــکی خســتبووە سەر کۆمەڵکوژی کورد بە دەستی سەدام حوســەین. جاناتان رەندێل ساڵی ١٩٩٨ کتێبێکی دیکەی بە ناوی «کوردستان» بڵاو کردەوە و بە گشتی ٢٠ کتێبی لە بارەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بڵاو کردوەتەوە. وەرگێڕ

261-Gwynne Roberts

262-Christine Gosden

263-Liverpool

264-Bergen-Belsen

265-Richard Butler

266-Khidhir Hamza

267-Fouad Baban

268-Michael Amitay

269-colon cancer

270-Jayran Muhammad

271-Chia Hammassat

272-Sarkar

273-Samantha Power

274-Carr Center for Human Rights, at Harvard

275-Instrumental genocide

276-Salma Aziz Baban

277-Bareq

278-Bareq Abdullah al-Haj Hunta

٢٧٩-گالبرێس هەرچەند کە ئەوکاتە بەو ئەنجامە گەیشت کە عێراق خەریکە کورد ژینۆســاید دەکات بەڵام، لە راپۆرتی ســەردانەکەیدا باسی ئەوەی نەکرد و سیاسەتی عێراقیشی شەرمەزار نەکرد، بەپێچەوانەوە زیاتر بەلای لایەنگری لە عێراق لە شەڕەکەی دژی ئێراندا شکابووەوە و کوردەکانی بە هاوپەیمانی ئێران لەقەڵەمدابوو. وەرگێڕ

280-August Hanning

٢٨١- مەبەستی مشتومڕی ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکایە لە بارەی ئەوەی

کە ئایا سەدام چەکی کۆمەڵکوژی هەیە یان نا؟ وەرگێڕ.
282-Meridian International Center
283-Dr. Ali Sindi

٢٨٤- سـناتۆر جان کیل(KYL) لە ١٩٨٧ تـا ١٩٩٥ نوێنەری هەرێمی ٤ی ئاریزۆنـا بووە لە ئەنجومەنی نوێنەران و لە ١٩٩٥ تا ئێسـتا نوێنـەری ئاریزۆنایە لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی کۆماری. جان کیل ئێستا سەرۆکی فراکسـیۆنی کەمینەی ئەنجومەنی پیرانە و سـاڵی ٢٠١٢ لەلایەن گۆڤاری تایمەوە وەک یەکێ لە ١٠٠ کەسایەتییە کاریگەرەکانی جیهان هەڵبژێردراوە. وەرگێڕ

٢٨٥- ڤیلیـام دیلاهونـت لە سـاڵی ١٩٩٧ تا ٢٠١١ نوێنـەری هەرێمی ١٠ی ماساچوسێت بووە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. وەرگێڕ
286-General Shinseki

٢٨٧- هاری ماسۆن رێد ساڵی ١٩٨٣ تا ١٩٨٧ نوێنەری هەرێمی ١ی نڤادا بووە لە ئەنجومەنی نوێنەران و لە ساڵی ١٩٨٧ تا ئێستا نوێنەری نڤادایە لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لەسـەر لیستی پارتی دیموکرات. سـناتۆر رێد لە ٢٠٠٥ تا ٢٠٠٧ رێبەری کەمینەی ئەنجومەنی پیران بووە. وەرگێڕ

٢٨٨- بڕیارنامەکە پاش مشـتومڕێکی زۆری ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران، بە ٣٢٧ دەنگی ئەرێنی پەسەندکراوە. وەرگێڕ

٢٨٩- مۆریس دونلی هینچی سـاڵی ١٩٨٣ تـا ٢٠٠٣ نوێنەری هەرێمی ٢٦ی نیۆیۆرک بووە لە ئەنجومەنی نوێنەران و لە سـاڵی ٢٠٠٣ تا ئێستا نوێنەری هەرێمی ٢٢ی نیۆیۆرکە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سـەر لیستی پارتی دیموکرات. وەرگێڕ

290-Colin Powell
291-Paul Wolfowitz
292-Condoleezza Rice
293-DICK CHENEY

٢٩٤- رۆی بلونت لە ساڵی ١٩٩٧ تا ٢٠١١ نوێنەری هەرێمی ٧ی میسوری بووە لە ی٢٩٢-ەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا و لە ساڵی ٢٠١١ تا ئێستا نوێنەری میسورییە لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی کۆماری. بلونت لە ساڵی ٢٠٠٣ تا ٢٠٠٧ سـەرۆکی فراکسـیۆنی زۆرینە و ٢٠٠٧ تا ٢٠٠٩ سەرۆکی فراکسیۆنی کەمینەی ئەنجومەنی نوێنەران بووە. وەرگێڕ

٢٩٥- مەبەستی ئیسلام عەبدولغەنی کەریمۆڤە کە لە کاتی دروستبوونی وڵاتی

ئوزبەکستان لە ١٩٩٠ تا ئێستا سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتەیە. وەرگێڕ.

٢٩٦- مەبەستی سەفەر موراد نیازۆڤ، سەرۆک کۆماری تورکمانستانە کە نازناوی « تورکمانباش»ی بەخشیوە بە خۆی یانی سەرۆکی هەموو تورکمانەکان. نیازۆڤ ساڵی ٢٠٠٢ رایگەیاند کە رۆژژمێری وڵاتەکەی دەگۆڕێت و هەر مانگێکی دەکات بە ناوی یەکێ لە قارەمانەکانی تورکمانستان. مانگی نیسانی کردووە بە «دایك» بۆ ریزگرتن لە دایکی خۆی کە ساڵی ١٩٤٨ لە بومەلەرزەیەکدا لە عیشقئابادی پایتەختی تورکمانستان کوژراوە. نیازۆڤ لە ساڵی ١٩٨٥ لە لایەن حیزبی کۆمونیستی سۆڤیەتەوە کرا بە سەرۆکی تورکمانستان و پاش هەڵوەشانەوەی سۆڤیەتیش بوو بە سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتە و ئێستاش هەر سەرۆک کۆمارە. وەرگێڕ.

297-CHRIS VAN HOLLEN

298-Peter Galbraith

299-David Kay

300-Dick Cheney

٣٠١- ئۆپەراسیۆنی گەردەلولی بیابان(Operation Desert Storm) ئەو شاڵاوە گەورەیە بوو کە لە کانوونی دووەمی ١٩٩١ بۆ رزگارکردنی کوەیت و دەرکردنی هێزەکانی عێراق لە کوەیت لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکان بە سەرکردایەتی ئەمریکا بەڕێوەچوو و سەرئنجام هێزەکانی سەدامیان ناچار بە پاشەکشە لە کوەیت کرد. وەرگێڕ

٣٠٢- ئۆپەراسیۆنی رێوی بیابان(Operation Desert Fox ) ئەو شاڵاوە بوو کە ئەمریکا ساڵی ١٩٩٨ دوابەدوای ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی عێراق و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی و دەرچوونی پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان دژی عێراق ئەنجامیدا. لەو شاڵاوەدا فڕۆکەکانی ئەمریکا بە ماوەی سێ رۆژ و سێ شەو نزیکەی ٥٠٠ موشەکیان دا لە عێراق. وەرگێڕ

٣٠٢٣- جیم مەکدۆرمێت لە ساڵی ١٩٧١،-١٩٧٢ نوێنەری هەرێمی ٤٣ی واشینگتۆن بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران و لە ١٩٨٩ تا ئێستا نوێنەری هەرێمی ٧ی واشینگتۆنە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکراتیک. مەکدۆرمێت لە ١٩٩٣ تا ١٩٩٥ سەرۆکی کۆمیتەی ئەتنیکەکانی ئەنجومەنی نوێنەران بوو. وەرگێڕ

٣٠٤- مەبەستی لە شەڕی یەکەمی کەنداو شەڕی وڵاتە هاوپەیمانەکان بە سەرکردایەتی ئەمریکا لەگەڵ عێراق بۆ دەرکردنی هێزەکانی سەدام لە کوەیت(١٩٩١) و شەڕی دووەمی کەنداو هێرشی ئەمریکا بۆ سەر عێراقە لە ٢٠٠٣ کە بووە هۆی رووخانی رژێمی سەدام حوسەین. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە سەرچاوەکان شەڕی

یەکەمی کەنداو بە شەڕی ئێران و عێراق(١٩٨٠-١٩٨٨) دەزانن. وەرگێڕ
٣٠٥- مەبەستی جۆرج هێربێرت واکێر بۆشی باوکی جۆرج دەبلیو بوشە کە ساڵی ١٩٨٠ تا ١٩٨٨ جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکا و ساڵی ١٩٨٩ تا ١٩٩٣ سەرۆک کۆماری ئەمریکا بوو. وەرگێڕ
٣٠٦- مەبەستی ئەوەیە کە سەدام حوسەین چەکی کۆمەڵکوژی دژی کوردەکان بەکارهێناوە و بەسەرهاتی کوردەکان بەڵگەی کەڵکوەرگرتنی رژێمی عێراق لە چەکی کۆمەڵکوژە با ئەمریکا چەکی کۆمەڵکوژیشی لە عێراق نەدۆزیبێتەوە. وەرگێڕ
307-General Shinseki
٣٠٨- ئاماژە بەوەیە کاتێک کە هێزەکانی باکووری ڤیەتنام(کە دژی دەوڵەتە داردەستەکەی ئەمریکا لە باشووری ڤیەتنام بوون) گەیشتنە دەروازەی شاری سایگۆنی پایتەختی باشووری ڤیەتنام، لە بەرەبەیانی ٣٠ی نیسانی ١٩٧٥ هیلیکۆپتەرەکانی ئەمریکا لە سەر بانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە شاری سایگۆن نیشتنەوە بۆ ئەوەی ئەو ئەمریکیانە رزگار بکەن کە ناو باڵوێزخانەدا بوون و سەرەنجام هەموو ئەمریکیەکانیان رزگار کرد، بەڵام وازیان لە ڤیەتنامییەکانی لایەنگری ئەمریکا هێنا کە گیانیان لە مەترسیدا بوو. هەر هەمان رۆژ هێزەکانی باکووری ڤیەتنام شاری سایگۆنیان داگیر کرد( کە پایتەختی ڤیەتنامی باشوور بوو و تا ئەو کاتە لە ژێر دەسەڵاتی ئەمریکادا بوو) و بەو شێوەیە شەڕی ڤیەتنام کۆتایی پێهات و هەر دوو ڤیەتنامی باکوور و باشوور یەکیانگرتەوە. وەرگێڕ
٣٠٩- مەبەستی گەڵاڵەیاسای «ئیدارەی گەشەی گوند و پەرەپێدانی بەرهەمی کشتوکاڵی»یە کە لە ١٣ی تەموزی ٢٠٠٤ لە ئەنجومەنی نوێنەراندا تاوتوێ کرا و پاش مشتومڕێکی زۆر بە زۆربەی دەنگ پەسەند کرا. وەرگێڕ
310-Ms. KAPTUR
311-TOM DELAY
312-LANTOS
٣١٣- دانا ترێون رۆهراباچێر لە ساڵی ١٩٨٩ تا ئێستا نوێنەری هەرێمی ٤٦ی کالیفۆرنیایە لە ئەنجومەنی نوێنەران لە سەر لیستی پارتی کۆماری. وەرگێڕ
٣١٤- ئالان واین ئالارد ساڵی ١٩٩١ تا ١٩٩٧ نوێنەری هەرێمی ٤ی کۆلۆرادۆ بووە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا و ساڵی ١٩٩٧ تا ٢٠٠٩ نوێنەری کۆلۆرادۆ بووە لە ئەنجومەنی پیران لە سەر لیستی پارتی کۆماری. وەرگێڕ
٣١٥- مەبەستی هەرێمی دژەفڕینە کە پاش کۆڕەوی خەڵکی کوردستان لە بەهاری ١٩٩١ لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکان بە فەرماندەیی ئەمریکا پێکهات بۆ

پاراستنی بەشێک لە خاکی کوردستانی عێراق. وەرگێڕ

٣١٦- ویلیام هاریسۆن فرێست سالّی ١٩٩٥ تا ٢٠٠٧ نوێنەری تنیسی بوو لە ئەنجومەنی پیران لە سەر لیستی پارتی کۆماری و لە ٢٠٠٣ تا ٢٠٠٧ ڕێبەری زۆرینەی ئەنجومەنی پیران بوو. وەرگێڕ

318-Nashville

٣١٩- مەبەستی تەقینەوەی بۆمب لە مزگەوتی «ئەلعەسکەری» لە شاری سامرایە لە شوباتی ٢٠٠٦ کە بە هۆیەوە بەشێکی زۆری مزگەوتەکە ڕووخا. العسكرية شوێنێکی پیرۆزی شیعەکانە کە مەزاری ئیمام هادی و ئیمام حەسەنی عەسکەری تێدایە و منارەی مزگەوتەکە لە زێڕ دروستکراوە. مزگەوتی العسكرية دیسان لە حوزەیرانی ٢٠٠٧ هێرشی کرایەسەر و لە ئەنجامدا چەند کەس کوژران و برینداربوون. وەرگێڕ

٣٢٠- خاتوون ئیلینا ڕۆز لێتینێن لە سالّی ١٩٨٩ تا ئێستا نوێبەری هەرێمی ١٨ی فلۆریدایە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سەر لیستی کۆماری و لە سالّی ٢٠٠٣ سەرۆکی کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجومەنی نوێنەران بوو. وەرگێڕ

321-Frank R. Wolf

٣٢٢-کریستۆفیر ڤان هۆلّین لە سالّی ٢٠٠٣ تا ئێستا هەرێمی ٨ی مریلەندە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات. هۆلّین ئەندامی پایەبەرزی کۆمیتەی بودجەی ئەنجومەنی نوێنەرانە و سالّی ٢٠٠٧ تا ٢٠١١ سەرۆکی کۆمیتەی هەلّمەتی هەلّبژاردنەکانی پارتی دیموکرات بووە. وەرگێڕ

٣٢٣- هۆوارد لاورێنس بێرمەن لە سالّی ١٩٨٣ تا ئێستا نوێنەری هەرێمی ٢٨ی کالیفۆڕنیایە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سەر لیستی پارتی دیموکرات و لە سالّی ٢٠٠٨ تا ٢٠١١ سەرۆکی کومیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجومەنی نوێنەران بووە. وەرگێڕ

٣٢٤- ڕۆبێرت باب فیلنێر لە سالّی ١٩٩٣ تا ٢٠١٢ نوێنەری هەرێمی ٥٠ و ٥١ی کالیفۆڕنیا بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران لە سەر لیستی پارتی دیموکرات و لە سالّی ٢٠٠٧ تا ٢٠١١ سەرۆکی کۆمیتەی کاروباری ڤێترانەکانی ئەنجومەنی نوێنەران بوو. باب فیلنێر و فرانک پالّۆن باشترین دۆستی کورد بوون لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لە سالّی ١٩٩٣ تا ٢٠١٢ و بەردەوام کێشەی کورد(بەتایبەت کوردستانی تورکیە)یان لە ئەنجومەنی نوێنەراندا دەخستەڕوو. باب فیلنێر لە دەرەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانیش لەگەلّ کۆمەلّگای کورد لە ئەمریکا پەیوەندی بووە و لە جەژن

و بۆنە نیشتمانییەکانی کورددا بەشداری کردووە. باب فیلنێر لەلایەن ڕێکخراوی تۆڕی زانیاریی کورد لە ئەمریکا خەڵاتی ئەحمەدی خانی لە ســاڵی ۲۰۰۱ پێبەخشراوە. باب فیلنێر ئێستا سەرۆکی شارەوانی «سانديا گۆ»یە. وەرگێڕ

۳۲۵- جۆزیف ئیســادۆر لیبێرمەن لە ســاڵی ۱۹۸۹ تا ئێستا نوێنەری هەرێمی کۆنیکتۆتــە لە ئەنجومەنی پیرانــی ئەمریکا. لیبێرمەن لە ســاڵی ۲۰۰٦ ئەندامی پارتی دیموکرات بوو بەڵام لە ۲۰۰٦ بەولاوە وەک ئەندامێکی ســەربەخۆ کار دەکات. لیبێرمەن لە ۲۰۰۷ تا ئێستا سەرۆکی کۆمیتەی ئاسایشی ناوخۆ و کاروباری دەوڵەت لە ئەنجومەنی پیرانە. وەرگێڕ

326-Samantha Power

327-A Problem From Hell

328-Pulitzer

۳۲۹- پۆمپیئی (Pompeii) شارێکە لە ئیتالیا کە لە ۲٤ی ئابی ساڵی ۷۹ی زایینی واتا نزیکەی ۱۹۳۳ ســاڵ لەمەوپێش بوو بە ژێر ئاگر و خۆڵەکۆی گڕکانی «مۆنت ویســیوس» و لە ئەنجامــدا نزیکەی دوو هەزار کەس لە دانیشــتوانەکەی کوژران. وەرگێڕ

330-Howard Berman
331-toxic

# پێرست

Wirya Rehmany

# USA Policy toward Halabja Chemical Bombardment and Kurdish Genocide

زۆرن ئەو دیکتاتۆرانە کە وەك تاوانبار لە
دادگا نێونەتەوەییەکان یان دادگای وڵاتی
خۆیاندا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا کراوە.
هەندێکیان پێش لە دەرچوونی حوکمەکەیان
بە هۆکاری جۆراوجۆر مردوون و لە راستیدا
ئەم جۆرە مردنانە بۆ دیکتاتۆرەکان بووە
بە شتێکی باو. هێرمان گۆرین پێش لە
جێبەجێبوونی حوکمی دادگای نورێمبێرگ
خۆی کوشت. هیدکی تۆجو لە کاتی دادگای
سەربازی تۆکیۆ هەوڵیدا بە شێوەی هاراکی
خۆی بکوژێت. ئیسلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ لە
کاتی دادگاییکردن لەلایەن دادگای
نێونەتەوەیی لاهە بە هۆی نەخواردنی دەوا
و دەرمانەوە رێگای بۆ مەرگی خۆی هەموار
کرد. ئوگوستۆ پینۆشە پێش لە تەواوبوونی
دادگاییکردنەکەی د بە مەرگی ئاسایی مرد.
بەڵام سەدام دادگایی کرا و بە لەسێدارەدان
حوکمدرا و حوکمەکەشی جێبەجێ کرا.
لێپرسینەوە لەگەڵ تاوانی ئەنفال و کیمیابارانی
هەڵەبجە بە لەسێدارەدانی سەدام کۆتایی
پێهات بەڵام دادگای نێونەتەوەیی لاهە
تەنانەت پاش مردنی میلۆسۆڤیچیش درێژەی
بە کاری خۆی دا و بریاری تاوانباربوونی
میلۆسۆڤیچی دەرکرد



٣٠٠٠ دینار

چاپخانەی رۆشنبیری